

منتدى إقرأ الثقافي

# مامۆستا



# زیاد محەممەد ئەمین

## ژیانی ڕووناکبیری، سیاسی، پەروەردەیی و ئەدەبی

ئامادەکاران:
ئارارات ئەحمەد
مۆفەق میراودەلی

# مامۆستا زیاد محەممەد ئەمین

ژیانی ڕووناکبیری، سیاسی، پەروەردەیی و ئەدەبی

# مامۆستا زیاد محەممەد ئەمین

## ژیانی ڕووناکبیری، سیاسی، پەروەردەیی و ئەدەبی

**ئامادەکاران: ئارارات ئەحمەد، مۆفەق میراودەلی**

سلێمانی
٢٠٢١

تێچووی لەچاپدانی، بنەماڵەکەیان لە ئەستۆی گرتووە

# مامۆستا زیاد محەممەد ئەمین

ژیانی ڕووناکبیری، سیاسی، پەروەردەیی و ئەدەبی


بابەت: ژیاننامە و بیرەوەری، کلتوور، نووسین و ئەدەبی
ئامادەکاران: ئارارات ئەحمەد، مۆفەق میراودەلی
نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆك: پەیام ئەحمەد
قەبارەی کتێب: B5
ژمارەی لاپەڕە: ( ٢٦٦ )
تیراژ : ( ٥٠٠ ) دانە
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢١
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی کارۆ
نرخ: ( ٥٠٠٠ ) دینار

لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٥٨١ )ی ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە

## ناوەرۆك

## پێشەکی

مامۆستا زیاد[1] قەڵەمێکی گەوهەردار و بەسەلیقەیە لەبواری نووسین و بەدواداچوون، خاوەنی کۆمەڵێك کتێبی دانسقە لەسەر ناوچەی پشدەر و مەرگە، لەناو نووسەرانی پشدەر، خاوەنی زۆرترین بەرهەمی فۆلکلۆرییە، کتێبخانەی کوردی تەژی و دەوڵەمەند کردووە.

ئەم کتێبە، کۆمەڵێك بوار و لایەنی ژیانی ڕووناکبیری ناوبراو لەخۆدەگرێت، هەر لەسەرەتای کاری نووسینی لە ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەکان، چ لەسەر ئاستی عێراق و چ لەسەر ئاستی کوردستان، بەووردی و چڕی باسی ئەو لایەنەکراوە، زۆرینەی کاری ڕۆژنامەوانی خراوەتەڕوو، لەگەڵ ناساندنی تەواوی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە.

دوابەدوای ئەوە، پێنج دیدار و چاوپێکەوتنی دانراون، کە زۆربەیان لە کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، ئەمانە کنەو پشکنینی وردی ژیانی مامۆستا زیاد لەخۆدەگرن، تەوەرەیەکی گرنگی ژیانی لەخۆدەگرێت، پاشان نزیك و دۆست و خۆشەویستانی ئەوانەی ڕۆژگارێك هاوڕێ و نزیکی بوون، بەشێوەیەك لە شێوەکان باسی هەندێك لایەنیان کردووە.

مامۆستا، لەدەرئەنجام و هەوڵ و ماندووبوون و دڵسۆزی بۆ بواری ئەدەبیاتی کوردی، چەند ڕێزلێنانی بۆ کراوە، لێرەدا گوڵبژێری ئەوانە خراوەتەڕوو، ئنجا ئاماژە بە کۆڕیادی مامۆستا زیادکراوە، لەپاش کۆچی دوایی وەکو وەفا و دڵسۆزی بۆ ناوبراو. بەر لەکۆتاییش، ئاماژە بەچەند بابەتێك دراوە کە لەبارەی مامۆستا زیـادەوە نوسراون، لەکۆتایشدا بیبلیۆگرافیای بەرهەمەکانی بەوردی تۆمارکراون.

**ئامادەکاران**

---

[1]- وەك لە دوایین بەشی ئەم کتێبەدا، کە بیبلیۆگرافیای کتێبە بەچاپ گەیشتووەکانی ڕەوانشادە، دەبینین ناوی مامۆستا زیاد، لەسەر ناسنامەی کتێبەکانی، بە چەند شێوەیەك هاتووە: زیاد محەمەد ئەمین، زیاد محەممەد ئەمین، زیاد موحەممەد ئەمین، و زیاد موحەمەد ئەمین. ئێمە، بەمەبەستی خزمەتکردنی یەکخستنی ڕێنووس لەم کتێبەدا، هەوڵماندا لە تەواوی ئەو شوێنانەی کە ناوی هاتووە و ئێمە بۆمان هەیە دەستکاریی بکەین، بە (زیاد محەممەد ئەمین) یاداشتمانکرد. (ئامادەکاران)

# بەشی یەکەم

## پێڕستی بابەتەکانی لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا

(١٩٨٢-٢٠١٠)

## سەرنج

مامۆستا زیاد، وەك مامۆستا، وەك هەڵسووڕاوێکی شۆڕشگێڕ و نیشتیمانپەروەر، وەك ئاشقە کەلەپوور و فۆلکلۆر، بەرلەوەی کە وەك نووسەرێك بنووسێت و بڵاوبکاتەوە، لە سەرەتای لاوێتییەوە و بەتایبەتیش لەو ڕۆژگارەی کە مامۆستا بووە و هەر ماوەیەی لە شوێنێك و لە گوندێك بووە، دەستیکردووە بە کۆکردنەوە و یاداشتکردنی ئەو بابەتە فۆلکلۆرییانەی کە ڕۆژانە گوێبیستیان دەبوو، بۆ ئەوەی هەر نەبێ لە فەوتان ڕزگاریان بکات. کاری ئەو یاداشت و کۆکردنەوەیە، ساڵانێکی زۆری بردووە، ئینجا هاتۆتەسەر ئەوەی کە وردە وردە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاویانبکاتەوە. بەوەندە زانیارییەی کە ئێمە هەمانبووە، مامۆستا لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٢ـەوە، بابەتە فۆلکلۆرییەکانی، پاش ئەوەی دەستێکی پێداهێناون، ناردوونی بۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکان و، بڵاویکردوونەتەوە.

هەڵبەتا، ئەوەی بەڕێزت لەم پێڕستەدا بەرچاوت دەکەوێ، بە مەزەندەی خۆمان و دوای تەقەلایەکی زۆر بۆ دۆزینەوەی زۆرترین بابەتەکانی، ئەوە نزیکەی تەواوی بەرهەمەکانیەتی کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاویکردوونەتەوە، خۆ لەوانەیشە هێشتا لێرەو لەوێ و لە کون و قوژبناندا شتێك مابێ کە ئێمە وەبەر پەلانمان نەکەوتبێ. ئومێد دەکەین کە دواتریش هەر بابەتێکی دیکەی دۆزرایەوە، بگاتە دەستمان، بۆ ئەوەی، ئەگەر خوا یاربێ، لە چاپی دووەمدا تەواویکەین.

### یەکەم: گۆڤاری بەیان[1]

١- ئاورێك لە لاوكی گەنج خەلیل، ژ٨٠، حوزەیرانی ١٩٨٢، ل٣٣-٣٧. ئەم بابەتە لە كتێبی: (مامان برازا بزر كرد خالان خوارزا مەزن كرد) بڵاوكراوەتەوە.

٢- بەرگریەك لە عەلی بەردەشانی، ژ١٠٤، شوباتی ١٩٨٥، ل٧-١٢.

٣ - تاوێك لەگەڵ غەمی عەبدولعەزیزی داسنی لە بەیتی سەیدەوانێ دا، ژ١١١، ئەیلوولی ١٩٨٥، ل١٦-٢١. ئەم بابەتە لە كتێبی: (جوانستان)دا بڵاوكراوەتەوە.

### دووەم: پاشكۆی ڕۆژنامەی عێراق[2]

١- بەیتی ئایشەگوڵێ، ژ٥٣، كانوونی یەكەمی ١٩٨٤، ل١٤. ئەم بابەتە لە كتێبی (ئاواز و بەسەرهات)دا بڵاوكراوەتەوە.

### سێیەم: گۆڤاری كاروان[3]

١- گەشتێك بەنێو گوڵزاری مەقامی ئازیزەدا، ژ١٨، ئازاری ١٩٨٤، ل٥٣-٥٧. ئەم بابەتە لە كتێبی (ئاواز و بەسەرهات)دا بڵاوكراوەتەوە.

### چوارەم: ڕۆژنامەی هاوكاری[4]

١-ئێمەش وشەدۆستین!، ژ٨٧٤، پێنجشەممە، (١٩٨٧/١/١٥)، ل٥.

٢- لەپێناوی ووشەدا، ژ٩٠٩، ١٩٨٧/٩/٢٨، ل٦.

٣-چوار شەو لەگەڵ چوارینەكانی مەحوی دا ژ١٠٤٣، پێنجشەممە، ١٩٨٩/١/١٩، ل٦.

٤-ڕاستكردنەوەی نووسینی هێندێك پیت لە پۆلی یەكەمی سەرەتاییدا، ژ١١٤١، (١٩٩٠/١/٤)، ل٨.

---

١- گۆڤاری بەیان، یەكەم ژمارەی لە تشرینی یەكەمی (١٩٦٩) دەرچووەو، ژمارەی كۆتایی كە ژمارە (١٩٦) لە ساڵی (٢٠٠٣) دەرچووە.

٢- ڕۆژنامەی پاشكۆی عێراق، ژمارەی (١)ی لە بەرواری (١٩٧٦/١١/٩) دەرچووە، ژمارەی كۆتایی كە ژمارە (٥٤) لە شوباتی (١٩٨٥) دەرچووە.

٣- گۆڤاری كاروان، یەكەم ژمارەی تشرینی یەكەمی (١٩٨٢) دەرچووە، ژمارەی كۆتایی كە ژمارە (٩٣) یە، لە ئاداری (١٩٩٢) دەرچووە، تەنها یەك بابەتی لەم گۆڤارەدا بڵاوبۆتەوە.

٤- ڕۆژنامەی هاوكاری، ژمارەی (١)ی لە ڕۆژی هەینی، ڕێكەوتی (١٩٧٠/١/٩) دەرچووە، ئەم ڕۆژنامەیە تا ڕوخانی ڕژێمی بەعس لەنیسانی (٢٠٠٣) بەردەوام بووە.

**پێنجەم: گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ**[1]

١- شایی یەکەی عەلی بەردەشانی، ژ١٢٢، حوزەیرانی ١٩٨٩، ل١٩٠-١٩٧.

**شەشەم: ساڵنامەی کارەسات و ڕاپەڕین**[2]

٢- کارەساتی قەڵادزێ درێژەی سیاسەتێکی دێرینەبوو، ١٩٩٧/٤/٢٤، ل٤.

**حەوتەم: گۆڤاری ڕوانین**[3]

١- لە هەناوی ڕۆژگارەوە، ژ٣، ١٩٩٩، ل٣٤-٤٣. ئەم بابەتە لە کتێبی: (بیرەوەرییەکانی مچە مەرگەیی لە نێو خانەوادەی شێخ مەحموودی حەفیددا) بڵاوکراوەتەوە.

٢- شێخ مەحموود لە دەستبەسەری بەغداوە بۆ (سیتەك)ی شاربازێر، ژ٤، ١٩٩٩، ل٦٢-٦٥. ئەم بابەتە لە کتێبی: (بیرەوەرییەکانی مچە مەرگەیی (لە نێو خانەوادەی شێخ مەحموودی حەفیددا) بڵاوکراوەتەوە.

٣- ئەو شەڕەم بەدڵ نەبوو، بەڵام فەرمانی شێخ بوو، ژ٦، ٢٠٠٠، ل٥٣-٦١. ئەم بابەتە لە کتێبی: (بیرەوەرییەکانی مچە مەرگەیی لە نێو خانەوادەی شێخ مەحموودی حەفیددا) بڵاوکراوەتەوە.

٤- شەدەم بۆ دەربەندی دەویست، ژ٦، ٢٠٠٠، ل١١٧-١٢٢. ئەم بابەتە لە کتێبی: (هەتا دەمری نازانی چیت بەسەردێ، کۆمەڵێك بەسەرهات لە زمانی مام خالید) بڵاوکراوەتەوە.

٥- لەشکری پشدەرێ و شەڕەکەی وەڕاز، ژ٧-٨، ٢٠٠٠، ل١٨٨-١٩٠. ئەم بابەتە لە کتێبی: (بیرەوەرییەکانی مچە مەرگەیی، لە نێو خانەوادەی شێخ مەحموودی حەفیددا) بڵاوکراوەتەوە.

٦- ئازیزە، پەخشانێك و پەڕاگەندەی نیگایان، ژ٩، ٢٠٠٠، ل٦٦-٦٨. ئەم بابەتە لە کتێبی: (ئاواز و بەسەرهات)دا بڵاوکراوەتەوە.

٧- توێکڵێ قەدەگوێز، ژ١٠، ٢٠٠١، ل١٢٢-١٢٥.

---

١- گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارەی (٠)ی بەشێوەی ڕۆژنامە لە (١٩٧٣/١١/١١) دەرچووەو تا ژمارە (٤٥) بەشێوەی ڕۆژنامە دەرچووە، ژمارە (٤٦) بەشێوەی گۆڤار دەرچووە، تاوەکو وەستانی لە ژمارە(١٥٣) ساڵی (٢٠٠٣).

٢- ئەم ساڵنامەیە تەنها ئەم ژمارەیەی تایبەت بە (کارەسات و ڕاپەڕینی قەڵادزێ) دەرچووە.

٣- گۆڤاری ڕوانین، لە شاری ڕانیە دەرچووە، ژمارەی (١)ی لەهاوینی (١٩٩٨) دەرچووە، ژمارەی کۆتایی کە ژمارە (١٠)یە لە ساڵی (٢٠٠١) دەرچووە.

**هەشتەم: گۆڤاری زنار**[1]

١-مردن، لەیادی چلەی مامۆستا خالیدا خوێندرایەوە، ژ٢، ساڵی ١٩٩٩، ل٨١-٨٢-٨٣-٨٤.

٢- لەبەر بەرازان واز لە کشتوکاڵ ناهێندرێت، ژ٢٢، پایزی ٢٠٠٧، ل٤٨-٤٩. ئەم بابەتە لە کتێبی: (هەتا دەمری نازانی چیت بەسەردێ)دا بڵاوکراوەتەوە.

**نۆیەم: گۆڤاری قەڵادزێ**[2]

١- تۆ، ژ٣، زستانی ٢٠٠٦، ل٢٤-٢٥.

**دەیەم: گۆڤاری پشدەر**[3]

١- مام خالیدو کورتەباسێك، ژ٣، هاوینی ٢٠٠٨، ل٤١-٤٢.

٢- سەلیمی بایزی، ژ٤، هاوینی ٢٠٠٨، ل٢٩.

٣- مەحموود گەناوی، ژ٥، پاییزی ٢٠٠٨، ل٣٤-٣٥.

٤- بنەماڵەی وەستا خالان، ژ٧، زستانی ٢٠٠٩، ل٤١-٤٣.

٥- بنەماڵەی (دەوەن)ان لە پشدەرێدا، ژ٨، بەهاری ٢٠٠٩، ل٤٣-٤٤.

٦- سەید توانا، ژ٩، هاوینی ٢٠٠٩، ل٤٣-٤٤.

٧- ڕەسوڵ ئاوەژەیی، ژ١٠، هاوینی ٢٠٠٩، ل٤١. ئەم بابەتە لە کتێبی (جوانستان)دا بڵاوکراوەتەوە.

٨- قەڵادزێ... وەکو وشە، ژ١١، پاییزی ٢٠٠٩، ل١٣-١٤.

٩- بنەماڵەی نیگاران لە پشدەرێدا، ژ١٢، پاییزی ٢٠٠٩، ل٤٨-٥٠.

١٠- تیرەی خواران لە پشدەرێ، ژ١٣، زستانی ٢٠٠٩، ل٥٢-٥٣.

١١- مامڵێ لە ڕوانگەی پاراستنی ڕەسەنایەتی وشەو ئاوازاندا، ژ١٤، بەهاری ٢٠١٠، ل٥١-٥٢.

---

[1] زنار، گۆڤارێکی وەرزی ڕووناکبیری گشتی بوو، لەشاری قەڵادزێ دەردەچوو، تەنها (٣) ژمارەی لێدەرچوو، مامۆستا زیاد لە هەرسێ ژمارەکەدا ئەندامی دەستەی نووسەرانی بووە. ژ١ لە تەمووزی ١٩٩٩ و، ژ٢ لە تشرینی دووەمی ١٩٩٩ و، ژ٣، کە کۆتا ژمارەی بوو، لە ساڵی ٢٠٠٠ دەرچووە.

[2] گۆڤاری قەڵادزێ، بە دوو خول دەرچووە، ژمارەی (١)ی خولی یەکەمی لە پاییزی (٢٠٠٥) دەرچووە، ژمارەی کۆتایی خولی یەکەمی ژمارە (٦)ـە لە زستانی (٢٠٠٧) دەرچووە.

[3] گۆڤاری پشدەر، لەلایەن مەڵبەندی (٢٤)ی پشدەر لە ناوچەی پشدەر دەرچووە، ژمارە (١)ی لە زستانی (٢٠٠٨) بڵاوکراوەتەوە، ژمارەی کۆتایی کە ژمارە (١٦)یە لە هاوینی (٢٠١٠) دەرچووە.

**یازدەیەم: گۆڤاری ڕانیە**[1]

١-لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا، شەڕەکانی عەلی بەردەشانی لەگەڵ پیرەژنان، ژ٧، ئازاری ٢٠٠٤، ل٣٩-٤١. ئەم بابەتە لە کتێبی: (دیوانی عەلی بەردەشانی)دا بڵاوکراوەتەوە.

٢-لەگەڵ شاعیرانی دەڤـەردا: سلێمان بەگ کوڕی حاجی میرانی خدر بەگ (شین بۆ کەرەدێزی دەگێڕێ)، ژ٩، ئەیلوولی ٢٠٠٤، ل٢٠-٢١. ئەم بابەتە لە کتێبی: (ئاوازو بەسەرهات)دا بڵاوکراوەتەوە.

٣- لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا: حەسەنی برایم گەڵیشکی، ژ١٠، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤، ل٢٠-٢١. ئەم بابەتە لە کتێبی: (ئاوازو بەسەرهات)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤- لێدوانێك لە مامۆستا زیاد، لەبارەی ڕاپەڕین لەدیدی ئەدیبانەوە، ژ١١، ئازاری ٢٠٠٥، ل٢٠.

٥- لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا: فانی، ژ١١، ئازاری ٢٠٠٥، ل٣٢-٣٤.

٦- لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا: شاعیری لاو... ناسیح مستەفا یوسف، ژ١٢، حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل٣٢-٣٣.

٧- لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا: مەلا مەحموودی دێرێ، ژ١٤، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥، ل٤٢-٤٣.

٨- قۆنگرۆکە، ژ٢١، هاوینی ٢٠٠٧، ل٤٥-٤٧.

٩- لەبەر بەرازان واز لە کشتوکاڵی ناهێندرێت، ژ٢٢، پایزی ٢٠٠٧، ل٤٨-٤٩. ئەم بابەتە لە کتێبی: (هەتا دەمری نازانی چیت بەسەردێ، کۆمەڵێك بەسەرهات لەزمانی مام خالید) دا بڵاوکراوەتەوە.

---

١- ئەم گۆڤارە سەرەتا ساڵی (٢٠٠٢)، دوو جار بەناوی شارەوانی ڕانیە (پوختەی کارو چالاکییەکانی) دەرچووە، پاشان لە ژمارە (٣)ەوە ناوەکەی بۆتە گۆڤاری ڕانیە لە ساڵی (٢٠٠٣)ەوە، ئەم گۆڤارە تاوەکو وەستانی (٢٤) ژمارەی لێدەرچووە.

# ئێمەش وشەدۆستین!

لە ڕۆژنامەی هاوکاری خۆشەویستدا، لە ژمارەی (٨٢١)ی پێنجشەممە (١٩٨٦/١/٢) لە لاپەڕەی (٧)دا، نووسینێك لەلایەن کاك (ئیسماعیل تەنیا)وە لەژێر ناونیشانی (فەرهەنگی ئاری و چەند سەرنجێك) بڵاوکرایەوە، کە نووسەر سەرنجی خۆی بەرابەر هێندێك وشەی نێو فەرهەنگی ناوبراو دەربڕیبوو.

کاك سابیر گردعازەبانی، وەکو (کتێب) خاوەنی فەرهەنگەکەیە، بەڵام وەك زمان هەموو کوردێك خاوەنیەتی، بۆیە منیش بە مافی خۆم زانی کە وەکو وشەدۆستێك، نووکە پێنووسێکی تێوەربدەم.

بێگومانە کە زمان یەکێکە لە مەرجە هەرە سەرەکییەکانی هەموو نەتەوەیەك، بە خزمەتکردن و پەرەپێدانێتی، نەتەوەکە پێشدەکەوێ و، بە پشتێکردن و گوێ پێنەدانیشی، بەرەو هەڵدێری نەمانێ دەچێت.

ئەم وشانەی ناو فەرهەنگەکەش کە ڕەخنەیان لێگیراوەو سەرنجیان ڕاکێشاوم، ئەمانە هێندێکیانن:

١-(ئاتەشکێش)، بە لێکدانەوەی کاك سابیر: جۆرە ئامرازێکە وەکو خاکەنازێکی بچووك وایە دەمەکەی کەمێ بەدیوێکدا نووشتاوەتەوە، پۆلووی ئاگری لە پشتەوەی سۆبەی داران، پێدەکێشنە پێشەوە، (ل٤٨).

کاك ئیسماعیلیش دەڵێ: ڕاستییەکەی مەقاشە یان (ماشە)یە، ئامرازێکە لە ئاسن دروست دەکرێت، نانەواکان بۆ نان دەرهێنان بەکاری دەهێنن، هەر هەمان ئامرازیش بۆ دەرهێنانی پۆلووە ئاگرو شتی تر بەکاردێت.

بە دیالێکتیکی پشدەریشیان داناوە.

منیش دەڵێم: هەردووکیان لە بارەی ئەم ئامرازەوە بەهەڵەداچوون.

(ئاتەشکێش)ـەکەی کاك سابیر، بێگومانە کە فارسییەو، وشەی (ئاتەش)یش بەڵگەیەکە کە چ زمانێکە. مەقاشەکەی ئیسماعیلیش، ئەوە ئامرازێکی دیکەیە، کە هەرچەندە لە بەکارهێناندا هەردووکیان کەمێك لە یەکترەوە نزیکن، بەڵام لە شێوەدا زۆر زۆر لە یەکترەوە دوورن.

ڕاستییەکەی ئەو ئامرازە، پێیدەگوترێت (مەدوونە) لە سەرتاسەری مەرگەو پشدەرێش هەر بەو ناوەوە ناسراوە، کە من وەبیرم دێت، بۆ خۆمان (مەدوونە)مان هەبووەو ڕەنگە لە زۆر ماڵاندا ئێستاش هەر مابێ.

٢- كاك سابیر دەڵێ: (پاپۆکە) (ل٥٨) کاک ئیسماعیلیش دەڵێ: (پەپکە)، کە دیسان بە دیالێکتیکی پشدەریشیان دەستنیشان کردووە. منیش وەک پشدەرییەک دەڵێم، هەردووک وشەکان، هەریەکەیان مانایەکی تایبەتی خۆی هەیەو، هەریەکەشیان بۆ مەبەستێکی لەویتر جیا، بەکاردێت.

(پاپۆکە): کە مار لە ڕۆژانی پاییزو دەمەو بەهاراندا خۆی لەبەرهەتاویێ هەڵدەخات و بازنەیی خۆی لێکدەهاڵێنێ و شێوەی (ساج) وەردەگرێت، پێیدەگوترێت، (پاپۆکە)، وەکو: «مارەکە زۆر گەورەبوو، پاپۆکەی بەئەندازەی سێڵێکی گەورە دەبوو». بەڵام وشەی (پەپکە): بەرزاییەکە لە گومبەزی گەرماو دەچێت و بچوکتر، بۆ ڕوونکردنەوەش. ئەگەر خەرمان گێرەکردن لە کرشەشکێنی دەرچوو، دەبێتە وردەکوت، کە ئەوەش کردارێکی کۆتاییهاتنی گێرەیە، جا هەرچی وردەیەک کە کوتانی تەواوبوو، لە نێوەڕاستێدا کۆدەکرێتەوەو پێیدەگوترێت (پەپکە)، ئەوەی کە لەبەرپێی وڵاخەکانیش دەمێنێتەوە، پێیدەگوترێت (کێڵ)و، بە هەردووکانیش دەگوترێت (کێڵ و پەپکە).

٣- (ئاریبباری) هەڵووچە هەڵووژە... جاریێ (ئاریبباری) هەڵووچە هەڵووژە نییە! هەڵووچەو هەڵووژەش هەر یەکێکن! بەڵام بەگوێرەی شوێن، دەبنە دوو ناوی جیای یەک چەشن میووە، ئاریبباریش وەکو وشە، دیالێکتیکی دەشتی کۆیەیەو میوەیەکە، لەتام و وەرزدا لەگەڵ هەڵووژە لە یەکدەچن، بەڵام لە قەوارەدا بچووکترەو لە هەڵماتێکی شووشە گەورەتر نییەو (ئالووباڵوو)شی پێدەگوترێت.

٤- (ئاشگێڕ): (ل١١٩)، کاک سابیر دەڵێ: «ئەو ئاوەیە کە ئاشی پێدەگەڕێ.» بەڵێ ڕاستە، بەڵام بەمەرجێك بەیارمەتی پیتە بزوێنی (ە)ی وشەی (ئاو)یشی بچێتە پاڵ و ببێتە (ئاشگێڕەئاو)، کە دەبێتە ناوێکی ناسادەی لێکدراو، بۆ نموونە: «جا، کاکە، چۆن! دێراوەکانت خراپ نابن! کوڕەکەت دوێنێ بە ئاشگێڕەئاوێکی تووتنی ئاو دەدا!»

کاك ئیسماعیلیش دەڵێ: (ئاشگێڕ) ئەو کەسەیە کە ئاشەکە دەگێڕێ و سەرپەرشتی دەکات، دیالێکتێکی ناوچەی سلێمانی و پشدەریشی کردووە بە بەڵگە.

ڕاستە دەبوو وابووبایە، چونکە وشەی (گێڕ) کە ڕەگی چاوگی (گێڕان)ـە، بۆ کەسێك بەکاردێت کە کارێك بکات و کارەکە گەڕانی تێدابێت، وەکو: گێرەگێڕ، بانگێڕ، دەستگێڕ، بگێڕ، کە ئەوەی دواییان، بە دروستکەری فەرەنجی و لباد دەگوترێت. لەبەرئەوەی کە ئاوەکە هەڵسووڕێنەری ئاشەکەیەو ڕاستەوخۆ دەیگێڕێ و کەسەکەش سەرپەرشتیدەکات، ئەوە ئاوەکە دەبێتە (ئاشگێڕەئاو)و کەسەکەش دەبێتە (ئاشەوان). لە پشدەریش ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی ئاشی دەکات پێیدەڵێن دەڵێن (ئاشەوان) بۆ نموونە:

«مام قادر لە منداڵییەوە هەر ئاشەوان بووە.» وشەی (وان)یش کە دەبێتە پاشگری ناو،

دەیکاتە ناوێکی ناسادەی دارێژراو، بۆ نموونە: دارەوان، شاخەوان، پاسەوان، کەشتییەوان، تۆرەوان[1]، تۆڕەوان[2].

٥- ئاواڵکراس، (ل١٧٤)، کاک سابیر دەڵێ: دەرپێی ژنانە. کاک ئیسماعیلیش دەڵێ: بە مانای بنکراس یاخود ژێرکراس دێت.

ئەمنیش دەڵێم: (ئاوەڵکراس) دەرپێی ژنانە، چونکە لەکاتێکدا کە ژنی کوردان ژێرکراسیان نەبووە، یان لە لادێکاندا ئێستاش ژێرکراس نییە، دەبێ بە چی دیکەیان گوتبێ، یان بڵێن (ئاوەڵکراس)؟!

کە وشەی (ئاوەڵکراس)یش لەو شوێنانە هەر بەکاردێت. بۆ پیاوان دەگوترێت، (کراس و دەرپێ) بۆ ژنانیش (کراس و ئاوەڵکراس) لەکۆتاییدا هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو ئەو دڵسۆزانە دەخوازم کە خزمەتی وشەی پیرۆزی کوردی دەکەن[3].

---

١- تۆرەوان: ئەو کەسەیە کە بەکرێ پاسەوانی دەغڵ و دانی دەکات.

٢- تۆڕەوان: ئەو کەسەیە کە بەکرێ وڵاخە بەرزان دەلەوەڕێنێ.

٣- ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ٨٧٤، پێنجشەممە، (١٩٨٧/١/١٥)، ل٥.

# لە پێناوی وشەدا

ووشەی «گێڕ» ڕەگی فرمانی چاوگی «گێڕان»ـە و بنچینەی داڕشتنی فرمانی داخوازی و ڕانەبردووە.

ئەم ووشەیە یەکێکە لە ووشە چالاکەکانی نێو زمانی کوردی، چ لەبارەی ئەنجامدانی ئەرکەکان لە نێو ڕستەدا و چ لەبارەی ماناوە، کە دەتوانێت کۆمەڵێك مانای لە یەکتر جوێی جۆراوجۆر، بدات بە دەستەوە بەنموونە:

١- بەپێوەلکاندنی پیتی (ب) وەکو پێشگرێك ووشەکە دەبێتە (بگێڕ) کە ناوێکی تایبەتە بۆ ئەو کەسانەی لباد و فەرەنجی و کەپەنك دروست دەکەن.

٢- گێرەگێڕ: لە دوو ووشەی لە یەکتر نزیکەوە پێکهاتووە، یەکەمیان (گێرە) کە پیتی (ر)ـەکەی لاوازە و بەمانای کردارەکە دێت. ووشەی دووەمیش (گێڕ)ـە، (ڕ)ـەکەی قەڵەوە و لە چاوگی (گێڕان)ـەوە هاتووە و بەهەردوو ووشەکە، ووشەیەکی تازەی لێکدراوی بێ یاریدە دروست دەکەن، کە بەو کەسانە دەڵێن کاری خەرمان گێرەکردن دەکەن.

٣- گێڕاوگێڕ: ئەو ئاوەڵناوەیە کە کەسێکمان پێشان دەدات لە ڕۆیشتندا هەر هەنگاوەی بەلایەکدا بلەنگێت. بۆ نموونە: «حەمە گێڕاوگێڕ دەڕوات».

٤- شەوگێڕ: بەمانای بەشەوگێڕان دێت. گوندێکیش بەو ناوەیەوە لە دەشتی کۆیە هەیە، کە ئاوەکەی بەشی کشتوکاڵ و ئاشگێڕانیشی نەکردووە، لەبەرئەوە بەڕۆژ کشتوکاڵیانیان پێ ئاوداوە و بەشەویش ئاشەکەیان پێ گێڕاوە.

٥- چەپگێڕ: لێکدراوە، لە دوو ووشەی چەپ و گێڕ دروست بووە.

کە ووشەی چەپ: ئەو لایەیە بەتەنیشت لای ڕاستەوەیە، یان کە دوو کەس بەرابەری یەکتری دەوەستن، لای ڕاست دەبێت.

زۆرجارم لە جووتیاران بیستووە کە دەڵێن: «ئێسترەکەم ڕاست و چەپێکی خواسە»، واتە پێشوویەك و پاشوویەکی بێ ناڵن،کە پێشوو هەردوو پەلی پێشەوەن و پاشووش، هەردوو پەلی دوواوەن.

٦- ئاشگێڕ:ئەم ووشەیە هەر بەتەنیا بەمانای ئەوە نایەت کە وەکو کاك موعتەسەم ساڵەییش دەچێتە سەر ڕایەکەی مامۆستا گردعازەبانی و لە ڕۆژنامەی هاوکاری بەڕێزی ژمارە ٨٩٥ی ١٩٨٧/٦/١٨دا دەڵێت: «ئاشگێڕیش هەر وەك مامۆستا بۆی چووە بەواتای ئەو ئاوە دێت کە ئاشەکە دەگێڕێت».

نەخێر ئەوە وانییە، بەڵکو ئاشەکە بەهەرچی هۆیەك بگێڕدرێت، ئەوە ئەو هۆیە ئاشگێڕە. خۆ ئەگەر ئاشەکە ئاشی ئاو نەبوو! وا دامانناا(ئاشی با) یان (ئاشی کارەبا) بوو،

ئەوە دیارە هۆی گەڕانەکەی بان (با)یە، یان (کارەبا)یە! ئایا ئەوکاتە دەتوانین بڵێین: ئاشگێڕ، بەواتای ئەو ئاوە دێت کە ئاشەکە دەگێڕێت؟! بێگومان نە، بەڵکو بەگوێرەی هۆی هەڵسووڕاندنی ئامێرەکە، پێناسە دەکرێت و ووشەکەش هەر بەو گوێرەیە دروست دەبێت، وەکو (ئاشگێڕە ئاو، ئاشگێڕە با، ئاشگێڕە کارەبا).

کە لێرەدا ئەم ووشانە دەبنە پێوەرێك بۆ زانینی چەندێتی ڕاددەی زۆر و کەمیی ئاوەکە و هێزی کارەبایەکە و تەوژمی بایەکە، چونکە نە ئاوی کەم و نە بای بێتەوژم و نە کارەبای بێهێزیش، ناتوانن بەرداشەکە هەڵبسووڕێنن و کارەکە ئەنجام بدەن.

٧- وێی گێڕە: ئەم ووشەیە بەمانای (تێی بکە) دێت.

٨- تێی گێڕە: بە مانای (بەناویدا بگێڕە) دێت.

٩- وەری گێڕە: ئەمدیوو ئەودیوی بکە.

١٠- دای گێڕە: بەرەو خواری بەرە.

١١- هەڵی گێڕە: پێچەوانەی دای گێڕەیە.

١٢- «لەسەرسەرتی دەگێڕم، لەبەرتۆی دەگێڕم، لە دەورتی دەگێڕم» لێرەشدا ئەم وشانەش هەموویان بەمانای لەپێناوی بەختکردندا بەکاردێن. زۆر جاران دەبیستی کە ئەم وشانە لەنێوخێزاندا بەکاردێن بۆ نموونە، دایکەکە بە کچەکەی دەڵێت: «ئەو منداڵە مەگریەنە، لە دەوری منداڵەکەت دەگێڕم» لەکۆتاییدا هیوای سەرکەوتنم بۆ هەموو دۆستانی ووشەی پیرۆزی کوردی هەیە[1].

---

١- ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ٩٠٩، ١٩٨٧/٩/٢٨، ل٦.

## چوار شەو لەگەڵ چوارینەکانی مەحوی-دا

لەلاپەڕەی (٣٤٨)ی دیوانی مەحویدا چوارینەیەك لەژێر ژمارە (٣١)دا بەشێوەی بەرنووسی کۆن وەکو خوارەوە تۆمارکراوە:

چوته چم سووی چمان اشکم چمان

چم لچم جاری نبی بو چم چمان.

چم له بیداری چمی بختی چمی

چم دکا دیوت لچم کمتر چمان

لەدامێنیشدا لەژێر ژمارە (١)دا ئەم چەند دێڕە نووسراوە:

«هەرچەند بەشێکی ئەم چوار خشتەکیەمان بۆ ڕاستکراوەتەوەو بۆچوونێکی تایبەتییشمان بۆ ئەو بەشەکەی هەیە، لەبەر بێ متمانەییمان بەتەواویی ڕاستکردنەوەو بۆچوونەکەمان، وامان بەباش زانی هەر بە ڕێنووسە کۆنەکەی خۆی بینووسینەوەو هیچی لەسەر نەنووسین و بەجێی بهێڵین بۆ لێکدانەوەی خوێندەواران و دواڕۆژ.»

لەبەرئەوەی کە بەجێ هێڵدراوە بۆ لێکدانەوەی خوێنەر، منیش بە بۆچوونی تایبەتی خۆم گەشتێکم بەنێو ئەو گوڵزارەدا کردو چوار شەوی تەواو لەنێویدا خەریك بووم و چوارینەکەم بەمشێوەیە هێنایە سەر بەرنووسی تازەو چوار ژمارەشم بۆ هەر چوار دێڕەکە داناو، لە هەردێڕێکیشدا ژمارەم بۆ (چەم و چەمی و چەمان) دانا:

١- چۆتە چەم (١) سەرووی چەمان (٢) ئەشکم چەمان (٣)

٢- چەم (١) لە چەم (٢) جاری نەبێ بۆ چەم (٣) چەمان (٤)

٣- چەم (١) لەبێداری چەمی (٢) بەختی چەمی (٣)

٤- چەم (١) دەکا دەی ووت لە چەم (٢) کەمتر چەمان (٣)

لێکدانەوە:

### ١- دێڕی یەکەم:

چەمی یەکەم: دڵنیام لەوەی کە ئەم (چەم)ـە، شوێنە، گریمان گوندێك بوو کە (سەرووی چەمان) چووە بۆ ئەوێ. (چەمان)ی دووەم بە مانای کۆی باغ دێت کە دەبێتە باغان، دیارە کە ووشەی (سەروو)ش، خوازراوە بۆ باڵای بەرز کە چۆن سەروو لەنێو درەختان بەرزە، خۆشەویستەکەی مەحویش، باڵابەرزی نێو باڵابەرزانە.

(چەمان)ی ژمارە سێ بە مانای داوەرین و هاتنەخوارەوە دێت.

مانای دێڕەکە: ئەو کەسەی خۆشەویستی مەحوی یەو باڵای بە سەرووی ناوباغان چوێندراوە، چۆتە گوندی چەم و مەحویش لە دووریانی بەلۆزەو فرمێسکی دێنەخوارێ.

**٢- دێڕی دووەم:**

چەمی یەکەم: بەمانای ڕووبار دێت، بەڵام ڕووباری فرمێسك.

چەمی دووەم: بەمانای چاو دێت کە سەرچاوەی ڕووباری فرمێسکە.

چەمی سێیەم: بەمانای ڕووبار دێت، بەڵام نەك ڕووباری چاوی مەحوی خودی خۆی، بەڵکو ڕوباری چاوی چەند کەسێکی دیکەی ئاشقی وەکو خۆی.

ووشەی (بۆ) لێرەدا بە ئامرازی پەیوەندی نایەت، بەڵکو کورتکراوەی ووشەی پرسی (بۆچ)ـە، کە بە هەردوو جۆرەکەی، هەر مانا دەدات.

چەمانی چوارەم: کۆی چەمە و بە مانای ڕووباران دێت کە چەنداوانێکی چاوی ئاشقانە.

مانای دێڕەکە: هەروەکو چۆن ئەگەر ڕووبار سەرچاوەکەی کانی نەبێت، ڕووبارێکی هەمیشەیی نییەو وەکو ئاوی کوێرەشیوان ئەگەر باران باری، لافاو دەکات و ئەگەر بارانیش برانەوە، وشك دەکات، کە ئەوەش دیارە بە ڕووبار ناژمێردرێت، هەروەها ڕووباری چاوی مەحویش، ئەگەر هەمیشەیی و بەخوڕەخوڕو سوورو سوێر نەبێت، بۆچی بچێتە ناو ڕووباری چاوی ئاشقانەوەو ئاشق گەمەی پێ بکەن و بەتوانجێکەوە بڵێن ئەو جۆگەلۆکە ڕوونەش ئاوی چاوی مەحوی یە!

**٣- دێڕی سێیەم:**

(چەم)ی یەکەم: ناوە بەمانای باڵادێت کە لە ئەنجامی فرمانی (چەمی) چەماوەتەوەو فرمانەکەش لە ئەنجامی بێداری و ئازارو ئەندێشە ڕووی داوە.

چەمی دووەم: بە مانای چەمانەوە دێت وەکو چەمی گۆچان.

چەمی سێیەم: بەمانای چەمی یەکەمی دێڕی یەکەم دێت کە ئەو گوندەیە سەرووی باغانی لێیە. مانای دێڕەکە: باڵا لەبەر ئازارو بێدارییە دووری (سەرووی چەمان) چەمایەوە. ئەوەش بەختی گوندی (چەم)ـە کە باڵا بەرەو نەمان دەچێت، چونکە کە مەحوی بەرەو نەمان شۆڕبێتەوە، ڕەنگبێ سەرووی باغان، هەر لەگوندی چەم بمێنێتەوە.

**٤- دێڕی چوارەم:**

(چەم)ی یەکەم بەمانای ڕووبارێك دێت کە لافاو بکات ئەویش گوندی (چەم)ـە وا هەستاوە.

(چەم)ی دووەم بەمانای ڕووبار دێتەوە بەڵام ڕووباری فرمێسکی چاوی مەحوی.

(چەمان) بەمانای هاتنە خوارەوە دێت.

مانای دێڕەکە: کە بەختی گوندی چەم وەکو ڕووبار لافاو دەکات. گەمان بە ڕووباری چاوی مەحوی دەکات و دەڵێت: لە ڕووباران کەمتر دێتە خوارێ!

مانای چوارینەکە: ئەو باڵا بەرزەی کە خۆشەویستی مەحوی بووە. لێی دوورکەوتۆتەوەو

چووەتە شوێنێك كە ناوی چەم بووە، مەحویش لەتاوانی پشتی چەماوەتەوەو فرمێسكی هاتوونە خوارێ، ناچار ئەو ئاشقە قەلەندەرە بێچارەیە، هەر گریاوەو دادو فیغانی كردووەو فرمێسكی هەڵڕشتوون.

ئاگری دورکەوتنەوەی سەرووی چەمان، لەژێر مەنجەڵی دەریای دڵی مەحویدا گڕی سەندووە، دەیسووتێنێ و، وشكی دەكاتەوەو بەرەو نەمانیشی دەچەمێنێتەوە. ناچاریشە كە بەدەستی خۆی ئاگرەكە خۆشترو خۆشتربكات و پتریش بچەمێتەوە بۆئەوەی ئاو زۆرترو بەگوڕتر لە چاوانی بێتەخوارێ، كە هاژە بكات بۆ نێو چەنداوانی ڕووباری چاوی ئاشقان دڕیان پێ بدات و ئاشقان دەستی بۆ لە ملی خۆیان بدەن و بڵێن بەڕاستی مەحوی سەلماندی كە سەرداری ئاشقانەو ڕاستیكردووە كە گوتوویەتی:

«بەشۆخی دیـن و دڵـی دا بـەتـاراج، ئێستە وەك صوفی
بە سەبحەی ئەشكەوە هاتۆتە سـەر تەركی نـەزەر چـاوم[1].»

١- ڕۆژنامەی هاوكاری، ژ١٠٤٣، پێنجشەممە، ١٩٨٩/١/١٩، ل٦.

## ڕاستکردنەوەی نووسینی هێندێك پیت لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییدا

گومانی تێدانییە پیرۆزترین پیشە لە سەرتاسەری جیهاندا، پیشەی مامۆستاییە. لە هەرشوێنێك ترووسکاییەك پێشکەوتن بەدی بکرێت، ئەوە لەسایەی مامۆستاوەیەو جێگا پەنجەی ئەوی پێوە دەدرەوشێتەوە. میللەتانیش هەتا بەرەو پێشەوەتر بچن، مامۆستایانیان لەلا مەزنترو مەزنتر دەبێت، هەربۆیەش پێویستە مامۆستا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، پەرە بە پیشەکەی خۆی بدات و بەرەو پێشەوەی بەرێ. وشەکە یەکەم هۆی پێشکەوتنی ئادەمیزادە، خۆشەویستترین دۆستی مامۆستایانە، پەرەپێدانی دۆستیش، نیشانەی دڵسۆزی دۆستایەتییە.

لێرەدا دەمەوێت باسی نووسینی پیتەکان بکەم، وەنەبێت هەر لەخۆمەوە سواری سەری ئەم باسە بووبم، بەڵکو لەئەنجانی تێبینیکردنی نووسینی قوتابیان لەسەر کاغەزو تەختەی ڕەش لە پلەکانی خوێندنی جیاجیاش کە لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە تاکو پۆلی سێیەمی ناوەندی دەگرێتەوە، بۆیە بەپێویستم زانی تێبینییەکانم بخەمە بەرچاوی بەڕێزان مامۆستایانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی.

بێگومان لەکاتی گوتندا پیتەکان هەریەکەیان بەشێوەیەکی جیاواز لەوی دیکەیان، دەردەبڕدرێت و هیچیان بەو شێوەیە دەرنابڕدرێت کە شێوەی ئەو دیکەیانە.

هەوا بەڕێگەی گەرووداً دێتەدەرەوە تاکو دەگاتە نێو بۆشایی دەم و لەوێشدا بەهۆی ئامرازەکانی وشەدروستکردنەوە، ئەو هەوایە پارچە پارچە دەکرێت و چۆن بویسترێت، وای لێدەکرێت، لەپیتەوە بۆ وشەو لەوێشەوە بۆ ڕستە.

پیتەکانیش هێندێکیان گەروین و هێندێکیان لێوین و هەشیانە بەشێوەیەکی دیکە دەردەبڕدرێن، دیسان ئەوانیش سەر بە هەرشێوەیەك بن، لەو شێوەیەشدا وەکو یەك و بەیەك شێوە دەرنابڕدرێن.

بۆ نمونە: پیتەکانی (ب، پ) کە هەردووکیان پیتی لێوین، کەچی لە دەبڕینیاندا جیاوازییەکی هەستپێکراو هەیە، هەروەها پیتەکانی (ح، خ، ع، غ) هەموویان پیتی گەروین، کەچی لە دەربڕینیشیاندا شێوەی جۆراوجۆریان هەیە.

پیت، بچووکترین دانە دەنگە کە لە زار دێتەدەرەوە، لە نووسینیشدا بچووکترین وێنەی بۆ داندراوە کە ناتواندرێت لەوە بچووکتر بکرێتەوە چونکە بە بچووککردنەوەی لەوێنەی دەنگی پیتەکە دەشۆڕێتەوە. هەر دانە دەنگێکیش وێنەیەکی تایبەتی خۆی بۆ دانراوە کە لە وێنەی دەنگەکانی دیکە جیادەکرێتەوە پێی و دەناسرێتەوە.

پیتەکان هەریەکەیان نووسینێکی تایبەتی خۆیان هەیە کە چۆنێك بۆ نووسین ئاسانە

وادانراوه، بۆیه پێویسته لەکاتی نووسیندا هەر پیته بەشێوەی ڕاستی خۆی بنووسرێت و مافی خۆی، لەبارەی ڕاستی و خۆشی و جوانییەوه بدرێتێ.

دەمێکه گوتوویانه: «هەموو ڕێ دەچنەوه بۆ بانێ!» بەڵام باشترین ڕێگا ئەو ڕێگایەیه که خۆشترین و نزیکترین ڕێگابێت، بۆیه پیت نووسینیش به شێوەی ڕاستی خۆی باشتره.

ئەوەش هێندێك له تێبینییەکانمه:

١-پیتی (سێ)یه ژمارەی چوکڵەکانی ئەم پیته سێ چوکڵەیه، بەڵام زۆر جاران قوتابیم بینیوه که بەم شێوەیه ( ﺳ ) نووسیوه. بێگومان ئەوەش وێنەی ڕاستی دەنگەکه نییەو بەڵکو وێنەیەکی مردووی بێدەنگه.

٢- پیتی (ل): بەهەڵه قوتابیان بەپێچەوانەوه دەست بەنووسینی دەکەن بەمشێوەیەی که دەبیندرێت (ل).

٣- پیتی (م، ه): ئەم پیته هەرجۆرەیان له نووسیندا پێچەوانەی ئەوی دیکه دەستی بۆ بەکاردەهێندرێت، زۆربەی قوتابیان بۆ هەردوو جۆرەکەیان وەکو یەك دەستی بۆ بەکاردەهێنن، یان هەردووکیان بەهەڵه دەنووسن (و، م)، بەڵام ڕاستی نووسینی (م) جووڵانی دەستی وەکو گێڕانی میلی سەعات دەوێت و ئەوی دیکەشیان بەپێچەوانەوه دەبێت.

باشتر ئەوەیه بۆئەوەی ئەم باسه درێژه نەکێشێت خشتەی هەڵەو ڕاست بۆ ئەو پیتانه دابنێین که تێبینیم لەسەریان هەیەو له دەسخەتی قوتابیانی پۆلەکانی جیاجیا دیتوومن و هۆیەکەشی دەگەڕێتەوه بۆ مامۆستای یەکەم پۆلی خوێندن.

| ڕاست | هەڵه |
|---|---|
| ق | ﻗ |
| ف | ف |
| ڵ | ڵ |
| و | و |
| له | له |
| گ | گ |
| لا | لا |

پیتەکانی (گ، ك) شێواو: هەرچەنده که ئەم دوو پیته لەم (ئەلف و بێ)یەدا بێ وێنەن بەڵام پێویسته لەکاتی خوێندنەوەدا قوتابیان فێربکرێن که بەدەنگی شێواو بیانخوێننەوه که پیتی (گ)، وشەی (گیا) وەکو پیتی (گ) وشەی (گورگ) نەخوێننەوه یان پیتی (ك) وشەی (کوێر) وەکو پیتی (ك) وشەی (کوردستان) نەخوێننەوه، باشتره ئەگەر مامۆستا

لەتوانایدابێت قوتابیان لەسەر ئەوە ڕابهێنێت کە هەرکاتێك پیتی (گ) و (ك) لەوشەدا کەوتنە پێش پیتەکانی (ێ، ی، وێ) بەشێواوی دەخوێندرێتەوە وەکو (کێ، گێرە، کوێ، گوێ، گیپە) لەگەڵ ئەمانەشدا باشترە ئەگەر گرنگی بە خۆشنووسی بدرێت، چونکە دەمێکە گوتوویانە «نووسینی خۆش ڕاستی ڕوونتر دەکەنەوە[1]» مامۆستایانیش لە هەموو کەس زیاتر لەبەر دەستخەتی ناخۆشی بەئازارن.

لە قوتابخانەی ئاسۆسی سەرەتایی کوڕان، بەسەرپەرشتی کاك عارف حەسەن ئەم باسەم پێشکەش بە مامۆستایانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی ناوچەکە کردو لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا[2].

---

١- ئەو وتەیە، وتەیەکی پیرۆزی حەزرەتی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە، دروستەکەی بەمشێوەیەیە: «الخط الجمیل یزید الحق وضوحاً - خەتی خۆش ڕاستی ڕوونتر دەکاتەوە!» (ئامادەکاران)

٢- ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ١١٤١، (١٩٩٠/١/٤)، ل٨.

# تویکلی قەدەگویز

ساڵێکی لە ساڵەکانی هەشتایەکاندا[1] جاش زۆر لەخۆبایی ببوون، زۆر جاران هەر بەئارەزوو خەڵکی سیڤیلیان دەدایە بەردەسترێژی گوللان، جا چی دەبوو، با ببایە بۆ ئەوجۆرە کارانەش لێپرسینەوەیان لەسەر نەبوو.

ڕۆژێکی، خێزانێکی خۆمان کە پیشەیان کشتوکاڵ بوو، لە پشدەرێ لە بناری چیای ئاسۆسی، بژاری شەتڵە تووتنانیان دەکرد و، بەبێ هۆ جاشان تەقەیان لێکردن و گوللەیەک بە ڕانی کچێکی گەنجی خوشکەزام کەوت و زۆر بەخراپی شکاندی. بۆ چارەسەرکردنی پێویستی بە بەغدایە بوو. بۆ ئەو مەبەستەش کۆبووینەوە کە کێ بیباتە بەغدایە! کە بە هەرکەسێکمان دەگوت واباشە تۆ بیبەیت، دەیگوت: ئەمن چەقە چەقەکەی نازانم، یان دەیگوت ئەو وەڕە وەڕەم زانیبا دەمبرد. بە قسەکانیان دیاربوو کارەکە ڕووی لەمن بوو بۆیە بێدەنگ بووم، بەڵام لەکۆتایی قساندا گوتیان: بەخوا خاڵە لەتۆ زیاتر کەسمان نییە بیبات! بەئەدەبەوە، جنێوەکەم پێدراوە ئەرکەکەش سەربار!

کات بەهاربوو، لەنیوەی یەکەمی مانگی پێنجدا بوو، بەرەو بەغدا ڕۆیشتم و لە نەخۆشخانەی (جێبەچی[2]) ئێسکشکانی تایبەتی، نەخۆشەکە و هاوەڵەکەم دانا. ڕۆژانە جارێك، یان دوو جار دەچوومە لایان و چی پێویستبایە بۆم جێبەجێ دەکردن، ئیدی کاتەکەی دیکەم هەمووی بەگەڕان و ئەملاولا بەسەردەبرد. من لەژیانمدا بەغدام پێ خۆش نەبووە، کاری پێویستم نەبووبێ نەچووم، جا ئەوجار کە ئەرکی نەخۆشیشم بەسەرەوە بوو، زۆرم پێ ناخۆشتربوو. ڕۆژانە بەبێ شوێنی دیاریکراو دەگەڕام، نزیکەی زیاتر لە دە ڕۆژم بەوجۆرە ڕابوارد، کەم شوێن مابوو کە بۆی نەچم. ڕۆژێك لەنێوان ئەو ڕۆژانەدا، ڕێم کەوتە شۆریجەی، هێواش دەڕۆیشتم و ئەمبەرو ئەوبەر چاوم دەگێڕان. دیتم پیرەژنێکی ڕەشی ڕەشپۆش کە هەر لە بنەکۆلکەبی سووتاوی نێو بیەڵێنی دەراوی ئاشی ئاوێ دەچوو، لەسەر دوکانێك دانیشتبوو، سەری خۆی بەپەڕۆیەکی ڕەشتر لەخۆی، پێچابوو، لە پارچە تاریکەشەوێکی ئەنگوستەچاوی گیارەشی بەهارێ دەچوو، ڕووی کوترابوو، بەتایبەتی چەناگەی لە دووشەشی پووڵی دۆمینەی دەچوو.

لەتەنیشت پیرەژنێ مێزێك داندرابوو، لەسەر مێزەکەی تویکڵێکی قەدەگوێزی بە دیوارەکەیەوە ڕووەو دەرەوە هەڵپەسێرادرابوو، تویکڵەکە نزیکەی مەترێك درێژ و لەپەدەستێك پان دەبوو، لەپێشەوە گومانم کرد کە ئەوە تویکڵی قەدەگوێزە، یان شتێکی دیکەیە، وردە وردە بەلایەوە چووم، کە نزیك بووم، دروست خۆی بوو.

---

١– مەبەست لە هەشتاکانی سەدەی بیستە.

٢ – جێبەچی: لە دەقە ئەسڵییەکەدا وا نووسرابوو، بۆمان ساغ نەبۆوە چییە. (ئامادەکاران)

به عەرەبی بەیانی باشم لە (یوممە)ی کردوو نرخی هێندێك شتم لێپرسی، لە دواییدا پێمگوت ئەو توێکڵی دارە چییە؟

(یوممە) زیرەکبوو، بە عەرەبییەکەمدا زانی کوردم؟ گوتی: چۆن ئەوە ناناسی؟! ئەوە هی خۆتانە، لە (شمال)ـەوە بۆمان دەهێنن.

گوتم: (یوممە) وەکو پێستی لەشی خۆم دەیناسمەوە، بەڵام مەبەستم ئەوەیە بۆ چ شتێك بەکاری دەهێنن؟!

(یوممە) گوتی: ژن بەپارچە لە منی دەکڕن و دەیبەن و کەمێك دەیستووتێنن، ئەوجارە لەئاوندا دەیکوتن و لەگەڵ هێندێك ماددەی جوانکردن تێکەڵی دەکەن و (حسناوات) و (حلوات)یش لەو ژنانەی دەکڕن و لێوی خۆیانی پێ جوان دەکەن.

گوتم: خۆزگە لەو (حسناوات) و (حلوات)انەم دەدیت تاکو بمزانیبا لێویان چۆنە!!

(یوممە) هەرچەندە ڕووخساری جوان نەبوو، بەڵام بەپێچەوانەی ڕووخساریەوە گفتوگۆی لەهەواری گوێیاندا ئاوازێکی خۆشی هەبوو، دڵی خەواڵویان هۆشیار دەکردەوە تۆزێك بەئەسپایی گوتی: ئەگەر دەتەوێ جوانی ئەم توێکڵە گوێزە لەسەر لێوان ببینی، لەماڵی خۆماندا کیژەکانم بەکاری دەهێنن، وەرە دەچینەوە ماڵەوە، ببە بە میوانی ئێمە، ئێمە پێمان خۆشە لە (شمال حبیب) دۆستێکمان هەبێت.

گوتم: (یوممە) زۆرم پێ خۆشە میوانتان بم، هیچ گومانم لە بەخشندەیی ئێوە نییە، لەم بارەوە مێژوو دەستتان بۆ لەئەستۆ دەدات بەڵام کاتم نییە و بۆم ناکرێت، چونکە لەسەر سەفەرم، بەڵام حەمەی برام ئەمڕۆ دەگاتە ئێرە و ماوەیەکی باشیش دەمێنێتەوە ماڵیشی لەنێو لێرەواری دارگوێزانە زۆریشی ئارەزوو لە جەفەنگانە و ئێرەشی پێخۆشەو زۆرجاریش دێتە بەغدایە، ناوونیشانی تۆی دەدەمێ و ئەم نیوەڕۆیە بۆت دەنێرم، دۆستایەتی لەگەڵ بگرە، وێدەچێ هەردووکتان بەکەڵکی یەکتری بێن، با بینینی لێوی کچە جوانەکانت بۆ حەمەی برام بێت، ئەو بۆم دەگێڕێتەوە، ئەگەر پێی جوان بن ڕەنگبێ توێکڵی دارگوێزەکانی خۆمان و دراوسێکانیشمانت بۆ بهێنێت!

بەجێمهێشت و ڕۆیشتم، تاکو گەیشتمەوە میوانخانەکەم. ئەو چەند دێڕەی خوارێم بۆ توێکڵی قەدەگوێزی گوت، هەرئەوەندەشم لەدەست هات.

## توێکڵی قەدەگوێز

لە بەغدایە، لە شۆڕیجەی
لە دوکانی ئوم خەدیجەی
دیتم توێکڵی قەدی گوێزێ
هەڵپەسێردراو لەسەر مێزێ
وردە وردە لێی چوومە پێش
وەك ڕاکێشان دەیکردم کێش
لەلای ڕاوەستام لێم ڕوانی
بەپێستی لەشی خۆم زانی
سەرم لەئاستی دانەواند
وردە وردەش هەر دەمدواند
وتم هاوڕێی مێرگ و کانی
سەرداری سروشت و جوانی
ئەی پەروەردەی ئاوی سازگار
شۆخی درەختی ناو نزار
لەوجێ پاراو و زەنوێرە
چۆنە گەیشتوویە ئێرە؟!
بەزەردە خەندە پێکەنی
گلەیی کرد لە خاوەنی
بەخەندە تەوسەکەی دیاربوو
سەرتاپای لەشی ئازاربوو
وتی ئەوەی بەخێومکرد
بۆم گەورەکرد منداڵی ورد
بێ ئەمەك بوو بەرابەرم
سپڵە بە گوێز و سێبەرم
نەك شەڕی لەسەر نەکردم
بوو بەهۆی ئازار و دەردم
بۆ ئافەرینی عەرەبێك
بۆ زۆردارو بێ ئەدەبێك
بۆ وڵاتسووتێن و ڕووخێنان

بۆ کوردکوژ و دەست بەخوێنان
پێستی لە لەشم کردەوە
خۆشی لە بیرم بردەوە
سەربازیادە[1] سواری زیلیان کردم
زۆریان هێنام، زۆریان بردم
ئێستاش ئەوا لێرە کەوتووم
وەکو دەبینی ڕەنگ و رووم
لەدەست (یومە)ی هەراسانم
هەر هیچ لە زمانی نازانم
لەتم دەکا و دەمفرۆشێ
پارەکەی دەنێتە کۆشێ
بەوەش وازم لێناهێنن
پارچە پارچە دەمسووتێنن
ژن دەمکوتن و ووردم دەکەن
لەگەڵ چەند شت لێکم دەدەن
لەسەر دوکانان دامدەنێن
بەکۆمەڵ و بەتاك بۆم دێن
جا دێمە کڕین و سەودایە
بۆ لێوی (...) بەغدایە[2].

---

١ – سەربازیادە: لە دەقی نووسینی گۆڤاری ڕوانینیشدا هەر بەوجۆرە نوسرابوو. بۆمان ساغ نەبۆوە ئەسڵەکەی چییە. بێگومانین کە هەڵەیە. بۆچوونی ئێمە وایە کە ئەو (یادە) هەڵەی تایپ بێت و زیاد بێت و دەقی دێڕەکە بەوجۆرە بێت:
سەرباز سواری زیلیانکردم... (ئامادەکاران)
٢– گۆڤاری ڕوانین، ژ١٠، ٢٠٠١، ل١٢٢–١٢٥.

# تۆ

تۆ، ئەو نەمامە ساوایە گوڵەی کە ڕەگەکانت بەناو ناخی ئەندامەکانی جەستەمدا ڕۆچوون. خونچەکانیساڵی کەمتەمەنی گوڵ کردنیشت لەناو مێرگی بژوێنی بەهای چاوەکانمدا دەمیان بۆ نمە خوناوەی بارانی شەوی ئازارەکانم کردووەتەوە.

هەناسەکەم، پشووی هەناسەکانم بۆیە هێندە بزۆزو ساردو بەگوڕن، تاکە گژنیژە ئارەقی سەر گۆناو بەرگەردنت هەڵفڕێنن و تۆزی هەرزەی خۆنەناسی بەهەڵە لە پەرچەمان نیشتووت، تەکێن تەرەبکەن.

من شەپۆل و قەڵبەزەی ئاوی ڕووباری هەڵقولاوی سەرچاوەی چاوەکانی حاجی مەلا مەحودیم، تۆش سەروەکەی چەمانی و، لە چەمی سەرووی چەمانی، بۆیە هەمیشە هەدا نادەم و بەخوڕی و بە سوورو سوێرییەوە، بەگوڕوتین و هاژەوە دڕ بە لافاوی ڕووباری سەرچاوەی چاوەکانی فەرهادو هەموو فەرهادئاسایان دەدەم، بۆئەوەی کە تۆ هەموو دەمان لە ڕۆخانم، پاراو و، گەشاوە و شناوە و ڕازاوە بیت.

ناز و وردەنازەکانت، سروەی شەماڵی زەردەپەڕن، بە ئارامی بارێزە بسکی بڵندی ئەستەمە قەدەچیای نێو کاوی بەهاری شادیم شانە دەکەن و، بەرابەری بە هەودای پەرچەمی زەردی تیشکی خۆر دەهێننە شنەشێ و بەسەر سینەی تەخت و باڵای تاتەبەردی بریسکاوەیاندا بەردەدەنەوەو دەمخەنە نێو کۆڕی های و هووی دەروێشانی ڕەواویستی و جوانپەرستییەوە و بە بێهۆشبوونێ ژواری برینی سەختی دڵی کرۆزاوەم دەشکێنن.

من چاوم ڕەشی گەشی بادامی و شەرمەڕوانینی بەنازان بەجوانیانیان هۆگری کردووم، بەلەکی خڕو پڕی سپی ڕەنگی سەهۆڵی و، پانەی زەردی هەنجیری و گوێزینگی گوێ لە زێڕی، داری دارەدارەی ئیشقیان داومەتە دەست، خوڕەخوڕی جۆگەلەئاوی سەری خۆبەرەوخوار هەڵگرتووی کانی بەجێهێشتوو، هەستی بیستنی لە گوێییاندا هوروژاندووم، گۆماوی مەند و ڕوونی ئاوێنەی ئارایشتی نێرگزەجاڕی ئاسمانی شەوان، تروسکایی بینایییان تروکاندووم و سەرنجدانیان لێکردووم بە خوو... لەنجەی باڵاو، لەرەی کەفەڵ و سرکە هەڵوێستەی مامزی، چرۆی درەختی ئارەزووەکانیان پشکواندووم.

ئەرێ، هۆ، بەڵقیسایەکەی سولەیمانی دانا، تۆ ئەو شۆخەی کە کۆتری چاوی بەسینەت دەکەوێ ڕوو وەردەگێڕێت و، بەشەرمەزارییەوە سەر بەسەر سینەیدا بەردەداتەوە، نزمە پێکەنینێکت هوزاری خۆشخوان بێدەنگ و بێجووڵە دەکات و لەبری خوێندنێ، دەکەوێتە هەستڕاگرتن و بیستنێ.

کە گۆناکانت سوور هەڵدەگەڕێن و، وردەخوناوە ئارەقان وەدەردەنێن، ئاونگی ژوانی

شەوانی سەرپەڕەی گوڵان خۆی دەشارێتەوە، گوڵیش گەردنکەچ دەکەن و سێوەلاسورەش خۆیان دەخزێننە نێو لك و پەلکان و لە پەنایانەوە تێتڕادەمێنن. شەوان تاکو پێڵووی چاوەکانت وەکو جووتە ئاشقی تامەزرۆ، ئاشقانە سینە بەسینەی یەکدییەوە نەنێن و لەنێو نوێنی فەرامۆشییەدا دیتەکانت دانەپۆش، گەلاوێژی شۆخو شەنگی پرشنگداری تاریکەشەوی ئاسمانێ، پێی نەنگییە سەر وەسوێ بنێ و بکەوێتە پرشنگە بەملاولادا هەڵدانێ.

ئەو کاتەی پۆلە پەپولەی نیگاکانم لەسەر سینەی پەمەیی کاڵی نەرمتدا دەنیشنەوە و بڵاودەبنەوە و بێ ئارام دێن و دەچن، بیروهۆش و هەستم دەبنە کلووی لۆکەیی و خۆیان دەهاوێنە ژێر پێیانیانەوە، نەك خوا نەکردە برینێك، ڕووشانێك، پەنمانێك شەقڵی باخی ساوای خەملیووی بەهێیانت بشکێنن.

کە لێوی لێوەکانت سەرسامبوونی ژینی پڕ ئازارم خۆیان دەخەنە سەر یەکدی و بێدەنگی داتدەگرێ، من گوڵی پشکوتووی مەزاری مانگی گوڵانم دەبێتەوە خونچەی هەناو ڕەشبووی نەکراوەی مانگی خاکەلێوەی ساڵەکانی تەمەنی لاوی هیوا زۆرە نەبووەکانم.

هەرچەند جارێك کە دەتبینم نەمامی شلك و مانگ و ئەستێرە و سپێدە ڕۆژی ساماڵی مانگی نیسانی خەملیوە مێرگی بژوێن دەبنە وێنەی نێو چوارچێوەی چاوە بێدارەکانم و دوورانم بۆ نزیك دەکەنەوە.

من دێوانەی بیابانی بێروونی ژینی ئاڵۆزی خۆمم، بۆیە هەمیشە بەرگی ڕەشی ماتەمی عەبباسیانەم[1] پۆشیووەو بەگریان و لەخۆدانەوە، وێردی پەیشمانی کوشتنی حەوسەینی کەربەلا دەخوێنم.

دە ئەی ئاسوودەبەخشی کزەی جەرگەکەم، بۆ گۆڕینی ئەم ژینە تاڵەم، بۆ ڕزگارکردنم لەنێو گێژی گێژاوی پڕ مەترسیی گیان و ژیانم، تۆ وەرە، چدەبێ ئەگەر جارێك وەکو، بەهار، چەشنی مانگ، خۆرئاسا، بەدیمەنێك تریفەیەك، پرشنگێك، تاوەشادییەکم پێ ببەخشی و، لەنێوانی دوو مانگی خاکەلێوە و گوڵانی بەرابەری ئاپۆڕەی ناسۆرەکانم کەمە هەڵوێستەیەك بکەیت و هێندوکە سەرنج بدەی و، بەخەندەیەك، هەم خونچەی نەکراوە و هەم گوڵی کراوەم بی، هەم نەورۆزی ساڵی نوێ و، هەم گوڵانی وەرزی گوڵانم بی!

ئەی مەسیحای چارەسەرسازی کۆمەڵی دەردەکانم، دە بفەرمە، کەرەمکە، تەنیا کەمە کەرەمێك! کە بۆ تۆ بەخشینی بەشە زەکاتێکی خەرمانەگوڵی هاتی جوانیتە، بەڵام بۆ بەختەوەری لە ئەلفەوە هەتاکو یای، ئەوەندە ژینە سەر بەرەوخوارە کەمەیە کە ماوە، ئەمجا ئەو دەمەی منیش دەڵێم، جوانیت جوانتر و، بەخشینت پتر و، ماڵت ئاوا، ماڵت ئاوا[2].

---

١- لە کۆندا ڕەنگی ڕەش، ڕەنگی ئاڵای سەفەوییەکان بووە، وەك نیشانەی ماتەمینی بۆ ئیمامانی شیعە و بە تایبەتیش ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی ئەبوتالیب

٢- گۆڤاری قەڵادزێ، ژ٣، زستانی ٢٠٠٦، ل٢٤-٢٥.

## بنەماڵەی وەستا خاڵان

یــاخـــوداو، یـاشـێـخـی ئـەشـکـەنـێ،
پـورە فاتێ بکەیە کۆلکی دارەبـەنـێ،
ئێستا وەستا خـاڵـەی شـۆڕان بگەنێ.

بەهاربوو، وەختێ ماڵەمەڕ بۆ کوێستانێ وەسەرکەوتنێ بوو. ماڵێ میرانیش لە داودێرا[1] مەڕو ماڵات و پێشبار و باریان هەموو پێکەوە بۆ کوێستانی سەرگوێنی[2] بەرەو ژوور کردەوە... فەرخە[3]، مێردمنداڵ بوو، لەگەڵ پوورەفاتێ گەورەکابان، ڕێك نەدەکەوتن، بۆیە فەرخە لە قەراغی ڕێیە کوێستانێ، چقڵە زەردکێکی هەڵگرتەوەو وە بن کلکی ئێسستریێ پوورە فاتێیداو، ئێسترەکەش دەستی بەجیفڕکو هەڵاویشتنێ کردو پوورە فاتێ ئێسترسواریش، خۆی پێڕانەگیراو سەرەوین لەسەر ئێسترەکەی کەوتە خوارێ و فەرخەش ئەم دوعایەی سەرەوەی لەپورە فاتێ کرد.

لەو سێ دێڕە شیعرە فۆلکلۆرییەدا کارمان بەوشەکانی (شۆڕان و وەستا خاڵە)یە.

وشەی شۆڕان کۆی وشەی (شۆڕ)ـە، (شۆڕ)یش بەمانای بەرەوخوار. لە بواری هونەر و هونەرەکانی وێژەدا، وشەی (شۆڕ) وەکو ئەستێرەی گەلاوێژی ئاسمانی ساماڵی پاییزان دیارو پرشنگدارە، ناسکە وەکو ئەو گۆنایەی کە مەولەوی تاوەگۆزی هێناوەتە جۆشو خرۆش و بەرابەری وەستاوەو لێی ڕوانیوەو گوتوویەتی:

هێندە نـازك بـوو، بـەبـای بـاوەشـێ
سـەرکـوڵـی ئـاڵی پـڕ ببوو لەخوێن

مەقامێکی ئەندێشەفڕین و هەستجوڵێن و خوێنکوڵێن، لە گەرووی هونەرمەندی مەزنی کورد، حەسەن زیرەکی بۆکانی پەخش دەبێت و دەڵێت:

بـەژنـشـۆڕو زولـفـشـۆڕو کـەزێ شـۆڕ،
سەرەو شۆڕم دەکەن هەرسێ بەرەو گۆڕ.

گوندی شۆڕان، گوندێکی دێرینە و دەکەوێتە بناری پشدەرێ و سەرووی خۆرهەڵاتی شاری قەڵادزێی مەڵبەندی پشت دەربەندی ڕەمکان.

سێ ڕێگە لە ماڵەکانی ئەو گوندەوە بـەرەو خـوارو بـەرەو ڕووی شاری قەڵادزێ

---

١- داودێ: داودیە، گوندی داودیە، گوندێکی چکۆلەیە، دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی شاری قەڵادزێ بە ٧ تا ٨ کم.

٢- سەرگوێن: کوێستانە لە چیای هەرمێنی باکووری شاری قەڵادزێ.

٣- فەرخە: کوڕی مامادینی داودێ و پاڵەوانی داستانی فەرخەو ئەستێ.

شۆڕدەبنەوە، زۆر لە گوینە ئەگەر ناوی گوندی شۆڕان لە شۆڕبونەوەی ئەو سێ ڕێگایەوە هاتبێ کە لەخوارەوە دەبنەوە یەك ڕێگا.

ناوی ئەو گوندەش هەر لەکۆنەوەو تاکو ئێستاش، بووەتە شۆرەتی دانیشتوانەکەی، کە بەهۆی زۆربوونیانەوە بەگەلێك شارو شوێناندا بڵاوبوونەوەو زۆر بوون و بە (شۆڕی) ناوبانگیان ڕۆیشتووە.

وەستا خاڵەش، تیرەیەکە لەو تیرانەی کە هەر لەکۆنەوە لە گوندی شۆڕان و گوندەکانی دیکەی دەوروبەری دەڤەرەکەو نێو شاری قەڵادزێدا نیشتەجێن.

وەستا خاڵەییەکان چەند بنەماڵەیەکی بەناوبانگ لەنێو دەڤەرەکەداو لە سەرجەم ئاڵوگۆڕەکاندا جێگای دەستی دەسترەنگینی کاریان دەدرەوشێتەوە.

وا مەزانن ئەگەر وشەی خاڵە دوای ئەو وەستا ئاسنکار بەنێوبانگە، خاڵی وەنەوشەیی سەر گۆنایەکی سێوە لاسورەی نازدارێکەو جارجارە لەگەڵ بسك و شابسکان گەمان دەکات! یان لەسەر پانتایی سەرسینەی سینەسافێك لەنێوانی دوو گومبەزی سەر بەگۆی سەرچاوەکانی ژینی بەردێکی ڕەشی پیرۆزەو لەوێ ئۆقرەی گرتووەو هەزاران کەس هەناسەی ماچکردنێکی بۆ هەڵدەکێشن! بەڵام «لم تکونوا بالغیة الا بشق الانفس[1]».

دیارە برای هاوسەرەکەی بابیشمان نییە! هەتا بەخاڵە خاڵە بانگی بکەین و بەدوای بکەوین و ئەویش جار جارە دەستێکی بخاتە گیرفانیەوەو دەستەکەی دیکەشی بەسەرماندا بهێنێ.

بەڵکو ئەم وشەی (خاڵە) لەبنەڕەتدا (خالید)ـەو، ناوی باپیرە گەورەی ئەو بنەماڵە بووەو کاری ئاسنگەری کردووە بەپیشەی خۆی و هۆی ژیانی خانەوادەکەی.

لەبەر ڕێزو خۆشەویستی نێو خزم و کەس و دۆستانی، هەر لەزووەوە پێیانگوتووە (خاڵە). کە دەستیشی بە کاری ئاسنگەری کردووە، وەستایەکی کارجوان و دەسترەنگین بووە، بووەتە (وەستا خاڵە)، لامەکەی (ل) بچووککراوەی (خالە)ش لەلامی لاوازەوە بووە بەلامی قەڵەو (ڵ)، وەستا خالید بووەتە وەستا خالەو لەویشەوە بووە بە وەستا خاڵە.

گەلێك کەسی ئەم بنەماڵەیە لە بابو باپیرانەوە فێری پیشەی ئاسنگەری بوون و شانازی پێوە دەکەن.

لەبەر لەمێژیان و بەردەوامی پیشەکەیانەوە، لەنێو خۆیان و خەڵکیشدا دەڵێن، ئەو بنەماڵە لە نەوەکانی کاوەی ئاسنکارن، بۆیە ئەوەندەیان پەیوەندی بەکاری ئاسنەوە هەیەو شانازی پێوە دەکەن و لێی ناتەکنەوە.

وەستا خاڵە، لەزوودا خەڵکی کوردستانی خۆرهەڵات بووە، لەگەڵ برایەکانی لە شارو گوندەکانی (خانێ، سەردەشت، ئاڵوەتان، میراوێ، پاراستان، کاولان،...) نیشتەجێ بوون

[1]- سوورەتی مێرووله، ئایەتی حەوتەم لەقورئانی پیرۆزدا.

و بەهۆی باری کۆمەڵایەتییەوە، یان هەر بوارێکی دیکە بووبێ، پەڕیونەتە کوردستانی باشوور.

زۆر وێدەچێ کە کۆچکردنی ئەو خانەوادەیە، لەکاتێکدا بووبێ کە دەڤەری شاری سەردەشت بە سەرجەم گوندەکانییەوە، لەبارەی بەڕێوەبردنەوە لەسەر کورستانی باشوور بووبێ، کە لەسەردەمی میرایەتی بابانەکان و دەسەڵاتی عوسمانیەکان، سەردەشت بەشێك بووبێ لە دەوڵەتی عوسمانی.

ئەو ماڵانەی وەستاخاڵانیش کە هاتوونەتە کوردستانی باشوور، لە دەڤەری پشدەرێدا بوون و لەوێشەوە بڵاوبوونەوە بۆ شارو شوێنەکانی دیکەی وەکو، (ڕانیە، سلێمانی، هەولێر، شەقڵاوە، باڵەکایەتی،...)

لە دەڤەری پشدەرێدا لەنێو شاری قەڵادزێ بەکاری میری و دووکانداریییەوە خەریکن و ئاسنکاری و دارتاشی پیشەی کەمێکانیانەو، هێندێکیشیان بە کاری دیکەوە ژیان دەبەنەسەر.

ئەوانەشیان گەر لە گوندەکانی (شۆڕان، دێگە، ئاڵاوە، گردمەیتەر، پێماڵك، گربداغ،...) دا، دەژین بەکاری ئاژەڵداری و کشتوکاڵیەوە خەریکن.

ئەو ماڵانەشیان گەر لە کوردستانی خۆرهەڵات ماونەوە، هەر لە جێگا کۆنەکانی باپیرانیان، کە نێو شاری سەردەشت و دەوروبەریەتی، ژیانیان دەگوزەرێنن.

لە وەستا بەناوبانگەکانی ئەم بنەماڵەش (وەستا بابەکر، وەستا ڕەسوڵ، وەستا سمایل، وەستا ئاڵڵا، وەستا ئیبراهیم، وەستا خدر، وەستا حەمەدەمین، وەستا عەوڵا،...) چەند وەستایەکی دیکەش.

هەتا ئێستاش چەند وەستایەکیان هەر بەپیشە کۆنەکەی ئاسنکاری دەژین و شانازیشی پێوە دەکەن. ئەوانەش وەکو (وەستا مرادو وەستا حوسێن) کە لەنێو شاری قەڵادزێ دەژین.

وەستا خاڵان، هەر لەکۆنەوە تاکو ئێستاش پیاوی هەڵکەوتووی زانست و ئاینیان هەبوون و خزمەتیان بە ئاینی ئیسلام کردووە. لەنێو ئەو جۆرە پیاوانەشیاندا وەکو (مەلا حەسەن، مەلا ئیبراهیم، وەستا خاڵە،...).

خەڵکی ئیسلامی هەردوو دیوی سەردەشت و پشدەرێ زۆریان باوەڕ بە پیاوە ئاینیەکانیان بووە. ئەوەتا لە گۆرانییەکی گۆرانیبێژەکانی سەردەمی ژیانی وەستا خاڵەدا! لەباتی سوێندخواردن بە قورئانی هەر مەلایەك! گۆرانیبێژێك سوێند بە قورئانەکەی وەستا خاڵە دەخوات.

بـەو قـورئـانـەی وەسـتـا خـاڵـە،
چـاو ڕەشـێـکـم دی لـەو مـاڵـە،
دەکـــوژێ پـــیری هـەشـتـا سـاڵـە.

ئەم بنەماڵە، لە هەردیوێکی ئەمدیوەو دیوی سەر سنووری هەردوو پارچەی کوردستاندا بوبن، لە بواری نەتەوایەتیدا لە ڕیزە دیارو ناودارەکان بوون. دەربارەی زانست و خوێندەواری سەردەمیش کەسانی ڕۆشەنبیرو خوێندەواریان زۆرن و لە فەرمانگەکانی میریدا خزمەتی بەرچاوی خەڵکی بەدڵسۆزی ئەنجامدەدەن[1].

---

١- گۆڤاری پشدەر، ژ٧، زستانی ٢٠٠٩، ل٤١-٤٣، ئەم زانیاریانە لە مامۆستا حەسەن عەبدوڵڵا بابەکر وەستا خاڵەی، سەرپەرشتیاری پەروەردەیی ڕانیە، وە کاک ئەحمەد بچکۆل، وەرگیراوە.

## بنەماڵەی (دەوەن)ان لە پشدەرێدا

لەمێژەوە گوتوان گوتویانە «هەردەوەنەو دەبێ بە دار!»

هەر درەختێکی گەورە لە بەندەنێ، یان لە هەرشوێنێکی دیکە بێ، بێگومان ئەو درەختە بەقۆناغێکی دەوەنایەتیدا تێپەڕیوە، جا ئایا ئەگەر ئەو درەختە بۆ پێویستیەك لە پێویستییەکان لە بنەوەڕا، لەسەر کۆلکیڕا بڕدرابێ و کارێکی پێ جێبەجێکرابێ! یان بەکارەساتێکی سروشتی وەکو ڕەنوەبەفر هەرەسهێنانێ، زەوی جمانێ و لافاو و ڕەشەبای بەهێزەوە ڕاقەنابێ! یان بەگڕی ئاگرێکی بەتین سوتابێ! ئەوە لەجێی ئەو درەختە لەنێوچووەی لەسەر کۆلك و ڕەگانەوە لەگەڵ سیاسووتی هەموو بەهاراندا چرۆی نوێ بۆمانەوەی ژیانی و کەڵك بەزیندەوەر گەیاندنێ و، بۆ نەگبەتیەکی دیکە ئەگەر بزن لێیان بگەڕێن، سەرهەڵدەدەنەوەو گەورە دەبن و دەبن بە کێزر، ئەو کۆمەڵە کێزرەش بەتەنیشت یەکدییەوە دەوەنـان پێکدەهێنن لە دەوەنانیشدا خاوەن قەدەغەکان بۆ پێویستی خۆیان لکە کیزرەکان دەبڕن و لکێکی بڵند دەهێڵنەوەو ساڵانە هەڵیدەپەردێون[1] بۆئەوەی ببنەوە بەدرەخت و دەوەن و وەجاغکوێر نەبن و چیا، جوانیە لەدەست نەدەن. ئەو لکەش دەهێڵدرێتەوە هەتا دەبێت بە داری ڕەسیو پێیدەگوترێت شێخەڵ. ئەم پەندەی پێشینانیش کە دەڵێ «هەر دەوەنەو دەبێ بەدار» پەندێکی چالاك و کارای نێو ئاخاوتنی زمانی کوردییەو لەجێی خۆیدا بۆ مەبەستی پێویستی زۆر بەکاردەهێنرێت و بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی گەلێك بەکەڵکە. پەندێکی پێشکەوتنخوازی هیوابەخشی کۆڵنەدان و سەرکەوتنەو لێوان لێو گەشبینیەو وەکو ئاوی سەر تەمتەمی هەتاو لێدراوی سبەینەی مانگی بانەمەڕێ قەد پاڵی چیای ئاسۆسی کارەساتان، پڕشنگان لە خۆرێ دەگرێتەوە.

چیای ئاسۆسی نێوانی هەردوو دەڤەری مەرگەو پشدەرێ، چیایەکە لە هەرە چیا پڕ دەوەنەکانی کوردستانێ، چونکە لە دێرزەمانەوە بە بەخشندەیی، داری پێویستی خەڵکی هەردووك دیوەکانی خۆی، دابین کردووە. زۆر جاران کارێك، ڕوداوێك، وتەیەك، هەڵەیەك،...، دەبێتە هۆی دروستبوونی شۆرەتی ئەم بنەماڵەی (دەوەن)ی پشدەرێ.

بنەماڵەی دەوەنان لە پشدەرێدا، بنەماڵەیەکی دێرینەنیشتەجێ و زۆر بەناوبانگ و دیاری سەرتاسەری دەڤەرەکەن. بەشی زۆری ئەم بنەماڵەی ئێستا لەنێو شاری قەڵادزێ و دەوروبەریدا گوزەران بەڕێوەدەبەن. دەوەنەکان لەزوودا لە گوندەکانی نێو داوێن و قەدپاڵی چیای ئاسۆسی و لەسەر (زێی کەڵوێ)و بەری مەرگەوە بەرووکاری بەرابەری پشدەرێوە لەم گوندانەدا، (سەرتەنگ، ئەلبانە، دۆڵەگۆم)، بەکاری کشتکاری و ئاژەڵداری و

---

[1]- هەڵیدەپەردێون (هەڵپەرداوتن): هەڵپاچینی لقی دارو درەخت بە مەبەستی نوێبوونەوە و پتەوبوون و گەشەکردنی درەختەکە.

بەرهەمی درەختی خۆڕسکەوە خەریکبوون و پەیوەندی کڕین و فرۆشتنیشیان وەکو هەموو گوندەکانی دیکەی دەوروبەر، لەگەڵ شاری قەڵادزێوە مەڵبەندی باشاری دەڤەرەکە بووە.

دەوەنەکان پیاوێکی (ئاڵی) ناویان هەبووە کە ئەو پیاوە باپیرەگەورەو ریشسپی و پیاوماقوڵی ئەم بەرەبابەی بووەو لەم پیاوەوە ناوی دەوەنان بۆ بەجێماوە. ئەو ئاڵیە، بەگەنجی بابی مردووەو هەر بۆخۆی و دایکی لەماڵێدا ماون و دایك و کوڕ پێکەوە ژیانیان بەسەربردووە، ئاڵی لەدوای مردنی بابی، ئیشو کاری ئاژەڵداری و کشتیاری وە ئەستۆی خۆی گرتووە. لە وەرزی جوتکردنێدا ئاڵی وەکو گەنجێکی ئازا ڕۆژانە گاجوتەکانی وەپێش خۆیداوەو چووەتە سەر زەویەکەی و چالاکانە کارەکانی تەواوکردووەو بەرەو ماڵ بۆ کن داکۆڵێ[1]خۆی گەڕاوەتەوە. ڕۆژێك لە ڕۆژانی وەختی بەهارەجووتێدا، ئەگەر کوڕو کیژی دەڤەرەکەی بۆ وەدەستهێنانێ بەرهەمی خۆڕسکی بەهارێ دەچن بۆ چیای و بەملاو لایاندا تاك و جووت جووت بڵاودەبنەوەو دەستدەکەن بە گۆرانیگوتن و بالۆرەلێدانان و کوڕێك دەڵێ:

کیژێ باسکەو باسك،[2]
لەمن بووی بە ئاسك،
قەدی ڕێواسی ناسك.

کچێك وەڵامی دەداتەوە:

ئەمبەرەو بەر چۆمە،[3]
کەوم لێبوونە کۆمە،
تێکرا دەمکەن لۆمە.

لەو گەلە کیژو کوڕانە چەند کیژێك ڕوودەکەنە دەورووبەری کێڵگەکەی ئاڵی جوتیارو لەوێ قسەی خۆش و جەفەنگیان لەنێوانێدا پەیدادەبن. لەنێوان ئەو قسەی خۆش و جەفەنگانەشدا نیگای ئاڵی و نیگای کیژۆڵێکی، تێکدەئاڵقێن. ئیدی لەوێ ڕۆژێ بەدواوە هەموو ڕۆژان ئەگەر ئەو کیژە دێتە چیای، خۆی لە دەستە خوشکەکانی جیادەکاتەوە بەرەو ئاڵی جوتیار وێهەڵدەگەڕێ، جا دوو بەدوو لەپاڵ دەوەنێکدا، بزر لە چاوی بەدکارو حەسودان، پێکەوە

---

١- داکۆڵێ: دایلە، دایی، کورتکراوەی دایکە بۆ خۆشەویستی.

٢- لە کەشکۆڵی (چووزە بیزا)دا، لەلاپەڕە (١٩٧)دا، ژمارەی بالۆرەی (٢٤)ی وەرگرتووە، لە ساڵی (١٩٨٢)دا، تۆمارکراوە، لە مامۆستا عومەر هێرۆیی وەرگیراوە.

٣- لە کەشکۆڵی (پێشبار)دا، لەلاپەڕە (٨٨)دا، ساڵی (١٩٨٤) تۆمارکراوە. لە برایمی حەمەی بێکلۆیی کۆلهەڵگر وەرگیراوە.

دادەنیشن و ڕازو نیازی خۆیان وەپێش یەکتری وەردەکەن و بڕیاری بۆ یەکدیبوونێ لەسەر دڵی خۆیان واژۆ دەکەن، لەو ڕۆژەش بەدواوە زۆر ڕۆژان ئەو بەیەکداگەیشتنە، دووبارە دەبێتەوە. لەو ڕۆژانەشدا ئەگەر کچەکە دێتە کن ئاڵی! ئاڵی درەنگتر لە ڕۆژان لە جووتکردنێ دەبێتەوەو لە جوتیارەکانی دیکەی گوندی درەنگتر دەچێتەوە ماڵێ! ئەو ڕۆژانەش ئەگەر ئاڵی درەنگ دەگاتەوە ماڵێ، داکی لێی دەپرسێ کە بۆچی هێندێك ڕۆژان درەنگتر لە هێندێکیان دێتەوە؟! ئاڵیش لە وەڵامی داکێیدا هەرجارەی بێنوێکی دەبینێتەوەو خۆی لە پرسیارەکەی وە دووردەخاتەوە! دایکی ئاڵی لە کوڕەکەی دەکەوێتە گومان، بەبێ ئەوەی ئاڵی بزانێ، ڕۆژێکی بەدوایدا دەڕوات و لەپاڵ بەردێکی کە ئاڵی لێ‌دیارنەبێت، خۆی دەشێرێتەوە. پاشی ماوەیەك چاوەڕوانی، داکی دەبینێ ئەوە کێژێك دێتە کن ئاڵی و لەپاڵ دەوەنێکیدا پێکەوە دادەنیشن و دەکەونە قسەو باسان و ئاڵی جووتکردنی لەبیردەچێتەوە، جا کاتێك ئەگەر قسەکانیان دێنە تەواوبوونێ، کچەکە هەڵدەستێ دەڕواو ئاڵیش بەپەلەپەل جووتەکەی تەواودەکات و بەرەو ماڵ دەبێتەوە. ئەگەر ئاڵی گەیشتەوە ماڵێ، داکی هیچ وەکو ئەو جارانەی کە درەنگ هاتبووەوە لێی ناپرسێ و بلێ ڕۆڵە، بۆچی واکەوتوویە درەنگێ؟! ئاڵی ئەگەر دەزانێ داکی لێی ناپرسێ ئەگەر درەنگ هاتۆتەوە! ئەو بەداکی دەڵێ: ئەرێ دایە بۆچی ئەوڕۆ وەکو ڕۆژان لێم ناپرسی و بلێی، ڕۆڵە، بۆچی ئەوڕۆ درەنگ هاتییەوە؟ داکی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: ڕۆڵەی خۆم هەرکەسێك دوێنێشان لەکاتی ئیشێکدا بکات! هەردەبێ بەدوابکەوێ و درەنگی بەسەر دادێ! ئاڵی دەڵێ: دایە پێم نالێی چبووە؟! داکی پێی دەڵێ: ڕۆڵە سبەینێ دەزانی و تێدەگەی! داکی ئاڵی کچەکەی دەناسێ و دەزانێ کچی کێیەو خەڵکی کام گوندەیە، بۆیە بۆ سبەینێ و چەند پیاوێکان لەگەڵ خۆیدا دەبات و دەچێ کچەکەی بۆ ئاڵی دەخوازێ و بەدوای ئاڵیشدا دەنێرێت و کچەکەی لێ‌مارە دەکەن و بۆی دەگوێزنەوە. لە ئەنجامی هاوسەریەتی ئەم ئەشقە دەوەنیەدا، نۆبەرەکەیان کوڕ دەبێت و داکی ئاڵیش ناوی دەنێ (ئەحمەد).

لەبەرئەوەش ئەگەر ئەحمەد زادەی ڕێکەوتنێ ئەشقی پاڵ دەوەنیە! جا هەر جارێك ئەحمەد لاسارییەك دەکات و بەقسەی دایك و باوك و نەنکی ناکات! ئەوە نەنکی لێی تووڕە دەبێت پێی دەڵێ: «ئەرێ ئەحمەد دەوەن! ئەتۆ بۆچی هێندە هاروهاجی و بە قسەی کەس ناکەی؟!» لەوکاتەیەوە لە ماڵێ خۆیان و لەنێو خزم و خەڵکی گوندی، ئەحمەد دەبێتە ئەحمەد دەوەن و لەوێشەوە شۆرەتی (دەوەن)یان تاکو ئێستاش بۆ ماوەتەوە.

ڕۆژگار دێت و تێدەپەڕن و ئەحمەد گەورە دەبێت و ژن و ماڵی پێکەوەدەنێ و چەند کوڕو کچێکی لێدەکەوێتەوە، کوڕەکان ئەو کەسانە بوون: (حەمە، ساڵح، ڕەسوڵ، عەزیز، حاجی، پیرۆت...،) ئەو کەس و کەسایەتیانەش هەموویان شۆرەتی دەوەنیان لێ پیرۆزکراوەو

بڵاوبووەتەوە. ئەو بەرەبابەی پشدەرێ، بەرەبابێکی گەلێك بڵاون، مرۆڤی زاناو ناوداریان گەلێك زۆرن و لەبوارەکانی کوردایەتی و ڕۆشنبیریدا خاوەنی کەسانی دیارو بەناوبانگ و بەشێکن لەجوانی سەراسەری دەڤەری پشدەرێ، هیوادارین هەمیشە هەر لە ڕیزەکانی پێشەوەی پێشکەوتندا بەرزو دیار بدرەوشێنەوەو هەرکەسێکیان وەکو ئەحمەدی هەوەڵێ، چەندین دەوەن و داری گەورە گەورەی بەردارو بەسێبەریان وڵاتی پشدەریان ئاوەدان و ئاوەدانتر... بکەنەوە[1].

١- گۆڤاری پشدەر، ژ٨، بەهاری ٢٠٠٩، ل٤٣-٤٤، سەرچاوە: لە کەشکۆڵی (جوانستان)دا، لە لاپەڕەکانی (١٤٠-١٤١)دا، لە ساڵی (٢٠٠٤)دا، تۆمارکراوەو لە خوێندکاری ئەو ساڵەی پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی ڕانیە، بەشی کوردی کاك (عومەر دەوەن) وەرگیراوە.

## سەید توانا

نەکو هەر کەم نین ئەو کەس و کەسایەتیانەی ئەگەر لەپێناوی چاکەکردندا گیان و ژیانی خۆیانیان لەکن هەرزانەو دەیانخەنە نێو گۆنگەڵی مەترسیانەوە، بەڵکو ئەو کەسانە زۆرن و گەلێکیش زۆرن و بەیاسای بەرەو پێشەوەچوونیش بێگومان هەر زۆرو زۆرترو ژیرو ژیرتریش دەبن.

بۆ ڕاستی ئەم بۆچوونەش بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گەواهە بۆ دەربارەی کەمبوونەوەی شەڕو ئاژاوەی گەورەو بچووك لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە بەکارهێنانی مێشك و گوێ و زمان و چاو، بۆ لەیەکدی گەیشتن لەبری جۆرەها چەکی کوشەندەی جۆراو جۆری گەورەو بچوك، کە لەڕۆژی دروستبوون و بەکارهێنانیانەوە هەتاکو ئێستاش، چەك نەیتوانیوە گەورەترین تاکو بچوکترین کێشە وەکو پێویست و ڕەواو ڕاست و دروست و ماف، جێبەجێ بکات و بەئەنجام بگەیەنێ.

بەدرێژایی مێژوو هەرچی کێشەیەك ئەگەر چەك چارەسەری کردبێ ئەوە چارەسەرێکی لاوازو کاتی بووەو پاراستنی بەرژەوەندی لایەنێکی بەدەسەڵاتی زاڵکردووە بەسەر لایەنەکی دیکەی بێ دەسەڵاتداو چارەسەرەکەش پووشبەسەرانە ئەنجام دراوە.

بەڵام هەرکاتێك زەمینەیەکی لەبار بۆ لایەنە زۆرلێکراوەکە ڕەخسابێ، کێشەکە سەری وەسوێ ناوەتەوەو هەڵتۆقیوەتەوەو چەند کێشەیەکی ئاڵۆزتری لە کێشە کۆنەکە، لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە گۆڕێ.

لەنێو شاری قەڵادزێ و لە سەرجەمی دەڤەری پشدەرێداو لە هەر سەردەمێکیشدا، بێگومان چەند کەسانێك هەبوون کە خۆیان بە بەرپرسیار زانیوە دەربارەی سەقامگیری ئاشتی و تەبایی و پێکەوەژیانی برایەتی و بێوەیی و خۆشەویستی، ئەو کەس و کەسایەتیانەش کەسانی خۆبەخشی دەریەستی چاکە بوون و، لە ڕێگەی گفتوگۆوە هەمیشە بەسەر کێشەکاندا سەرکەوتوو بوون و جێ پەنجەشیان درەوشاوەیەو نەیانهێشتووە کار بکەوێتە دەستی چەك، بەدەگمەن نەبێت.

سەید توانای سەرباسی ئەم باسەمان، بەهەق پیاوێك بوو لەو کەسایەتییە بەتوانایانەی لەم بوارەداو لە سەردەمی ژیانی خۆیدا، بۆ ڕوونەدان و چارەسەری هەرکێشەیەك، بەبێ گوێدانە ڕۆژو شەو و ماندووبوون، گورجو گوڵ و بەڕاپەڕو بێدەربەست و بۆ کاری چاکەکردن و ڕووداوە ناخۆشەکان.

توانا، پیاوێکی باڵابەرزی بەخۆوەی موزەردی سوورو سپی چاوشینی شیکپۆشی پاکو خاوێن بوو، گەلێك جاران ئەگەر پانتۆڵ و کراسە قۆڵ کورتەکەی لەبەردەکردو کاسکێتەکەی

دەكردە سێبەری چاوانی و كامێرایەكی بەشانیدا بەردەدایەوە، ئەگەر نەتناسیبایە، تەڵاقی هەموو جیرانەكانت دەخواردو دەتگوت ئەم برادەرە ئەورووپاییە ! ئەگەر جلە كوردیەكانیشی لەبەردەكرد، وەكو ئەوەی دەچوو كە سەرجەمی ژیانی بە پێشمەرگایەتی بەسەربردبێ ! یان لە بناری قەندیلیەوە بۆ ماین ناڵكردنێ هاتووەتە قەڵادزێ. ئارامی و كەمدوێیی و بەئەسپایی گوتاری و بەڕێزی و بەئەدەبی، وەكو ئەوەی دەچوو ئەو ڕەوشتانە هەموویان پارچەیەك بن لە پارچەكانی جەستەی و هەمیشە لێی جودا نەدەبوونەوە، تەنانەت لە ڕۆیشتنەكەشیدا پیرۆزی خاكی لەبەرچاو دەگرت، دەتگوت ئەحمەد هەردی شاعیر بەگوێیدا چپاندووەو پێی گوتووە، یا توانا، گوایە تۆ:

«نـایـزانـی كـە هــەر پـەنجـەیـێ لــەم خـاكـی زەمینە،
كـوڵـی هــەزار لەیل و دەمــی سـەد مــەم و زیــنــە![1]»

یان وەكو دەروێشی ڕێبازی (غەیاسەدین ئەبولفەتحی عومەری كوڕی ئیبراهیم – خەیامی نەیشاپووری) بووبێ، كە لە لێكدانەوەی ئەم چوارینەدا بەپلەی بەرزایەتی خەیام، میدالی شانازی بە بەرۆكیدا كردبێ:

«بــەر لەمن و تـۆ شـەو و ڕۆژێ بـوو،
چـەرخـی جـەفـاكـار ئـەهـات و ئـەچـوو،
بـۆ ســەر ئــەم خـاكـە پــێ بـە ئەسپایی
دانــێ، چــاوەكـەم، چــاوی یــارێ بــوو[2]»

ئەو لەوێنەگرتندا ئەوەندە جوانپەرست بوو كە هەمیشە بەدوای دیمەنی جواندا دەگەڕاو، لە ئەشق و خۆشەویستی دیمەنی سروشتی كوردستانەوە، گۆشی جوانپەرەستی ببوو، هەر لەبەرئەوەش بوو ئەگەر تواناو جوانییەكانی بەجۆرێك ئاوێتەی یەكدی ببون، كە وەكو بیری تیژو باریكی حەریقی شاعیرو قەدی خۆشەویستەكەی، لە یەكدی جوداكردنەوەیان كارێكی ئەستەم و بەدەر لەتوانا بوو.

«فیكری من چونكە ڕەفیعە مائیلی قــەددی ئەوە
مــوو لە مــوو گــیراوە چ بكەم بـۆی جـوێ نابێتەوە[3]»

توانا، كوردیزانێكی زارگورتنی پشدەرێ بوو، لەدواندنێدا هەوڵیدەدا كە ئەوەندەی بۆی بكرێ وشەی ناكوردی بەكارنەهێنێ و گەلێكجاران لە كۆبوونەوەدا لەگەڵ خەڵكی لادێییەكاندا هەمیشە وشەی كەمبیستراوی دەنوسیەوەو لەدواتریشدا لە كاروباری ڕۆژانەدا بەكاریدەهێنایەوە.

---

١– دیوانی ڕازی تەنیایی، ئەحمەد هەردی.
٢– دیوانی خەیام، گۆڕینی شێخ سەلامی عازەبانی.
٣– دیوانی مەلا ساڵحی زێوەیی شاعیر (حەریق).

ناوی تەواوی توانا، (موحەممەد عەبدوڵڵا وەسیم)ـە لە ساڵی (١٩٤٨)دا لە شاری قەڵادزێ چاوەشینەکانی بەدیمەنی قەشەنگی پشدەرێ هەڵهێناوەو هەر لەوێش ژیانی بەسەربردووە. لەساڵی (١٩٨٠)دا پەیوەندی بەرێکخستنەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کردووە، لە ڕاگواستنی قەڵادزێشدا لە ساڵی (١٩٨٨)[1]، لە ئۆردوگای زۆرەملێی خەباتی نزیکی هەولێرێ، دەگیرسێتەوە.

لە ڕاپەڕینی بەهاری (١٩٩١)دا، توانا لە ئۆردوگای ناوبراو ڕۆڵی بەرچاوی هەبووەو لەدوای ڕاپەڕینیش گەڕاوەتەوە بۆ قەڵادزێ و لەوێش کوردویستانە وەکو ئەندامی کۆمیتەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، پەرەی بە خەباتی خۆیداوەو دڵسۆزانە ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بەئەنجام گەیاندووە.

توانا، لە ساڵی (١٩٧٩)دا لە شەقڵاوە لەگەڵ (قاعیدە خانی کیژی کاك عومەر سلێمان)دا بەنیگا گۆڕینەوەیەك و چرپەیەك ژیانی هاوسەرێتیان پێکهێناوە، لە ڕۆژی (١٩٩٢/٦/٢٢)دا، لە شەڕێکی بێزراوی چاوچنۆکاندا لەسەر بەشکردنی پارەی گومرگ لەنێوانی چەکدارەکانی حیزبەکاندا، توانا بێئاگا گوللەیەکی وێڵی لەلایەن شەڕەنگێزانەوە پێدەکەوێ و گیانی لەدەستدەداو، لە گۆڕستانی قەڵادزێ، لەلایەن ئاپۆرەیەکی دۆست و برادەرانی و خەڵکی پشدەرێوە، دەخرێتە نێو باوەشی گەرم و ئاسوودەو سۆزداری دایەگەورەی.

ئیدی! هەر ڕەوشتبەرزێك دەبینم تۆم دێتە بەرچاوان، بەرێزەوەو ژوورکەوتنی بەیانیانت و بەئەدەبەوە قسەکردنت، ئەم شیعرەی سالمی ساحێبقڕانی دێنامەوە بیر:

«بەحەیا بێرە حزوورو بەئەدەب سوجدە بەرە،
خەڵوەتی دڵبەرە سالم ئێرە مەیخانە نییە![2]»

---

١ – ئەو ڕاگواستنە، کە ڕاگواستنی هەموو خەڵکی شار و گوندەکانی پشدەرێ بوو، لە حوزەیرانی ١٩٨٩ ئەنجامدرا. یەکێك بوو لە پیلانە شۆڤینیەکانی ڕژێمی بەعس و، بەسەر ئۆردوگاکانی سنووری پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێردا دابەش و نیشتەجێی کردن. (ئامادەکاران)

٢– گۆڤاری پشدەر، ژ٩، هاوینی ٢٠٠٩، ل٤٣–٤٤.

# قەڵادزێ... وەکو وشە

«حاجیب گەر بکوژرێ نـاڕۆم، بە زولفی تۆ قەسەم
لـەم (دەر)ـــە پێی خـەیـاڵم ئەڵبەتە زنجـیری هەیە.»

وشەی (دەر) بەمانای دیوی دەرەوەی نێوەوەی هەرشتێك دێت. لەم دێڕە شیعرەی سالمی ساحێب قڕانیشدا، دەردەکەوێت کە بەردەرگای ماڵێك دێت، کەسەکان لە ژورێ بن. دیارە لەو شیعرەدا سالم لەبەردەرگای ماڵێ خۆشەویستەکەی چاو لە دەرگا بۆ نیگایەك وەکو داوەڵ ڕاوستاوەو بەجێهێشتنی بۆ ناکرێت و ناڕوا، سوێندی خواردووە بە زوولفی یاری خۆشەویستی لەژووریێ دانیشتووی بێخەم و بێباك، ئەگەر پاسەوان و دەرکەوانی ئەم ماڵە، چ بە شیری ئاسن، چ بە شیرو تیری برژانگ بیکوژن، ناڕواو بیرو هۆشی خۆی، بەرجەستە بە مرۆڤ کردووی بەتاڵی درێژی زولفی ئەو خانم خاتوونەی ژووریێ بەستراوەتەوە، کە ئەو تاڵە زولفەش، لە بارێکیدا زنجیری ئاسنینی پێوەندە. هەروەکو کورد دەڵێن «کەڵ بەموێ بەندە!»

من هەرجارێك ئەگەر بەدەربەندی (ڕەمکان)دا، ڕابوورم، کە دەربەند، جوداکەرەوەی پشدەرو بیتوێنانە، ئەم شیعرەی سەرەوەم دێتە نێو ئەندێشەوە.

وشەی دەربەند، کە پەیوەندی بەباسەکەمانەوە هەیە، وشەیەکی لێکدراوی (دەر+بەند) ـە، کە وشەی دەربەندی پێکهێناوەو هاوکێشەکەش دەبێتە (پشت+ت+دەر+بەند)، قەڵادزێش هەر لە دێرەوە مەڵبەندی باشاری ئەم دەڤەرەی کوردپەروەرە شۆڕشگێڕە بووەو تاکو ئێستاش بە تێپەڕاندنی هەموو سەردەمەکان، پارێزگاری لەخۆی کردووە.
زۆرکەس گەلێك جاران، لەسەر پێکهاتەی وشەی ناوی قەڵادزێ قسە کراون و، لاپەڕەی سپی کاغەزانیش ڕەشکراونەتەوە، هەندێ کەس بۆچوونیان وایە کە وشەی قەڵادزێ لە وشەی (قەڵا+زێ)، یان قەڵاتێك لەنێوان دوو زێ دا، من ئەو بۆچوونە بەڕاست نازانم، چونکە ئەو ئاوانەی کە بە خۆرهەڵات و خۆرئاوای قەڵاتەکەدا دێنەخوارێ، هیچیان زێ نین، بەڵکو دوو چۆمی نیوە وەرزین و، زستان و بەهاران ئاودارو بەخوڕەخوڕن، بەڵام لە هاویناندا زۆر کەمئاون و هەر ئەوەندە هەیە چۆڕ بڕنین.

ئەو دوو چۆمانەش، لە باشووری قەڵای قەڵادزێ دەبنە یەك ئاو و دەڕژێنە زێی بچووکەوەو لەوێشەوە بۆ گۆماوی دوکان.

لە ساڵێك لە ساڵەکانی هەشتاکان، لە قەڵادزێ چەند کەسێك کە سەر بە ڕاگەیاندنی گۆڤاری ئەلفبای عەرەبی و تەلەفزیۆنی کەرکوك بوون، هاتنە قوتابخانەکەمان و منیان بۆ دەستنیشان کردبوون کە وشەی قەڵادزێیان بۆ ڕوونبکەمەوە. ئەو کاتەش من لە پۆلی

وانەگوتنەوەدابووم، کە ئەوان هاتن و دەستیان بە قسان کرد، کابرایەکی عەرەبی ڕەشی کەتەی ددان زەردیان لەگەڵدابوو، ئەو بە عەرەبی گوتی، وشەی قەڵادزێ مانایەکەی (قلعه حرامیه) بەمانای قەڵای دزو و چەتانە. من ئەگەر گوێم لەو قسە دزێوەی وەکو عەرەبەکە ناحەز، بوو، زۆر دڵگران بووم و هیچ وەڵامێکم نەدانەوە. هەرچەندە پرسیاریان کرد گوتم هیچی لێنازانم. ئەوانیش کە زانیان لە قسەی عەرەبەکە نیگەران بووم ملی خۆیان شکاند و ڕۆیشتن، هەروەکو ڕۆیشتن.

دروست وشەی قەڵادزێ، نە (قەڵاتی نێوان دوو زێیان)ـە، نە (قەڵای دزان – قلعه حرامیه)ی عەرەبانە. دیارە هەر لەکۆنەوە عەرەب ئەم ڕەوشتەیان هەبووەو بۆیان بووە بە خووی میراتی و ناتوانن وازی لێبهێنن، جوانی نەیارەکانیان دزێو دەکەن، دزێوی خۆیان و دۆستەکانیشیان جوان و جوانتر دەکەن، بۆ نموونە لەسەرەتای پەیدابوونی ئیسلام لە مەککە (عەمری کوڕی هاشم) کە شۆرەتی (ئەبولحیکەم) بوو، چونکە دژە ئیسلام بوو، شۆرەتی (ئەبو جەهل)یان بەسەردا سەپاند، کە ناوی خۆی و شۆرەتەکەی پێشووی، ئاوی ئاموون بردنی و توونی بابا قوتیدان و بێ سەروشوێن چوون! شاری مەدینە کە ئێستا ڕووگەیەکی پیرۆزی ئیسلامیانە، لەپێش کۆچی ئیسلامان، ناوی (یەسریب) بوو، بە (س) ی سێ خاڵ (پ) (یثرب) ئەم وشەش بەزمانی عەرەبی، بەمانای جێگایەکی زۆر پیس دێت. کە کۆچ و کۆچباری ئیسلامەکان لە شاری مەککەوە گەیشتنە شاری یەسریب، ناوەکەیان گۆڕی بۆ شاری ڕووناککراوە (المدینه المنوره). جا هەر کابرای عەرەب ناوی قەڵادزێی وەکو خۆی دزێو لێکدایەوە (ئەبو جەهل) و (شاری ڕوونککراوە)م بە بیرداهاتو، بۆ نموونەش لێرەدا بەکارهێنانی جێگای خۆیەتی بۆ ئاگایی خوێنەران.

بێگومان قەڵادزێ بەمجۆرەی ئێستا ئاوەدان نەبووە، بەڵکو چەندماڵێکی کەم بوون و بەتەنیشتی خۆرهەڵاتی قەڵایەکەوە بەناوی (دژ)ـەوە ناونراون و لەدوایشدا قەڵای لێزیادکراوە. دیارو لەبەرچاوە، کە وشەی (قەڵا) وشەی (قلعه)ی عەرەبییەو خۆی سەپاندووە. بەڕاستی ناڕاستە ئەگەر بڵێین ئەو هەموو قەڵایانەی کوردستان، پێش داگیرکردنی وڵاتەکە لەلایەن عەرەبانەوە، بێ ناو بوون، ئەوە بۆ چوونێکی زۆر نادروست و نابابەتانەیە.

لە کوردستاندا قەڵایەکان پێش ئەوەی داگیربکرێن بەگوێرەی لێکدانەوەو بەڵگەی دروست ناویان (دژ)بووە، بەمانای دژی دوژمنانی هێرشبەر، لە چیاکانی ئەلبرز، لە سەرووی ڕۆژئاوای دەریای قەزوین قەڵایەك هەبوو پێش داگیرکردنی لەلایەن عەرەبانەوە ناوی (دژە مەرگ) بووە، بەمانای هەرچی لەو قەڵایەدابێ ئەوەندە پارێزراوە، بە کوشتەمەرگ دەروەستی نابات، کە عەرەب ئەو قەڵایەیان داگیرکرد، ناوەکەیان گۆڕی و بەعەرەبی ناویان نا (قلعه الموت – قەلعەت ئەلمەوت) قەڵای مردن، بەڵام ئەو قەڵایە هەتا ئێستاش ناوە کوردیەکەی

لەگەڵ (ئەلمەوت)ی عەرەبیدا بەشێوای خۆی پاراستووەو پێیدەگوترێ (دژە لمەوت).

شاری سنە لە خۆرهەڵاتی کوردستان، پێیدەگوترێ (سەنەندج) ئەم ناوە لە بنەچەدا پێکهاتووە لە وشەی (سەنان) کە جۆرێکە لە ئاسن لەگەڵ ناوی (دج)، کە ئەو دوو پیتەش وشەی (دژ)ـەو بە یەکگرتنی هەردووکیان، دەبێتە (سەناندژ) بەمانای قەڵای ئاسنینەوە لەوێشەوە بووە بە سنەندش و بە هەورامیش (سەنەندج).

لە دەڤەری موکریان لە مەحاڵی (جغەتوو)، قەڵایەکی بەناوبانگی هەیە بەناوی (شاهێن دژ)، لە نزیکی (ماینبلاغ – کانی ماین) کە ئێستاش بەسەربەرزی ماوەتەوە. میر موحەمەدی ڕەواندژی لە ڕۆژئاوای شاری ڕەواندژ، لەسەر تەپەیەك و دوو قەڵای دروستکردن و ئەم شیعرە فارسییەی لە دەروازەکەیان نووسی:

«دوو کـۆنـگـر ڕانــهــادم پــردو پێگر
ڕوانـــدژ، شـد ڕویـــن دژ بــای دیگر»

ئەو قەڵایانە هەتا ئێستاش شوێنەواریان دیارو بەرچاو ماون و کەمێکیشیان ڕەسەنایەتی پێوەماوە.

لەم چەند نمونەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە قەلعەی عەرەبی بووە بەقەڵات، (دژ) ی کوردی داگیرکردووە. پێکهاتەی ناوی قەڵادزێش بەمجۆرەیە (دژی دژان)، (قەڵای قەڵاتان)، لێرەدا قەڵاتی یەکەم ناوە کوردیەکەی خۆی وەرنەگرتۆتەوە، بەڵام قەڵاتی دووەم بووەتەوە بە (دژ)و پیتی (ژ)ـەکەش بەهۆی کاروباری فەرمییەوە، کە پیتی (ژ)یە، لەنێو پیتە عەرەبییەکاندا نییە، ئەم پیتە بووە بە پیتی (ز) و، وشەکەش بەهۆی ئەو ئاڵوگۆڕە، بووە بە (قەڵادز) یان (قەڵادزێ).

لەسەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیددا، عوسمانییەکان بەڕێوەبردنیان لە (مەرگە)وە گواستەوە بۆ قەڵادزێ و ناوی قەڵادزێیان گۆڕی بۆ (حەمیدییە)و ماوەیەکیش قەڵادزێ بەو ناوە بێگانەوە ناسراوە.

من پێموایە ئەم بۆچوونە دەربارەی ناوی ئەو شارە، ڕاستترین بۆچوونەو پێشم باشە لەمبارەوە ڕادەربڕین هەبن و لێکۆڵینەوە بنوسرێت.

هەر لەسەر ناوی قەڵادزێ، بۆچوونێکی ڕاسترم لەبۆچوونی (قەڵای دزان) هەیە، لێرەدا وشەی (گرد)مان هەیە، کە بەهۆی بوونی وشەی (قەڵا)وە لە خودی خۆی بچووکتر دەبینرێت دیارە ئەوەش ڕاست نییەو مەسەلەکە بێگانەویستییە لە خۆویستی، بەوشەشەوە، ئەویش وەکو (کوردی) مستەفا بەگی شاعیر دەڵێ:

«ئەتۆ شۆخ و عــەرەبـزادە، ئەمن کــوردو دڵ ئەفتادە
بە مەرگی خۆم مەگەر بمرم، دەمێکی هاوزمانت بم»

بێگومان هەرکەسێك لەم دێڕە شیعرە ورد ببێتەوە، ئەوەندەی خۆ بەبێ نرخی تێدایە کە دەگاتە خاڵی ژێر سفرو هەموو هیچ و پوچییەکی خەڵکی بێگانە لە هەبوو وە پیرو پتەوی خۆی چاکتر دەبیندرێن!

بۆیە، جێگای سەرسوڕمان نییە ئەگەر (گرد)ی کوردانیش لە قەلعەی عەرەبان گچکەتر بن.

هەتا ئێستاش لە زۆر شوێنان، گردان ناوی خۆیان پاراستووەو گردی گەورەش وەکو گردی (بنگرد) کە گوندە کۆنەکە بەناوی ئەو گردەوە ناونراوە، یان گردەکانی (باسنوسیان وە شمشارەی تایێ[1]) کە لە دەشتی بیتوێنێ بەبڵندی و بەرزی ناوی خۆیان پاراستووە. لەم بۆچوونەشەوە دەتوانین بڵێین ناوی قەڵادزێ لە زووترداو پێش عەرەب داگیرکردنی، ناوی (گردە دژ) بوویێ و، وشەی قەڵاکە وشەی گردی داپۆشیبێ، بۆیە من پێموایە: ئەوە نە قەڵای دووزێیانەو، نە، هی دزان، گردەدژەو دژی دژانە[2].

---

١ - تایێ: لە دەقی ئەسڵی نووسینەکەدا وابوو، نەمانزانی مەبەست لە چییە، بۆیە وەك خۆی نووسیمانەوە. (ئامادەکاران)

٢- گۆڤاری پشدەر، ژ١١، پاییزی ٢٠٠٩، ل١٣-١٤.

# بنەماڵەی نیگاران لە پشدەرێدا

هەر نەتەوەیەك لە سەرجەمی نەتەوەكانی سەر ڕووی گۆی زەوی، تایبەتمەندە بە كۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆی، كە جودایە لە تایبەتمەندی هەرنەتەوەیەكی دیكە. ناوی مرۆڤ و سەرجەمی گیاندارو بێگانەكانیش تایبەتمەندی دیارو بەرچاویان هەیە لەنێو ئەو تایبەتمەندیانەدا.

كوردان لەپێش داگیركردنیان لەلایەن عەرەبە ئیسلامیەكانەوە بۆ مرۆڤ و هەموو بوونەوەرەكان، ناوی تایبەتی و ڕەسەنی خۆیان هەبووە.

لێرەوە ئەگەر ناوی مرۆڤان بێنینە بەرباس و لێكۆڵینەوان، لەدوای داگیركردنی كوردستان، ناوە عەرەبییە ئیسلامیەكان بەسەرناوە كوردییەكاندا زاڵ بوون و دایانپۆشین و، عائیشەو فاتمە، ئەحمەدو مەحموود، ناوەكانی خونچەو گوڵێ و، ئازاد و نەوزاد،...، یان وەبن خۆدان و بزریانكردن!

لێرەدا باسەكەمان لەسەر وشەی (نیگار)ـەو نیگاریش ناوی ڕەگەزی مێیینەی مرۆڤی كوردە. لەو هێرشی ناوە عەرەبییە داگیركەرانەدا بۆسەر ناوە كوردییەكان، هەروەكو چۆن سەربازەكانیان كوردستانیان وێرانكرد، ناوەكانیشیان بەدەوروكاری خۆیان بەرابەر ناوە كوردییەكان، هاوتەریب بوون. بەڵام زۆر ناوی كوردی بەرابەر ئەو داگیركردنە توانیویانە بوونی خۆیان لە داگیركردنی ڕزگاربكەن و بپارێزن و خۆیان بەبەرزی و پیرۆزی بهێڵنەوەو نەبەزی و مانەوەش بكەن بەدروشمی نەتەوایەتی و وەكو چۆن ئەگەر مانگ لەئاسماندا خۆی نواند، هەموو ڕووناكیدەرەكانی دیكە، بزر دەبن، بەمجۆرە دەدرەوشێنەوە، نالی گوتەنی:

«ئەستێرە هەموو مەحوە لەنێو نووری قەمەردا،
یا شەمسی جەماڵت شەوی گێڕاوە بەفەردا؟[1]»

هەر كەسێكی كوردویستی، مرۆڤویست، بەچاوی دروست بڕوانێتە ناوەكانی (پیرۆز، ئەستی، خانم، خاتوون،...)ان، بێگومان دەستی جوانپەرستی لەئەستۆی خۆی ڕادەكێشێ و دەڵێ: ئەم ناوانە، ئەو (نووری قەمەر)ـەن، كە لەنێو ئەم شیعرەی نالیدا مانگی پڕی نێو ئەستێران.

نیگاریش ناوێكە لەو ناوە پیرۆزانەی كە خۆی نەداوە بەدەستەوەو، كۆیلەیی ڕەتكردووەتەوە. نیگار، لەڕووی وشەوە بەماناكانی: (ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگین، دیمەنی ڕازاوەی هەمەڕەنگ)دێت. بەڕاستیش ئەم ناوە قەشەنگە كوردییە، هەر لەم ڕەگەزە مێینە

١- دیوانی نالی، چاپی دووەم، لاپەڕە ٧٩، پەخشی ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی، ساڵی ئێرانی (١٣٦٤) ورمێ.

زولفشۆڕو بەژنشۆڕە جوانە، جوانەو، کالاو بالا لەیەکدی وەشاونەوە.

بێگومان هەر لەبەر ئەم جوانییەیە کە شاعیران و جوانپەرستان بەدوای ماناکانی ئەم ناوەدا گەڕاون و لە شیعرەکانیشیاندا بە هەردوو جۆرە ماناکانی دروست و خوازەییەوە، کردوویانە بە کەرەستەی ڕازاندنەوەی جوانی! ئەوەتا نالی شاعیر زۆر بەووردی و قوڵی لەم ناوە دەدوێ و دەفەرموێ:

«ڕەنــگــی نییە ڕوخــســارەیــی ڕەنــگــین و لەتیفی
ڕۆشــن بــووە ئــەم نوکتە سەباتی لــە (بــەســەر)دا[1]»

خوالێخۆشبو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی، ئەم شیعرەیان بەمجۆرەی خوارێ شرۆڤە کردووە.

«واتە: ڕوومەتی جوان و ڕەنگینی، لەبەر زۆر ناسکیی و شەفافیی، ڕەنگی نییەو چاو نایبینێ و ئەم شتەش لای کەسانی بیناو وریا سەلمێنراوەو جێگیربووە، چونکە چاو ناتوانێ شتی بێڕەنگ ببینێ.»

لە لێکدانەوەی ئەم تاکە شیعرەدا، دەکرێ بپرسین و بڵێین: وە چۆنیش ئەم بێڕەنگییە لەنێوچاواندا بەڕۆشنی جێگیرە؟!

من بەباشی دەزانم کەمێك پتر لەسەر لێکدانەوەی ئەم زانا بەڕێزانە بڕۆم و بڵێم، بێگومان لەنێو هەناوی ئەم گەردوونە پڕ سەیرو سەمەرەو جەنجاڵەدا زۆرشتی شاراوە هەبووەو هەیە کە زانستی ڕۆژگار، ئێستا زۆریانی ئاشکرا کردووەو ئاشکراش دەکات و درێژەش بەکاری خۆی دەدات و ونەکان، بەدیار دەخات.

لەسەر باسی ئەم شیعرەی نالی، کە قیچەك پەیوەندی بەباسەکەمانەوە هەیە، ئەوە هەمووMان دەزانین ئەگەر تیشکی خۆر لە ڕۆژانی هەتاودا باش دەبینرێت و ڕەنگی زەردە کە لەڕاستیشدا ڕەنگینەو بەڵگەش سەلماندوویەتی، بڕوانە پەلکەزێڕینەی تیشکی خۆر لێدراوی دوای باران، کە سەرجەم ڕەنگەکانی دەردەکەون، دیارە لە هەرکاتێکی کە هەتاو بوونی هەبێت، بەهۆی ئاوپرژێنەوە دەتواندرێت تیشکی یەکڕەنگ بۆ ڕەنگە پێکهاتەکانی شیتاڵ بکرێت و ببیندرێن، یان بەهۆی ئامێری ئاوێزەوە دروستیان بکەین.

خەڵکی کورد زۆرجاران ئەگەر لەسەر کارێك سوور دەبن و پێدادەگرن و سوێندێك دەخۆن و دەڵێن: «قەسەم بەیەکڕەنگییە خودای» لەم سوێندەوە بۆمان دەردەکەوێ کە خودا هەمەڕەنگەو بەم یەکدیگرتنەی ڕەنگەکان، بۆتە یەکڕەنگ، کە ئەویش (وەحدانییەتە) و بەژیری و لێکدانەوە هەستی پێدەکرێت و بەچاو نابیندرێ، دیارە ئەم سوێندەش زۆر کۆنە، سوێندێکی زەردەشتیانە بەو خودا بەیەکڕەنگی پەرستنە، مەحویش دەفەرموێ:

---

[1]- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٠١.

«وەرە دەستی بەخوونم نیگارین
خوێنی من حەڵاڵت بێ نیگارا![1]»

لەم شیعرەدا مەلا مەحوی لەئەندێشەی خۆیدا خودای بەهەموو ئەندام و ئاکارانەوە بەرجەستەی مرۆڤێکی ڕەنگین کردووەو لەبەردەستی ڕاوەستاوەو بەنزاوە لێی دەپاڕێتەوەو داوای لێدەکات ئەگەر بەتیغێك بیکوژێ، بۆئەوەی هەر ئەگەر نەبێت بەلانی کەمەوە دڵۆپێك لە خوێنەکەی وەبەر دەستێکی ئەو مەزنی مەزنانە بکەوێت و تێکەڵی ڕەنگەکانی دیکە بێت و تێیاندا بتوێتەوەو ببێتە یەکڕەنگ و کورد سوێندی پێ بخۆن و بڵێن «قەسەم بەیەکڕەنگیە خودای!»

دیارە وشەی نیگار هەر لەدێرینەوە ناوێکی نێو ناوگەلی ناوە کوردییەکان بووەو لەپشدەریشدا نەنکە نیگاری خوالێخۆشبوو، بە نەمرییەوە دەدرەوشێتەوەو بەرەبابێکیش بەشانازییەوە بەناوی نەنکە نیگاریانەوە ژیان بەڕێدەکەن.

باپیرەگەورەی ئەو بەرەبابەش، ناوی (خدر) بووەو ژنەکەشی ناوی نیگار بووە، بەرهەمی تەمەنی ژن و مێردایەتی ئەو ژنو مێردەش، شەش کوڕبووە بەناوەکانی (عەبدوڵڵا، ساڵح، بابەکر، سلێمان، ڕەسو، ئەحمەد). مام خدریش لەپێش نەنکە نیگارێ بە نەخۆشیەکانی دەردەپیری کۆچ و کۆچباری خۆی دەباتە شاری خامۆش و بێ قسەو قسەلۆکان و، لەوێ نیشتەجێ دەبێ و، منداڵان بە نیگاری هاوسەری دەسپێرێ.

لە کوردەواریدا نەریت وایە ئەگەر بابمردوو منداڵی بەسەر دایکیاندا بەجێهێشتن، لە زۆر جێگایان ئەو منداڵانە بەناوی دایکیانەوە ناودەبرێن. کوڕەکانی مام خدریش وەبەر ئەم نەریتە کەوتوون و نازناوی (عەوڵا نیگار، ساڵح نیگار، بابەکر نیگار،...)یان وەرگرتووەو لەوانیشەوە بۆ نەوەو بەرەو خوارتر درێژەی پێدراوەو بوونەتە تایەفەی نیگاران.

لە بنەچەدا باپیرەگەورەی نیگاران، خەڵکی باکوری کوردستان بووە، لەوێ لەگەڵ دەسەڵاتدارێکی تورك کێشەیەکی بۆ دروست دەبێ، جا بۆ دەربازبوون لەو کێشەیە، باکوری کوردستان بەجێ دەهێڵێت و ڕوودەکاتە باشوری کوردستان و لە دەڤەری پشدەرێ لە گوندی (کۆنە گەناو) لە ڕۆژهەڵاتی شاری قەڵادزێدا، نیشتەجێ دەبێت، بەڵام لەدوای چەند ساڵێکان ژیان لەو گوندەدا، لەبەر کێشەیەکی عەشایەری، بەخۆی و نەوەکانییەوە ئەو گوندە بەجێدەهێڵن و بەرەو خۆرهەڵاتی کوردستان کۆچ دەکەن و لە دەڤەری موکریان لە دەوروبەری مەهاباد، لە گوندەکانی: (گرێزە، ئیندرقاش، قونقەڵا) نیشتەجێ دەبن و دەست دەکەن بە کاروکاسبی ئەو سەردەمەی ئێرانێ.

لەدوای چەند ساڵێك ژیان بەسەربردن لەدەڤەری موکریان، کێشەی گوندی گەناویشیان بۆ چارەسەر دەکرێت. مام خدر بێجگە لە کوڕێکی کە لەوێ دەمێنێتەوە، بەخۆی و هەموو

١- دیوانی مەحوی، چاپی دووەم، لاپەڕە (٩)، چاپخانەی ئۆفسێتی حوسام، بەغدا، ١٩٨٤.

خێزانەکانیانەوە دەگەڕێتەوە بۆ گوندی کۆنە گەناوێ.

ئەو کوڕەش کە لە دەڤەری موکریان دەمێنێتەوە، لە ئەنجامی تێپەڕبوونی سالآن، وەکو یاسایەکی سروشتی پەرەدەگرن و بەرەبابێکیان لێپەیدا دەبێ کە بە (بەرەبابی قادراغا)ی بەناوبانگەو لەنێو شاری مهاباتیش شۆرەتیان (ئەمینی)یە. وێدەچێ شۆرەتەکانی ئێرانێ، ناوبانگی نیگاریان داپۆشیبێ!

لە باشوری کوردستانیشدا بەرەبابی نیگاران بەزۆری لە پشدەرو بیتوێندا ژیان بەسەردەبەن، بەڵام لە هەندێك شوێنی دیکەشدا وەکو هەولێرو سلێمانی و دەوروبەریان، بوونیان هەیەو بەرەبابێکیشیان لە گوندی (گولێ) لە شارباژێری بەناوی بەرەبابی (مەلا هەمزە)ی ژیان دەگوزەرێنن.

سەرجەمی بنەماڵەی نیگاران لە پازدە بەرەبابان پێکهاتووە:

١- بەرەبابی فەقێ هۆمەری: لە پیاوە دیارەکانی ئەو بەرەبابەش (حەسەنی ساڵحی، ساڵحی حەسەنی، فەقێ هۆمەر، مامە چاوشین).

٢- بەرەبابی حەسەنە زەردی: پیاوی ناسراوی ئەو بەرەبابەش (حاجی ئەحمەدی نورەدینی کە بەحاجی ئەحمەدی نیگارانیش ناسراوە، فەقێ ڕەسو، ئاڵڵای حەسەنی، ساڵحی مام ئاڵڵای، مەلای فەقێ ڕەسوی).

٣- بەرەبابی حەسەن کوێخای: لە پیاوە ناسراوەکانی ئەو بەرەبابەش (حەسەن کوێخا، کوێخا مستەفا، قادری حەسەنی، حەسەنی کوێخا مستەفای، بابەکری مام خدری).

٤- بەرەبابی دەروێش قادری: لە پیاوە دیارو ناسراوەکانیان (دەروێش قادر، ساڵحی دەروێش قادری، ڕەسوی دەروێش قادری، فەقێ قادر).

٥- بەرەبابی حەمە نیگاری گەورە: لە پیاوە ناودارەکانی ئەو بەرەبابەش (حەمە نیگار، دەروێش قادر).

٦- بەرەبابی مینەخڕەی: بێگومان ئەو بەرەبابەش لە پیاوی بەکەڵك و ناودار بێبەش نەبوون، هیوادارم سەرچاوەی ئەم باسەم بەدواداچوونیان لەبەر چاوبگرێ و ئاگادارم بکاتەوە.

٧- بەرەبابی خەرتەلان: ئەو ناوانەش پیاوە ناسراوەکانی ئەم بەرەبابەن (سمایل خەرتەل، بابەکر خەرتەل).

ئەو بەرەبابەش بۆیە پێیاندەگوترێ خەرتەل، پیاوێك لەو بنەماڵەیەدا ناوی (ڕەسو) بووە، جارێك ئەو پیاوە لەگەڵ کۆمەڵێك لە خزمەکانی لە بیتوێنێ دەبن و دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ پشدەرێ، بەڵام لە دەربەندی (ڕەمکان) لەنێوانێ بیتوێن و پشدەرێ، لەگەڵ چەند کەسێکان هەرایەکیان بۆ دروستدەبێت، ئەوانیش ڕەسوی دەگێڕنەوە بۆ بیتوێنێ

بۆ کن خزمێکیان کە ناوی (کوێخا ڕەسوی شیلانە) دەبێت بۆئەوەی بەهانایانەوە بچێت و کاتێکیش ڕەسوی فرستادە[1] دەگاتە ماڵێ کوێخا ڕەسوی شیلانە، زۆری سەرمادەبێ و لەبەرئاگری لێی دادەنیشێ و خۆی لـێبڵاودەکاتەوەو هیچ دەنگان ناکات، بەڵام پاشی ماوەیەك کوێخا لە ڕەسوی دەپرسێ و دەڵێ: «ڕەسو بۆچی بەو سەرمایە هاتووی؟!»

ڕەسوش دەڵێ: «لەگەڵ خزمان لە دەربەندی ڕەمکان هەرایەکمان لێقەوماوەو هاتووم ئەگەر بەهانامانەوە بێی.» کوێخا ڕەسوش پێیدەڵێ: «ئەدی بۆچی چەند دەمێکە بەبێ خەمی لێی دانیشتووی و هیچ دەنگان ناکەی و دەڵێی خەرتەل (داڵە کەرخۆرە)ی تێری، خۆت شلکردووەو باڵی خۆت لێبڵاوکردوون؟!» لەو ڕۆژەوە ئەو بەرەبابە، بە بەرەبابی (خەرتەلان) دەناسرێن.

٨- بەرەبابی ڕیحانان: ئەو بەرەبابەش بە بەرەبابێ ڕیحانان بەناوبانگن چونکە پوور ڕیحان ژنێکی ناودار بووەو نەنکی ئەو بەرەبابەی بووە.

٩- بەرەبابی خاڵە باسی بێخرێ (هەباسە کۆڵ): لە پیاوە بەناوبانگ و ناسراوەکانیان (خاڵە باس، فەقێ عەلی).

١٠- بەرەبابی جنداران: ئەو بەرەبابە دەچنە سەر بەرەبابێ قادراغای ئیندرقاشێ، بۆیەش پێیاندەگوترێ جندار، بەمنداڵی کوڕێکیان هەبووە ناوی حەمە بووە، حەمە تاقانەو زۆر خۆشەویست بووەو هەرچی داوایەکی هەبوویێ، بۆیان جێبەجێ کردووە، ئەگەر داواکەشی بۆ جێبەجێ نەکرابێ! حەمە چۆتە سەربانێکی بڵندو گوتوویەتی ئەگەر بۆم جێبەجێ نەکەن خۆم فڕێدەدەمە خوارێ. دەروجیرانیش گوتوویانە: ئەوە ئەو کوڕە بۆچی وا دەکات؟! دەڵێی جندارە! لەو ڕۆژەوە نێوبانگی حەمە جنداری بەسەردابڕاوەو ئێستاش بەشی زۆری ئەو بەرەبابە لە گوندی گردەسپیانی پشدەرێ دەژین و ژیان بەسەر دەبەن.

١١- بەرەبابی خودە شینکە: ناوی ئەو بەرەبابە لەوەوە هاتووە: باوکەگەورەی ئەو بەرەبابە ناوی مەحموود بووە لە کوردەواریدا بچوککراوەی ناوی مەحموود خولەیە، ئەو خولەیە چاکەت و پانتۆڵی خەوتنەکەی لە خم گرتووە بەڕەنگی شین، لەوەوە پێیانگووتووە خولە شینکە یان خودە شینکە. لە پیاوە ناودارەکانیان: دەروێش عەلی، مەحموودە خودە، پیرۆتی دەروێش عەلی.

١٢- بەرەبابی مەلا ئەحمەدی دۆڵەگۆمی: پیاوی دیاری ئەو بەرەبابە: (حاجی سمایل، حاجی حەمە سەلیم، موحەمەد چاوشین).

١٣- بەرەبابی مەلا هەمزە: دانیشتووی گوندی (گوڵێ)ی ماوەتی شاربازێڕن و پیاوی ناوداریان: (عەلیە سوورە، مەلا هەمزە) بووە.

١٤- بەرەبابی قادراغای: لە موکریان نیشتەجێیەو لەنێو شاری مهابادێ شۆرەتیان

١ - فرستادە: نێردراو، ڕەوانەکراو، کە هەمان مانای وشەی (ڕەسوو - رسول) دەبەخشێت.

(ئەمینی)یە، پیاوە ناودارەکانیان (ئەمیری ئەمینی، ڕەشیداغا، کاکە ڕەزا، حەمەداغای (سەرا)یە، کە لە زەمانی ڕەزا شایدا ئەندامی پەرلەمانی ئێرانێ بووە).

لەساڵی (١٩٤٢)دا، کە لەشکری پشدەرێ چوو بۆ یاریدەی شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان بۆ گرتنی شاری سلێمانی، پێش ئەوەی لەشکر بگاتە شێخ، لە گوندەکانی باڵخ و گاپێڵۆنێ شەڕێك لەگەڵ کوێخا ڕەسوڵ و کوێخا مەجیدی گوندی (وەران)ێ هەڵدەگریسێنن و لەو شەڕەدا، ئەو نیگارانە کوژراون (حەسەنی ساڵحی گردەسپیان، قادری ئەسمەرێ، حەمە جندار، ئەحمەدی سۆفی هەمزەی بێکڵۆیێ).

ئەو شەڕەش هۆیەك بوو لەنێوان هۆیەکانی پەشیمانبوونەوە لە گرتنی سلێمانی.

١٥- بەرەبابی هۆمەری گەوەرێ: باوکەگەورەی ئەو بەرەبابە ناوی هۆمەرەو، هۆمەر بەناوی دایکیەوە بانگکراوە، لەوەوە ئەو بەرەبابە ناودەبرێن بە بەرەبابی هۆمەری گەوەرێ. لە پیاوە ناودارەکانیان: (هۆمەری گەوەرێ، مستەفای گەوەرێ، حەمەی هۆمەری گەوەرێ) لەکۆتاییدا، سەدان دروود بۆ ئەنکە نیگاری خاوەن پێتەك و سامانی مرۆیی و ناوی پیرۆزی. پێشکەوتووییش بۆ پێتەکە بەڕێزەکانی ئەو ئەنکە ناو دیمەنە بەهاریە[1].

١- گۆڤاری پشدەر، ژ١٢، پاییزی ٢٠٠٩، ل٤٨-٥٠، سەرچاوەی زانیاری بابەتەکە لە: (ڕێبوار خدر قادری مافناس، مستەفای عەوڵای مام هۆمەری گەرمکان) وەرگیراوە، بەکەمێك دەستکاری و زیادوکەمی (زیاد)ـەوە.

## تیرەی خواران لە پشدەرێ

لەبارەی دروست و خوازراویشەوە (خوار) بە چەند مانایەك دێتەبەر، دێتە نێو گوێیان، وەکو: یەکەم: لار: بەمانای تێکچوونی تەرازووکردنی هەرشتێك کە بە لایەکدا کەمێك یان زۆرێك چەمانەوەو خواربونەوەی هەبێت و لە ڕاستیەکەیدا مانەند لەنگێنەی کردبێت، وەکو شاعیرێك دەڵێت:

«فـەڕەنـگ ڕوو، زەنـگ موو
عـەجـەم سیـاق و ڕووسـی خوو
دەنـاسـرێ کـە کـوردە زوو
بـەپـێـچـی لارو خـوارەوە»

دووەم: خـوارێ، یان خـواروو: ئەمجۆرە خوارەیان بەمانای لای بـەرەوە، یان لای ژێری دێت بەپێچەوانەی لای سەرەوە. وەکو «ماڵی مەلای، لەلای خوار ماڵێ بابمەوەیە.» ئەمجۆرە خوارە، لەباتی وشەیەك لەکۆمەڵە وشەکانی (بەر)یش دەگرێتەوە، وەکو ئەم شیعرە فۆلکلۆرییە:

«مـاڵـیـان لـەبـەر مـاڵـێ مەیە
کـوڵـەجـەی بـەری بـەتـاقـەیـە
بـەدڵ حـەزم لـە ڕەحمـەیـە.»
– فۆلکلۆر –

سێیەم: خوار: بەمانا خوازەییەکەی لەبری (فێڵ و ساختەچییەتی و...) بەکاردەهێنرێت، دوور لە ڕووتان وەکو دەڵێت: «فڵانەکەس، کەسێکی خوارە، دۆستایەتیکردنی باش نییە.»

چـوارەم: زۆرجـاران وشەی خوار، وشەیەکی دیکە لەگەڵ خۆی کێش دەکات، ئەم وشەیەش وشەی (خێس)ـە، کە بەمانای کەمێك بادراو دێت وەکو: «ئەم دارە دارێکی خوارو خێسە» کە دارەکە بێجگە لە لارییەکەی بەلایەکدا، ئەوە لە خودی خۆشیدا قەدەکەی کەمێك یان پتر لەکەمێك، بادراوی تێدا هەیە، زۆر جارانیش بەهەڵە لەباتی وشەی خێس، (خێچ) بەکاردەهێنرێ و دەگوترێ (خوارو خێچ).

لە بناری پشدەرێ لەباکوری شاری قەڵادزێ، لە خوارووی چیای (چواس) تاجی سەری دەشتێ، گوندێك هەیە بەناوی گوندی (خواران) ناوی ئەو گوندەو بنەماڵەکانی (تیرەی خواران) هیچ پەیوەندییەکیان پێکترەوە نییە و ناوی ئەو بنەماڵانە ناگەڕێتەوە بۆ خەڵك. (دەشتێو) گوندێکە دەکەوێتە خوارووی خۆرهەڵاتی چیای (کوڕیس)ی بەرزترین لوتکەی چیای ئاسۆس بەدارودەوەنی گەلێك کارەسات دیتە.

ناوی ئەو بنەماڵە لەوەوە هاتووە کاتێك کە چەند خێزانێك بوون و لەگوندی (دەشتێو) ی باسکراودا نیشتەجێ بوون، خێزانێکیان دوو کوڕی مێردمنداڵیان هەبوون، ئەو دوو کوڕە هەردووکیان برابوون، جیاوازی تەمەنیان ساڵێك بووە، برا گەورەکەیان ناوی (ئاڵی) بووەو ئەوەی دیکەشیان (حەمە) بووە. ئەو دوو کوڕە هەردووکیان باڵابەرزو ناوقەد شووش و باریك بوون، وەکو هەموو خوارەکانی بەرووپشت ئەتڵەسی ئێستا، چونکە هەموو ئەو کەسانەی کە (خوار)ی ڕەسەن بن و تێکەڵ تیرەو تایەفەی دیکە نەبووبن، باڵا بڵندو نێوقەد باریکن.

ئاڵی و حەمە، بەمنداڵی بابیان دەمرێ و بەهەتیوی داکیان پەروەردەیان دەکات و گەورەدەبن. ئاڵی، لەباریکیان و بڵندیان کەمێك خواربووە.

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئێوارە درەنگ دەبێت و ئاڵی ناگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و دایکی بەدوایدا دەچێت و ئاڵی دەبینێتەوە کە لەگەڵ کۆمەڵێك برادەر، خەریکی گەمە کردنێیەو ئاگای لە هێنانەوەی گۆلك و کارو بەرخی نەماوە. لەوکاتەیدا دایکی بەتوڕەییەوە بانگی دەکات و پێی دەڵێ: «ئەرێ هۆ ئاڵیەخوار، ئەوە شەو داهات بۆ ناچی ئەو ماڵاتەی بهێنییەوە بۆ ماڵا؟»، لەو ئێوارەیەوە برادەرەکانی لە بانگکردنەوەی دایکییەوە ناوی ئاڵیەخوار، لە ئاڵیە خواریشەوە ئەو شۆرەتە بەنێو سەرجەم تاکەکانی هەردوو ڕەگەزی نێرومێی هەموو خێزانەکانیان وەردەبێ و، هەموویان دەبنە خانەوادەو بەرەبابی خواران. ئەو بنەماڵەی خواران، بێجگە لە ئاڵیەخوارو حەمەخواری جووتە برا، گەلێکیان پیاوی ئازاو ئاقڵمەندو زانا هەبوون و هەمیشە ڕێزو ناوبانگیان درەوشاوە بووە، وەکو:

**یەکەم:** (حەسەنەخوارو خدرەخوار): کە هەردووکیان براو پیاوی کارامەو کارکردەو کار لەدەستهاتووی سەردەمی خۆیان بوون، وەکو دەگێڕنەوە دەڵێن: ساڵێکی لە ساڵاندا بەزستانێ، کۆمەڵێك پیاو لە پشدەرێوە بۆ شاری سەردەشتێ چوون، لە ڕێگایە لە کوێستانان، ڕۆژ دەگۆڕێ و لێیان دەبێتە کرێوەو بەفرو بایەکی کوشندە، خدرەخوار بەشارەزاییە خۆی، ڕێگایەکە بزرناکات ئەشکەوتێك پێدەزانێ و بەرەو ئەشکەوتەکە دەبێتە پێشەنگ و ڕێشکێن، لە دەوروبەری ئەشکەوتێ، ورچێك لەو کۆمەڵە خەڵکە برسی و ماندووەی دەرپەڕیو لێیان دەبێتە جێی مەترسی و ڕێگایان لێدەگرێت، لەنێو ئەو ڕێبوارانەشدا تەنیا خدرەخوار خەنجەرو داردەستێکی پێدەبێت. خدر بەخەنجەرەکەی سەری داردەستەکەی دەقەڵیشێ و دەیکاتە دووپەل و لەگەڵ ورچەکەی هەمبازی یەکدی دەبن. لەکاتێکدا کە ورچەکە زار دادەپچڕێ، خدر سەری دووپەلی داردەستەکەی دەهاوێتە زاری ورچەکەیەوەو سەرەکەی دیکەشی بەزگی خۆیەوە دەنێو خۆی لێ‌توند دەکات و بەدەستی چەپەی دارەکەی ڕادەگرێت و بەدەستی ڕاستەشی دەست دەکات بەخەنجەر لێدانی ورچەکەی و پاشی هێنانو بردنێکی زۆر، خدر بەسەر ورچەکەیدا سەردەکەوێت و دەیکوژێت، جا ورچەکە

بەکوژراوی، خدریش بەماندوویی و برینداری هەردووکیان لەوێ دەکەون. کاتێك برادەرەکانی خدر لە شوێن پێی خدریدا دێن و دەگەنە جێی ڕووداوەکەی، خدری هەڵدەستێننەوە دەچنە ئەشکەوتەکەیەو هەتا سبەینێ ڕۆژ دەبێتەوەو ئاگری کەمە چڵ و چیلی نێو ئەشکەوتەکەی خۆیان لەچەنگی مردنێ ڕزگار دەکەن.

**دووەم**: برایمەخوار و حەمەخوار: ئەو دوو پیاوە هەردووکیان پیاوی ماقوڵ و ڕیشسپی و پیاوی کۆمەڵایەتی پشدەرێ بوون و هەمیشە جێگای پرس پێکردن و چارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی خەڵکی دەڤەرەکەبوون و لەڕیزی پێشەوەی ڕێزداران بوون.

**سێیەم**: عەزیزەخوار و پیرۆتەخوار: ئەو دوو خوارانەش هەر لە پیاوماقوڵان و ڕیشسپی و ڕێزدارانی نێو پشدەر و پشدەریان بوون و نمایندەی میراودەلی و پشدەریان بوون بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی سەر سنووری ئەمدیوەو دیوان لەنێوان کوێستانەکاندا.

ئەو بەرەبابە، خدرەخوارێکیان هەبووە، کە بە حاجی خدرەخوار ناسراوە، ئەو پیاوە خاوەنی ڕاوبۆچوونی چاکو دروست بووە و لەبەر ئەم زیرەکیەشی (بابەکراغای سەلیم ئاغا) ی، قەت لەخۆی دوور نەخستۆتەوەو هەمیشە جێگای پرس پێکردنی بووە.

دیتوو و بیستوو دەگێڕنەوە دەڵێن: ساڵێکی لەسەر موڵکی کوێستانەکانی سەرتخوبی ئێرانێ، ناخۆشییەك لەنێوان ئاغایانی میراودەلی پشدەرێ و ئاغایانی مەنگوڕایەتیی دیوی ئێرانێ، دروست دەبێت و کار دەگاتە شەڕو لەشکرکێشیە. پشدەرێ بەسەرکردایەتی بابەکری سەلیماغای و مەنگوڕیش بەڕابەرایەتییە (سەلیمی ئاغای بایزی).

لەوکاتەدا ئەگەر لەشکر بەرەو ڕووی یەکدی دەبنەوە، حاجی خدرخوار، بە بابەکراغای دەڵێ: «ئاغا! مەڵێ خدر دەترسێ، ئەمن پێم باشە لەگەڵ سەلیماغای دانیشتنێکی بکەین!» بابەکراغاش بەقسەی خدری دەکات و دانیشتنەکە لە شاری سەردەشتێ پێکدەهێنرێ.

کات زستان دەبێت، لە دانیشتنەکەیدا، بابەکراغا دەیەوێ سەبیلەی دابگیرسێنێ و بە چاوی، ئامازە بۆ خدری دەکات کە ئاگری بۆ بهێنێت. خدر تەماشا دەکات هیچ مەقاش دیارنییە هەتا ئاگری پێ لە سۆبە دەربهێنێ، بۆیە هەر دەستوبرد بە پەنجەکانی، پشکۆ ئاگرێکی لە سۆبەی دەردەهێنێ و زۆر بەهێواشی دەیخاتە سەر سەبیلەی بابەکراغای و دەگەڕێتەوەو لە جێی خۆی دادەنیشێتەوە.

سەلیمی ئاغای بایزی ئەگەر ئەو کارەی لە خدرەخواری دەبینێ، ڕوو لە بابەکراغای دەکات و پێیدەڵێ: «بابەکراغا هەرچەندەو هەر شوێنێکتان موڵك دەوێت با بۆ وە[1] بێ و شەڕێکتان لەگەڵ ناکەم، چونکە شتێکی واتان نیشاندام و تێتانگەیاندم ئەگەر من ناتانوێرمێ و بەخۆڕاییش نە کوڕی خەڵکی بەکوشت دەدەم و نە کوڕی کەسیش دەکوژم. خدرەخوار بەو

---

١- وە: ئێوە، ئەنگۆ، جێناوی سەربەخۆی کەسی دووەمی کۆ، لە بنزار و ئاخاوتنی پشدەر و موکریان و هێندێك مەڵبەندی دیکە، ئەو جێناوە زۆر بەکاردەهێنرێت. (ئامادەکاران)

ئازایەتییەی خۆی، ئەو شەڕە خوێناوی و دوژمنکارییەی کوژاندەوە. ئەو کارو زیرەکییەی خدرەخواریش بەسەرتاپای هەردوو دەڤەرەکانی ئەمدیوەو دیواندا بڵاوبووەوە.

بابەکراغا لە پاداشتی ئەو ئازایەتیەی و زیرەکییەی خدرەخواری، گوندی (خێوەتە)ی نزیکی سلێمانی پێبەخشی و کۆمەڵێك ماڵی تیرەی خواران لە پشدەرێوە کۆچیان بۆ ئەو گوندە کردو ئێستاش چەند ماڵێکیان لەوێ نیشتەجێن. تیرەی خواران وەکو هەموو خەڵکی دیکە، پەرەیانگرتووە و زۆربوون و بەزۆر لایاندا بڵاوبونەوە لە ڕەوتی کوردایەتی و زانست و زانیاریشدا لە ڕیزەکانی پێشەوە دیار و درەوشاوەن[1].

١- گۆڤاری پشدەر، ژ١٣، زستانی ٢٠٠٩، ل٥٢-٥٣.

## ماملێ، لە ڕوانگەی پاراستنی ڕەسەنایەتی وشەو ئاوازاندا

وشەی فۆلکلۆر، وشەیەکە بەمانای زانستەکانی خەڵکی پێشینە دێت و سامانی گرنگی نەتەوایەتیی، ئەو زانستانەش بەگوێرەی زانستەکانی سەردەم بەرجەستە بوون، بێگومان ئەو بەرجەستەییەش زۆر لایەنی جۆراوجۆری گرتۆتەوە لەپەندی پێشینان، لە کەلوپەلی کارکردەوان، لە دروستکردنی پێویستیەکانی نێو ماڵ و گەلێك بابەتی دیکە. بەشێکیش لەو بەشە سامانە نەتەوەییانە، لایەنی هونەرە، وە لە هونەریشدا ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ لێی بدوێم گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانە کە ئەویش سامانێکی گرنگی ئاوازە ڕەسەنەکانە کە ئەویش بەهەموو جۆرەکانییەوە دەربڕینی هەستی بیری باب و باپیرانە کە لە وشەو ئاوازدا خۆی دەنوێنێ.

لەو ڕۆژەوە کە هەست لەنێو مێشکی مرۆڤدا پەیدابووە و زمانی گۆی کردووە و گوێی لەدەنگی خۆی بووە، جوانی دیمەنەکانی سروشت، یان هەر جوانییەکی دیکە، هەژاندوویەتی و هەستی خۆی بۆ دەربڕیوە.

مرۆڤی دێرینی بێ کارەبا و ڕادیۆ تەلەفزیۆن ژیاو، هەر کە شەوی تاریکی لێبووەتە ڕۆژی ڕووناك و چاوی بەدڵۆپە ئاونگی سەر پەلکی گوڵ و گوڵاڵەی سبەینێ مانگەکانی خاکە لێوە و بانەمەڕان کەوتووە، کە وەکو بێچووەخۆران کەوتوونەتە پرشنگ بۆ یەکدی هاوشیتنێ، یان کە هەواری خامۆشی گوێیان بەدەنگی ورشە لکەدارگوێزی سەرداری داران و (چناری میری ڕووباران) ئاوەدان بووەتەوە، بێگومان بەبێ ئاگا لەخۆبوون، هەستی خۆی بەچەند وشە و لێرە لێرێك دەربڕیوە و ئەندێشەکانی خۆی پێ ئاسودە کردوون و کەوتوونەتە ئاواز چڕاندنانی و خەم و خۆشیەکانی نێو دڵی خۆی بڕ و بەوێدا تێکەڵی نێو جۆرەها ئاوازی گیاندار و باڵداری نێو سروشت کردووە.

زۆر وێچووە و لەگوینە، وشەی (لێریك) کە هەڵبەستەکانی گۆرانی دەگرێتەوە، لە وشەی لێرەواری کوردییەوە سەرچاوەی گرتبێت. لەم بۆچوونەشەوە بۆمان دەردەکەوێ کە گۆرانییە فۆلکلۆرییە کوردییەکان، بە وشە و ئاوازەوە، هەڵقوڵاوی دەروونی لێوانلێوی مرۆڤە ئاشقەکانن، جا ئەو عەشقە هەر جۆرە عەشقێك بووبێ و بۆ هەر ماشوقێك گوترابێت لە عەشقی مرۆڤ بۆ مرۆڤ، یان لەعەشقی مرۆڤ بۆ دیمەنە جوانەکانی سروشی قەشەنگی دەوروبەرەکەی، هەستبزوێن و وەدەنگهێنن! یان و یان و کۆمەڵێك یانی دیکەش.

هەر لەبەرئەوەشە کە ئەوجۆرە گۆرانییە فۆلکلۆرییە گەلییە بێ خاوەنە تایبەتیانە، بەڕەسەنایەتی خۆیان و بەبێ نووسرانەوەی سەر پەڕە کاغەزان و نێو کتێبان و تۆمارنەکراوی سەر کاسێتی نەواران، خۆیان لە نەمانی پاراستووە و دەماودەم و بێ پسانەوە هەر هاتوون

و سەردەمیان کۆنتر و بەجێهێشتووتر کردوون و بۆ خۆشیان هەمیشە بەدرەوشاوەیی ماونەوەو هەر خۆشتر و خۆشتریش دەگووترێنەوە.

لێرەدا زۆری بە هەل و پێویست دەزانم بۆئەوەی بولبولی ئاوازەخوێنی نێو باخی میکایل[1] و کەناری دەریاچەی شاری مەهابادی مەزنی مەزنان و داوێنی پردی سوور[2] لەم ڕووەوە باشتر بناسرێ، چەند هەڵەیەکی گەورەی نابەجێی هێندێك لە گۆرانیبێژە تازەکانی شیعر و فۆلکۆر و ئاوازە ڕەسەن تێکدەرەکان، بخەمە بەردیدەی دیتوان و گوێبیستی بیستووان.

ڕۆژێکی گۆرانییەکم لە گۆرانیبێژێك بیست، کە لە ڕادیۆکەوە ئەم شیعرە فۆلکلۆرییە نازدارە، تەڕو ناسك و پاراوەی بەئاواز دەچڕی، کە دەقی شیعرەکەش بەمجۆرەیە:

«لـەبـاغــی ســـاوا، پــاوانــی سینە
پـەنجـەم سـەرگـەرمـی لیمۆ گوشینە»

ئەم شیعرە، بێجگە لە جوانییە لەڕاددەبەدەرەکەی، پڕە لە دانە گەوهەرەکانی ڕەوانبێژی، کە ئێمە لێرەدا ناچینە نێو قوڵایی ئەم دەریا پانو بەرین و بێ بنەوە، بەڵام پێویستە کەمۆکێك وە نێو قەرۆغان[3] بکەوین. دیارە مەبەست لە باغی ساوا، کچۆڵێکی تازەپێگەیشتووی تەمەن پازدە بیست ساڵەیە بەتێکڕای ئاکارە جوانەکانییەوە. خاوەنی ئەم شیعرەش، هەرکەسە نێرینە عاشقێك بووبێت! ئەو لەو باخە ڕازاوەدا چووەتە نێو بەشێکەوە و تایبەتمەندی کردووە بەخۆیەوە. دیارە کە ئەو بەشەش سەر سینەی ئەو کچۆڵە نازدارەیە و کردوویەتی بە پاوانی خۆی، کە (پاوان)یش بەمانای، قۆرغ، قەدەغە، تایبەت دێت.

جا با بزانین گۆرانیبێژ چی بەسەر ئەم شیعرە هێناوەو چۆنی دەڵێ! کە دەفەرمووێ:
«لە باغی ساوا، پاوانەی شینە»

بێگومان کە گۆرانیبێژ ئەوەندە کوردینەزانە، نەیزانیوە (پـاوان) چییە! بۆیە بێدەربەستانە کردوویەتی بە (پاوانە)ـە، پاوانەش وەکو بازنە وایە، بەڵام ژنان لەپێی دەکەن، گەلێك جارانیش لەپێی منداڵی تازەپێگرتوودا دەبینرێن، لەوەش بەولاوەتر، سەر سینەی جووتەکانی ژنیشی گۆڕیوە بە (شینە)، شینەش بێجگە لەوەی کە جۆرە ڕەنگێکە لە هەولێرێ و دەوروبەری، بەپیاوی زەبەللاحی کەمۆکێك بێ ئەقڵیش دەڵێن،...، جا لێرەدا ئێمە نازانین گۆرانیبێژ کام شینەیانی مەبەستە کە هیچکامەیان نییە. جا خەڵکینە! کە ئەو گۆرانیبێژە جیاوازی نێوان (پاوان و پاوانە) و (سینە و شینە) نەکات! ئەدی تاوان نییە ئەمن گوێی لێبگرم، سەری خۆمی بۆ ڕابژێنم! گۆرانیبێژان نەکو هەر شیعرە فۆلکلۆرییەکانیان

---

١- باخی میکایل: یەکێکە لە باخەکانی نێو شاری مەهاباد.

٢- پردی سوور: پردێکی بچووکە دەکەوێن نێو شاری مەهاباد و بە نزیك پارکی میکایلەوە.

٣ - قەرۆغ: قەراغ، قەراخ، لێوار، ڕۆخ، کەنار.

تێکداوە !... ئەوەتا گۆرانیبێژێکی دیکە ئەم شیعرە ناسک و بەنرخەی مام هێمنی هەر زۆر خراپ گێرە کردووە ! شیعرەکەش لە دیوانی (تاریك و ڕوون)دا، بەناوی (یادگاری شیرین) ـە و بەمجۆرە کە دەڵێ:

«شیری دەستی شێری ئالآیە برۆ ڕاکشاوەکەت»

بەڵام کاکی هونەرمەندی گۆرانیبێژ بەمجۆرە دەڵێ:

«شێری دەستی شێری ئالآیە برۆ ڕاکشاوەکەت!»

ئاشکرایە گۆرانیبێژ وای بۆچووە کە ئالآی دەوڵەتی شایانەی ئێران، وێنەی شێرێکی تێدابووە، کە ئەو شێرەش شێرێکی دیکەی بەدەستەوە گرتووە نەکو شیرێك، یاخود بەبێ هیچ لێکدانەوەیەك چڕیویەتی !

هەر ئەم گۆرانیبێژە و هەر لەم شیعرەشدا، دیسانەوە جوانییەکی دیکەشی دزێوتر کردووە، کە شیعرەکە وەکو خۆی بەمجۆرەیە:

«بەژنەکەت سێدارەیە، (کەزیەت) تەنافە، زووبە دەی!»

گۆرانیبێژ دەڵێ:

«بەژنەکەت سێدارەبە، (گیانت) تەنافە زووبە دەی!»

ئەو هاتووە وشەی (کەزیە)ی وێچووی تەنافی پەتی سێدارەی کردووە بە (گیان)، کە وشەی (گیان) وشەیەکی ناو بەرجەستەیە و هیچ جۆرە وێکچواندنێك لەگەڵ تەنافی بەرجەستەی پەتی سێدارەی خەڵك خنکاندن، دروست ناکات. جا برادەرینە، ئەم گۆرانیبێژە ئەم شیعرە جوانەی بەمجۆرە دزێو کردووە و میزاجی گوێگرانیشی پێ ئاڵۆز کردووە.

هەروەکو گوتوان گوتویانە «مشتێك نمونە خەروارێکە !» دیارە بێگومان ئەم شێواندنی بابەتە فۆلکلۆری و نافۆلکلۆریانەش هەر دەکەوێتە بابی سەرجەم گەندەڵییەکانی دیکەی بەرەو گەندەڵی تر.

بێگومان هەر گوێگرێك بە سەرنجی وردەوە گوێ لە گۆرانییەکانی ئەم جۆرە گۆرانیبێژە تازانە بگرێ، ئەوە موحەممەدی ماملێشی لەلا مەزنتر دەبێت.

هونەرمەندی دەنگخۆشی گوێیان، (محەممەدی ماملـێ)ی بولبولی ئاوازخوێنی نێو باخ و گوڵ و گوڵزاری بەهاری موکریان، خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندی هونەرەکەی خۆی بوو، کە ئەم تایبەتمەندیانەش لەم خاڵانەی خوارێدا دەردەکەون:

١–ماملـێ، بە دەستپاکییەوە، وشە و بابەتە فۆلکلۆرییەکانی وەکو پێویست لە جێی خۆیدا بەکارهێناوەو لەئاوازاندا جێی شیاوی خۆی پێگرتوون و گۆرانی (مریەم سابلاغی)ش، گەواهی ئەو ڕاستییەیە، کە لە هەموو ڕستە هەڵوێستە ئاوازەکاندا دووبارە و چەند بارە دەبێتەوە و هەموو جارێکیش خۆشییەکی جودا لە (مریەمە سابلاغییە) پێشوترەکەی دەبەخشێ.

گۆرانی مریەم سابلاغی، گۆرانی سەردەمی گەنجییەتی منە و لەیلایەی شەوانی تەنیایی و بێداریم بوو لە پشدەرێ. هەموو جارێکیش ئەگەر مریەم سابلاغی لە گۆرانییەکەدا دووبارە دەبووەوە، فەرموودەکەی ئافەریدەی مەزنم دەکەوتەوە یاد، ئەگەر لە قورئانی پیرۆزدا و لە سورەتی (ئەلرەحمان)دا، لە دوای هەموو ڕستەیەکدا ئایەتی «فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ» دوبارە دەبێتەوە و هەرجارەش تامو چێژێکی تایبەتی خۆی هەیە و مانایەکی جودا لەوی دیکە دەبەخشێ.

٢-موحەممەدی ماملێ، گۆرانی بۆ تەرەکردنی خەمەکانی خۆی و خۆشی دۆست و برادەرانی گوتووە. لە هیچکەسیش نەدیتراوە و نەبیستراوە، کە هیچ ئاهەنگێکی بۆ پول و پارە گوتبێ و خۆ ئەگەر بیشیکردبا، بێگومان مافی دروست و ڕەوای خۆی بوو، بەڵام،...،.

٣-هەر شیعرێك و بابەتێکی بۆ گۆرانییەکانی هەڵبژاردبێ، لە بنەڕەتەوە لەماناو مەبەستەکەی تێگەیشتووە. و بەرەڵلاییانە نەچۆتە نێو ئاوازانەوە و سیمای جوانی نەشێواندوون.

٤-ئەرکی نەتەوایەتی خۆی لە سەنگەری هونەرەکەیەوە بە ئەنجام گەیاندووە و لە هیچ گۆرانییەکدا ستایشکردنی دەسەڵاتداری دوژمنەکانی کورد نابیندرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، زۆری ئازار لەپێناو هونەر لەخزمەتی نەتەوەدا دیتووە، کە چەند جارێکیش لەسەر ئەو هەڵوێستەی زیندانی کراوە.

٥-زۆر جاران گۆرانیبێژە بێگانەکانی دەوروبەر وەکو هێزێکی سەربازی داگیرکار، هونەری گۆرانی کوردیان لاواز کردووە، ویستویانە جێی پێ لەق بکەن و دەریپەڕێنن، بەڵام هەرجارەی گۆرانیبێژێك بەهۆی ڕێچکەیەکی تازەی ڕەسەنی خۆکرد و کوردانەوە، لێیان ڕاپەڕیووە و وەسەر خاوەنەکانیانی کردوونەوە.

دیارو ئاشکراشە کە موحەممەدی ماملێ، پێشمەرگەیەکی سەنگەرشکێنی مەزنی ئەم بوارە بوو.

٦-موحەممەدی ماملێ، لە بوون و نەبوونیدا، لە هەموو ژیانیدا پیاوێکی بەدەست و دڵ و، دەرگای ماڵ لەسەرپشت و میواندۆست و خانەئاوەدان بووە.

ئەمجارە لەکۆتاییدا، هیوادارم کە کەسەکانی ئەم ڕەسەنایەتییە بەرنەدەن و ئەو ڕێزو بەرزییەش هەر بە بەرزی بهێڵنەوە و بیپارێزن.

ئیدی هێندەی حەزی من لە گۆرانی (کانییە مرادان) و (گیان)ی دوای مەقامەکانت، هەموودەمان گیانت شادو یادت هەر بڵند و درەوشاوەتر بێت، ئەی موحەممەدی مامڵێی چریکەی داودەیی[1]، ئەی گۆیندەکەی خۆشەویستانی خودای نێو باخچەکانی فیردەوسی بەهەشتی بەرین![2].

---

١- چریکەی داودەیی: ئاماژەیە بە دەنگی داود پێغەمبەر، کە دەنگی زۆر خۆش بووە. (ئامادەکاران)

٢- گۆڤاری پشدەر، ژ١٤، بەهاری ٢٠١٠، ل٥١-٥٢.

## لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا
## فانی (مەمەندئاغا)

زۆر وشە هەن ئەگەر هەر جۆرێك بن ئەوەندە لەیەکدیەوە نزیکن کە وەکو جمکانە بوونە جووتەوشەو هەر کە ناوی یەکێکیان دێت، ئەوی دیکەیان دێتە بەرچاوان.

(کانی کەروێشك) کانییەکی ئاو مامناوەندییە، دەکەوێتە خۆرهەڵاتی گوندی مەرگە. ئەو کانیاوە کەمئاوەو زەوییەکی بچووکی (فانی)ی شاعیر بەراو دەکات.

فانی، وەك کشتکارێك زۆربەی کاتەکانی لە پاککردنەوەی ئەو زەویە لە گاشە بەردو ڕەسم[1] و وردەبەرد، بەسەردەبرد. تەپۆلکە تەختکردن و چیم[2] دەرهێنان و فرێدان، کاری دڵخۆشکەری ئەو ئاغا کشتکارە زەحمەتکێشە بوون.

کانی کەروێشك، کانییەکی چیایی و بەردەڵانی و ڕەقەن بوو، ڕۆژانە مەمەنداغا، وەکو فەرهادی کۆهکەن، تیشکە بەدەست، بە ئیشقەوە خەریکی بەردشکاندن بوو، بەدوای سەرچاوەی ئەو کەمەئاوەی کانی کەروێشکدا دەڕۆیشت.

فانی، ئەوەندە هۆگری ئەو جێگاو کانی و ئاوە بوو، کە بەیەکەوە ببوون بە جمك و لە یەکدی جودا نەدەکرانەوە، بۆیە لە هەرکات و شوێنێکدا کە ناوی کانی کەروێشك دەهات، شارەزایان، مەمەنداغایان دەهاتە بەر ئەندێشە، یان دیتنی مەمەنداغا تا دیتنی دیمەنی کانی کەروێشك بوو!

پیرۆت ئاغا، ئاغای مەرگە، کەسێك بوو لە سەرۆکەکانی بەرزی عەشیرەتی میراودەلی، ئاغایەکی بەڕێزو خۆشەویست و براگەورەی دەڤەرەکەبوو، ڕۆژێك چەند کەسانێك دەچنە لای پیرۆت ئاغاو شەکوای بۆ دەبەن کە مەمەنداغای فانی، بۆ فراوانکردنی زەوییەکەی، خەریکە نزیکی گۆڕستانەکە دەکەوێتەوە. پیرۆت ئاغا بەدوای مەمەنداغادا دەنێرێ و پێیدەڵێ: «مەمەنداغا دەڵێن وردە وردە خەریکی گۆڕستانەکە دەکەی بەزەوی، ئەوە کارێکی باش نییەو ڕازی نابم!». مەمەنداغاش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: «قوربان تۆ بە زیندویی تێرو پڕ چەوساندووتنەوە، ئەمنیش بەمردوویی دەیانچەوسێنمەوە. گرنگ ئەوەیە هەردوکمان نەهێڵین بە زیندویی و بە مردوویی بحەسێنەوە. باشە قوربان ڕادەوەستم هەتا تۆش و (حاجی عەلی ڕێویێ)یش دەمرن، ئەوجار دەست بەدەرهێنانی ئێوەش دەکەم!». لەو قسانەدا، دانیشتنەکە دەیکەنە پێکەنین.

فانی، ناوی (مەمەند)ـەو لە عەشیرەتی میراودەلی پشدەرییە. لە ساڵی (١٩١٠)ی زایینیدا

---

[1] – ڕەسم: بەرد، ئەو بەردانەی کە لەژێر زەویی باخچە و دار و دەوەناندان و بەمەبەستی خۆشکردنی ئەو زەوییە بۆ کشتوکاڵ، دەردەهێندرێن. (ئامادەکاران)

[2] – چیم: چیمەن، فریز، فریزوو، جۆرێك گیای بە ڕەگوڕیشاڵداری زیانبەخشە بۆ کشتوکاڵ.

له گوندی مه‌رگه‌ی زه‌نوێر و پاراو به‌ڕه‌ز و باخ، چاوی شینی به‌دیمه‌نه قه‌شه‌نگه‌کانی لوتکه‌ی به‌رده‌قه‌ڵشت و گه‌وره‌قه‌ڵا، کردووه‌ته‌وه و هه‌واری نوێی گوێیانی به چریکه و چه‌هچه‌هه‌ی بولبولی باخان، ئاوه‌دان بووه‌ته‌وه.

مه‌مه‌نداغا، کوڕی ڕه‌سوڵاغایه و له‌به‌رئه‌وه‌ی ڕه‌سوڵاغای بابی، له زه‌مانی حوکمی عوسمانیاندا له چه‌مچه‌ماڵ قایمقام بووه، مه‌مه‌نداغا پتر به (مه‌مه‌ندی قایمقامی) ناسراوه.

مه‌مه‌ند به منداڵی له حوجره‌ی مزگه‌وته‌کانی مه‌رگه‌یدا خوێندوویه‌تی و فێری خوێندن و نوسین بووه. به به‌دواداگه‌ڕان و خوێندنه‌وه، فێری زمانی فارسی کردووه‌و، شاره‌زاییه‌کی باشی له شیعر و وێژه‌ی فارسیدا په‌یداکردووه و (گوڵستان و بوستان)ی خوێندووه و له‌گه‌ڵ شیعره‌کانی شاعیرانی وه‌کو (حافزی شیرازی) و (سه‌عدی شیرازی) ئاشنایه‌تی په‌یداکردووه.

فانی، له ساڵی (١٩٥٧)ی زاینیدا له سه‌رۆکایه‌تی شاره‌وانی مه‌رگه بووه به فه‌رمانبه‌ری میری و، له‌به‌ر باری ناهه‌مواری ئه‌و سه‌رده‌مه، له ساڵی (١٩٦٤)دا وازی له کاری میری هێناوه.

مه‌مه‌نداغا، هه‌رچه‌نده به ڕه‌چه‌ڵه‌ك ئاغا بووه، به‌ڵام سه‌رتاپای ژیانی خۆی، بۆ دژایه‌تی ڕژێمی ده‌ره‌به‌گایه‌تی و بڵاوکردنه‌وه‌ی زانست و خوێندن و کوردایه‌تی و چاکه‌ی چه‌وساوان ته‌رخان کردووه.

مه‌مه‌نداغا، ناسناوی شیعریی خۆی به (فانی) ناوزه‌دکردووه و له نێوه‌ندی ڕۆشنبیر و خه‌ڵکی ئه‌دیب، هه‌ر به مه‌مه‌نداغای فانی، یان هه‌ر به (فانی) ناسراوه.

فانی، پیاوێکی که‌ڵه‌گه‌تی چوارشانه‌ی تۆکمه‌ی داڕژاو بوو. جلی کوردی له‌به‌رده‌کرد و شه‌ده (مشکی)ی له‌سه‌ری ده‌به‌ست. ڕه‌نگی سوور و سپی و مووزه‌رد و چاوشین بوو. خاوه‌ن ده‌نگێکی قه‌به‌ی نێرانه بوو. چه‌وساوه‌دۆست و کوردپه‌روه‌ر و زانستویست و پێشکه‌وتنخواز بوو. له هه‌ر دانیشتنێکدا به‌گوێره‌ی باسی بابه‌ت، قسه‌زان و خاوه‌ن وتار بوو. چۆن له‌کارکردن ته‌ڕده‌ست بوو، له وه‌ڵامدانه‌وه‌ش ئاماده‌وه‌ڵام بووه.

براده‌رێك گێڕایه‌وه و گوتی: ساڵێکی به میوانی چووینه گوندێکی پشده‌رێ و ڕوومان له دیوه‌خانی خزمێکی خۆمان کرد، خه‌ڵکی دیوه‌خان له دووره‌وه ناسیبوویان. یه‌کێك له‌و خزمانه که ده‌ستی شاعیری ده‌بێ، ده‌یه‌وێ له‌ناکاو به شیعرێك هه‌جووی فانی بکات و وه‌کو ئه‌و پیره‌ژنه‌ی که ویستی سه‌لام له‌بیر عه‌لی به‌رده‌شانی به‌رێته‌وه، ئه‌ویش سه‌ر له فانی بشێوێنێ. که فانی ده‌گاته ده‌رگاکه، له ده‌رگای دیوه‌خان داده‌به‌زێ به پێکه‌نینه‌وه به فانی ده‌ڵێ:

«ئه‌ی مه‌مه‌نداغا جه‌نابتی بوویته تونکی ژێر عه‌با»

هه‌رجێبه‌جێ مه‌مه‌نداغا له مه‌به‌ستی ده‌گات و ناهێڵێ ئه‌و خزمه شاعیره‌ی، نیوه‌دێره‌که‌ی

تەواو بکا و، هەر لەسەر هەمان کێش و سەروای ئەو، وەڵامی دەداتەوە و نیوەدێرەکەی بۆ تەواودەکات و دەڵێ، بەڵێ:

«هەر بەڕێوە ڕەقی ئەکات و هەر بە پێوە لێت دەبا!».

لێرەدا پێکەنین دروست دەبێت و پیاوەکە بەخۆیدا دەشکێتەوەو شیعرەکەش بەمجۆرە دروست دەبێت و دەکەوێتە سەر زمانان و دەبێتە بەزمی جەفەنگان.

«ئەی مەمەنداغا جەنابتی بوویتە کوشکی ژێر عەبا
هەر بەڕێوە ڕەقی ئەکات و هەر بە پێوە لێت دەبا!».

چەند لەوەڵامدانەوەدا پیاوێکی حازربەدەست بووە، ئەوەندەش پیاوێکی جەفەنگی و قسەخۆش بووە. دەگێڕنەوە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی بەهاریدا لەگەڵ خزمێکی، بەسواری وڵاغان دەچنە گوندێکی دەشتی مەرگەی و لە ماڵە خزمێکیان دادەبەزن و وەکو میوانی ناوەخت بۆ نیوەڕۆ چێشتی کاردو دەخۆن. برادەرەکەی چێشتەکەی پێخۆش دەبێت و زێدەخۆری دەکات.

کاتێك کە دەڕۆن، برادەرەکەی لە ڕێگایە تووشی سکئێشە دەبێت و دادەبەزێ و دەڕشێتەوە و دەکەوێ. فانی لەلای ڕادەوەستێ و بەتوانجەوە شیعرێکی بۆ دەڵێ کە بەداخەوە هەموویم دەست نەکەوتووە، تەنیا ئەوەندە بەیتە نەبێ کە دەڵێ:

لەعنەت لە کاردو خزمێکی کوشتم
بەو خزمە کوێرە، شکاوە پشتم
سمێڵی سووری کلکە سمۆرە
وەرن بۆی بگرین نۆرە بەنۆرە
هەرچی خواردبووی لە ماست و کاردو
هەمووی دایەوەو لە سمێڵی هەڵسوو

فانی بۆ خۆی گێڕایەوەو گوتی: بەیانیەکیان برادەرێك هاتە لام و گوتی: «بۆخۆت دەزانی زستانەو منیش دلکم[1] لێبڕاوە بۆ وڵاخەکانم، هەستام چوومە ماڵی کاك شوکری بۆ هێندێك (کا) ئەویش وەکو پێویست نەبوو، جا ئەمشەو بەم شیعرە هەجوویەکم کردووە، هێناومە بزانی چۆنە؟»

گوتم بۆم بخوێنەوە. کە خوێندییەوە بەمجۆرە بوو:

«چوومە ماڵێ شوکری شامی
کای نەدامێ و گرتی و گامی!»

گوتم کاکە بەو شیعرە تۆ زۆرت زەرەرە.

گوتم بنووسە:

---

١- دلك: ئالیکی وڵاخ و مەڕو ماڵات.

«چــوومــە مــاڵــیّ شــوکــری شــام
(کــــام) لــێــســتــانــد و گــرتم و گــام»

فانی شاعیری هەموو بوارەکان بووە. لەبارەی ڕەخنەوە، وردەکار و پێشبین و چاکسازبووە، لەکاتێکدا کە دەبینیّ گەورەکانی دەوڵەتان خەریکی کۆبوونەوەن و لەکاری سیاسەتی جیهان دەدوێن و گەورەکانی کوردیش دەبینیّ کە پاڵیان لێداوەتەوە و هەر خەریکی ڕابواردنن، ڕەخنەیان لێدەگرێت و لە شیعرێکی درێژدا باسی دەکات. لەبەرئەوەش ئەم شیعرە لەدیوانەکەیدا هەیە من تەنیا ئەم بەیتەم لێدەرهێنا کە دەڵیّ:

«چــەرچــڵ و ڕۆزفــلــت خەریکی ڕاوی غــایــەن ڕۆژ و شەو
گەورەکەی ئێمەش بەبیّ غەم پرچی پوور نەخشینی گرت!»

زانست بەلای فانی شاعیرەوە بوارێك بووە لە بوارە گرنگەکانی ڕزگاری و، وەکو ئاوێنە سەربەستیی کوردی تێدا دیوە و زۆربەی ژمارەی هەر نەتەوەیەکی دواکەوتووی بیّ زانست بەبیّ دەسەلات و ژێردەستە زانیوە و زانستی کردووە بە چەکی ڕزگاری، نەتەوەی دواکەوتووشی هەرچەند ژمارە زۆریش بێت، وەکو گاگەلێك سەیرکردووە، کە تاکە کەسێك دەتوانێت ستەمیان لێبکات، وەکو لەم شیعرەی لەسەرەوە باسمان کرد کە دەڵێت:

«ڕوو لــە زانــــین نــەکــەی تــۆ پــەشــە تــەعــدای نفوس
بــۆ دریــنــی ورگــی گــاگــەل، بەچکە گورگیّ قینی گرت[1]

چونکە فانی بۆ خۆی بەرەنج و ماندووبوونی خۆی بژێوی خانەوادەی خۆی دابینکردووە، بۆیە هەمیشە لە ناخی دڵەوە بەزەیی بە خەڵکی چەوساوەدا هاتووەتەوە و هاواری بۆ کردوون.

ساڵی (١٩٤٢) ساڵێکی ڕەشەساڵ و گرانی و گەرمەی شەڕی دووەمی جیهانی بووە. لەوساڵەدا لەبەر بڵاوبوونەوەی گرانی و برسێتی، حکومەتی عێراقی وەکو یارمەتی (جۆ)ی بەسەر خەڵکیدا دابەشکردووە، هەرچەندە ئەو بڕەجۆیە بۆ سەرجەم خەڵکی بووە، بەڵام بەشی زۆری لەلایەن فەرمانبەرە دز و بیّ ویژدانەکان و دەرەبەگەکانەوە براوە و بەشێکی کەمی بۆ خەڵکەکە ماوەتەوە. فانی لە شیعرێکدا کە لەدیوانەکەیدایە، باسی ئەو جۆ دزینە و نادادپەروەری دابەشکردنەوەکان و دەڵێت:

«هــەرچــەنــدە جــۆی ئیعانە
بــۆ کـــوردە ڕووتــەکــانــە
ئــاغــاگــەلی زەمــانــە
بــردیــانــە ژوور مــەجــانــی!»

[1]- لە پەراوێزدا هیچ ڕوونکردنەوەیەکی لەبەرامبەردا بۆ نەنووسراوە. (ئامادەکاران)).

بۆمان هەیە کە بڵێین فانی شاعیری بەرزی کوردایەتی و چەوساوان و زانست و پێشکەوتن بووە، چونکە زۆربەی شیعرەکانی لەنێو ئەو بازنەدا خۆیان دەنوێنن، بەڵام خۆمانیش لە تایبەتییەکانی مرۆڤ بەدەرنییە و تەمەنێکی گەنجایەتی بەسەربردووە و مافی خۆیەتی هێندێك جار وەکو هەموو گەنجێك چاوبگێڕێت و چاوێك لە چاوی کیژۆڵە چاو ئاسکەکانی (کانییە چاوان[1]) بکات و باڵایان بە باڵای چنار و سپیداری نێو ڕەز و باغی دۆڵی مەرگەی بچوێنێ. دیسان لەوکاتەشدا هێمن ئاسا، کوردستانی هەر لە بیرەو، چاوی ئاسك و زولفی پەخشان و لارو لەنجەی کیژۆڵان، تێکەڵی دیمەنی قەشەنگی کوردستان دەکات و لە کانگای دڵەوە دەڵێت:

«بەبازاڕی جانیدا بەسەربەستی بڕۆ جاری
مورید و مورشید و موفتی وەکو من شێت و شەیداکە
ئەگەر پێت خۆشە کوردستان وەکو جەننەت موعەتەرکەی
بکە زولفی تەڕت شانە و سەعاتێ ڕوو بەرە و باکە.»

لاپەڕەی هەجووکردنیش لە دەرەوەو ناوەوەی (فانی)دا درەوشاوەن، لەم بوارەشدا سەرکەوتووانە گوللەی وشەکانی ئاڕاستەی ناحەزەکانی کردووە و نێوەڕۆکی شارەوەیانی دەرخستووە بە خەڵکی نیشانداون.

ئەوەتا لە شیعرێکدا لەسەر کارناپەسندی، هێرش دەکاتە سەر بەڕێوەبەری ناحیەی بنگرد و بەناوی (زۆرخۆرە فەندی) دایدەشۆرێ کە ئەم دوو بەیتەی لێ‌هەڵدەهێنجین:

زۆرخۆرە فەندی

«چاکە ناوت زۆرخۆرە فەندی
خۆت هەڵدەدێری بۆ چێشت لە کەندی
گۆشت بەرخی شاخی، گۆشت ماسی چۆمی
دەیکەیە ناو زگ، زگ دوو نهۆمی»

لەبارەی کاری کۆمەڵایەتییەوە، فانی کێشەیەکی مرۆڤانەی چارەسەرکردووە و ئامۆژگاری ئەو پیاوە بەتەمەنداچوانە دەکات کە ئارەزووی گەنجایەتییان دەجووڵێ و بە هەرجۆرێك بێت کچێکی کەمتەمەن دەکەن بەهاوسەری خۆیان و پێیان دەڵێ، چونکە بەلای ژنانەوە شتی پێویستترو پەسەندتر لە سامان و دەسەڵات هەیە.

عەلی بەردەشانی لە بەیتێ تفەنگێدا، ئەم بوارەی چاك هەڵسەنگاندووە کە دەڵێ:

«سەد مەڕت هەبێ کاسە سەر شیری

---

١- کانییە چاوان: کانیاوێکە لە کانیاوە بەئاوەکانی نێو گوندی مەرگەی و، ئاوێکی زۆری هەیە و، ڕەز و باخی لەبەرەو خەڵکی گەڕەکی کانییە چاوانی مەرگەی، ئاوی خواردنەوەیان لەو کانییە دابین دەکرێ.

سەد (گـا) شت هەبێ جووتی بن نیری
تـەختـی پـاشـای و مـالآتـی مـیری
لای ژنـان نـابی بـە حەملەی کـیری»

لەبەر بەکەڵکی ئەم شیعرەی فانی، و بۆئەوەی پیاوە (تەرپیر)ـەکان سوودی لێوەرگرن و خۆیان تووشی بەدبەختی نەکەن و کچان بە خۆیانەوە گیرۆدە نەکەن، ئەم شیعرەم لە دیوانەکەیدا بۆ خوێنەرانی گۆڤاری ڕانیە دەرهێنا کە لەژێر ناونیشانی (سەرمەشقی پیرە ژیرەکان)دا بڵاوکراوەتەوە.

سەرمەشقی پیرە ژیرەکان

چـاکـە پـیرانـی وەتـەن لـەم قسـە غـیرەت بـگـرن
پـەردەیـی حورمـەتـی خـۆیـان بـە لـەقـەی کـچ نـەدڕن
گـەنجـی گـەنجیت کـە نـەمـا، لادە لـە گەنجییەتی گەنج
گـەنجـی لـیرەت لـەکـن ئـەو گـەنجـەیـە گـەنجێـکـە لـە ڕەنـج
بـەسـە ئـەم نـوکـتـە «پـیری خـێرە ئـەگـەر یـارت بـێ[1]»
«ببـە بـە غـەمخـواری کـەسێ، ئـەو کـەسـە غـەمخـوارت بێ»
ئـەو کـەسـانـەی کـە حـەیـاپـەروەر و خـاوەن هـۆش
بـە مـوزیـلـلـەت ئـەبـەدا ئـاوی بـەقـا نـانـۆش
کـچ لـەگـەڵ پـیر (کـەچـە) گـەر هـەمـوو دنـیـاشـی هەیە
دێـتـە ژێـر بـاری کـوڕی لاتـەوە ئـەگـەر (کـا)شـی هەیە
بـەسـیـەتـی (فـانـی) ئـیـتر عـەیـبـە قـسـەت کـۆتـاکـە
خـۆت کـە پـیربـووی، لـە کـچ و سوحبەتی کـچ حاشاکە[2].

---

١- پیری خێرە، ئەگەر یارت بێ: ئاماژەیە بۆ ئەو پەندە هەڵەیە کە دەڵێ: «ژنی پیران وەکو میران!».
٢- گۆڤاری ڕانیە، ژ١١، ئازاری ٢٠٠٥، ل٣٢-٣٤

## لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا
## شاعیری لاو...
## ناسیح مستەفا یوسف

کەسایەتییەکی لێوەشاوە و ئارام و هێمن و بەڕێز. زۆر نییە هەنگاوەکانی خستووەتە پێهەڵگەڕان بە هەورازی لاوێتیدا. دیمەنەکانی دەڤەری قەشەنگی خۆشناوان هەستی نەتەوایەتی و جوانویستی وروژاندووە. وشە و سەرواو کێشی شیعری و بیری ڕزگاری و ئەندێشەی خاوێنگەرایی، شیعریان لەناخدا تروکاندووە.

ئەم شاعیرەمان ناوی (ناسیح مستەفا یوسف)ـە. ناسیح لە ساڵی (١٩٨٣)دا لەدێی (شێخ وەسان)ی کوردایەتی چاوی بە تیشکی ڕوونی خۆری ئاسمانی ساماڵ کراوەتەوە و لە خێزانێکی ژیان ئارام و گونجاودا پەروەردە بووە. لەبەر پەروەردەکردنی منداڵ و خوێندن، ئەم خێزانە (شێخ وەسانان) بەجێ دەهێڵن و دەگوازنەوە بۆ شارۆچکەی (سەروچاوە) و لەوێ نیشتەجێ دەبن.

ناسیح خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی هەر لە شارۆچکەی سەروچاوە تەواوکردووە.

لە ساڵی (١٩٩٩)دا بەخەستی چووەتە نێو خوێندنەوەی شیعری شاعیران و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنیان، هەر لەو ساڵەشدا دەستی بە شیعردانان کردووە و، بەخوڕ بۆ کیمیاباران و ئەنفالکراوان و عەرەب کوشتووان، گریاوە و لەیادی ساڵڕۆژی کیمیابارانی هەڵەبجەدا لە ١٩٩٩/٣/١٦ شیعرێکی بڵاوکردووەتەوە.

یەکەم بەرهەمی شیعری خۆی، لەنێو دووتوێی بەرگێکدا لە ٢٠٠٤/٩/٢٧ بەناوی (نزای خەمە بێ نازەکان) بڵاوکردووەتەوە. ئێستاش دووەمین بەرهەمی شیعری بەناوی (جوانیت هەوێنی شیعرمە) لەژێر چاپدایە و بەمزوانە چاوهەڵدەهێنێت و بڵاودەبێتەوە.

شاعیر چەندین کۆڕی شیعری لە شاری ڕانیە و کۆیە و شارۆچکەی سەروچاوە سازکردووە. کاتێك کە شیعر دەخوێنێتەوە، هەروەکو ئەوەی کە لەگەڵ برادەرێکی بدوێ و بیەوێ ئەوەی کە لەگۆشەکانی دڵیدا پەندی خواردووە، بۆی بدرکێنێ و خەمەکانی لەلا پەراگەندە بکات، ئەوە هێمن و ئارام دڵۆپ دڵۆپ بەدوای یەکدیدا ڕیسوویان پێدەبەستێ.

شیعرەکانی لەسەر کێش و شێوەی ڕەسەنی شیعری کوردین و هەر هەموویان لە کێشی پەنجەیی و حەوت و هەشت بڕگەیی دەرنەچوون و تارمایی فۆلکلۆری کوردییان لەدەورە ئاڵاوە. ڕستەکان وێژەییانە و ڕێزمانیانە داڕێژراون، وەکو وەستاو مامۆستای چاك و بەمشوور، وردەکاریان تێداکراوە، بۆ چوونەکان و تێڕوانینەکانی ژیان لە شیعرەکاندا

بابەتیانەن. وشە ناسك و سادە و ڕەوان و ڕوون و پڕ مانا و بەهێزن. سەرجەمی شیعرەکانی ئاوێنەی ژیانی خۆی و دەڤەرەکەی و کوردستانن. بەهێندێك لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێت کە تووشی پەتای دەردەدڵی بووبێت و شۆخ و شەنگێك بووبێتە وێنەی هەمیشەیی ئەندێشەی بەر دیدەکانی.

بۆیە نزا دەکا و دەپاڕێتەوە کە خۆشەویستەکەی چارەیەکی ئەو دەردەدڵەی بکات، بەڵام بێ ڕەحمانە باری گرانی نازانی، لەسەر کەڵەکە دەکرێ و تاکو ئەو ڕاددەیەش کە پێویستە و دەتواندرێ خۆیان لەبەر ڕادەگرێ، کاتێکیش کە دەگاتە ڕاددەی لەنێوچوون و ژیان لەدەستدان و دێوانەیی، بابەتیانە بیردەکاتەوە و خۆی پێوە نەمراندووە و بێ دەربەستانە ئەو بارە گرانەی لەسەر شانی خۆی فڕێداوە و تەوقی کۆیلەتی لە ئەوکی خۆی داماڵیوە.

ناسیحی لاو وەکو گەنجێك لەبری ئەوەی یەکەم شیعر بۆ کیژۆڵەیەکی ناسك و نازدار بڵێ، نیشتمانپەروەری دەردەکورد هەژاندوویەتی و شیعری بۆ پێنج هەزار گوڵی ژەهر بارانکراوی هەڵەبجەی ئەحمەدی موختاری جاف گوتووە.

هەتا لەکاتێکدا کە نیگای چاوانی لەگەڵ چاوی نازدارێك یەکدیگیر دەبن، ناسیح کوردستانی لەبیر ناچێتەوە و خۆشەویستەکەی بەخاکی کوردستانەوە خۆشدەوێت. وشە و ڕستەی ناسك و بەیتە شیعرەکانیان کردووە بە گوڵزار. «مەچۆ بۆ ناو گوڵزار، با جوانیت کاڵ نەبێتەوە. لە گەورەییان عەشق پێناسە ناکرێت!» ئەوەندە ناسکپەرستە، لەکاتێکدا کە تووڕەدەبێ و دەیەوێ بە بەرابەرەکەی بڵێ درۆدەکەی، ئەوە لەباتی وشەی درۆ وشە ناڕاستی بەکاردەهێنێ.

ناسیح خوێندکاری پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی ڕانیەیە و ساڵی تەواوکردنی خوێندنیەتی و دەبێتە مامۆستا و لەپیرۆزترین سەنگەردا بەگژ نەزانی و نەخوێندەواریدا دەچێت و دێوەزمەی ڕەشی دواکەوتن ڕاودەنێ و... هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازین.

بۆ ناسینی شیعرەکانی ئەم شاعیرە، شیعری (بێ ئارامی)مان هەڵبژارد، بەو هیوایەی خوێنەرانی گۆڤاری ڕانیە ساتێکی لەگەڵ بەرنەسەر.

## بێ ئارامی

من نازانم بۆ ئەوەندە بەبێ میهری لێم ئەڕوانی
پەپوولەی حەز ئازار ئەدەی ئەشێوێنی خەونەکانی
بێ تۆ دڵم پرسەدارە، چاویش چاوەڕێی ڕێگاتە
ئاخر چی بکەم کە چاوی من حەزی لەسەیری باڵاتە
نوقمی دەریای عەشق بوو، وەئەو دەریایەی کە بەبێ بنە
بـاوەڕ بکە کە لێم ونی، منیش دڵم لەخۆم ونە
بۆ هەوێنی شیعرەکانم هەر ناوی تۆ بەکاردێنم
شیعرم سێبەر بۆ تۆ نەکا گەڵاکانی ئەقرتێنم
بێ پڕشنگی ڕوخساری تۆ مابێ سەبووریم هەمووتاوێ
کە شەویش بێ کە تۆ هاتی ژیانی من خۆری ناوێ[1]

---

1- گۆڤاری ڕانیە، ژ١٢، حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل٣٢-٣٣.

## لەگەڵ شاعیرانی دەڤەرەکەدا
## مەلا مەحموودی دێرێ

جیهانێکی قەشەنگی تایبەت بەوتەی هەنگوینی خۆش ڕاگوزەر بەهەواری گوێی بیستەراندا، گەنجینەیەکی پڕ گەوهەری درەوشاوەی بەنرخی ڕووداوە جۆربەجۆرەکانی زۆر دەڤەران. خاوەنی وتەی پڕ مانا و نەستەق و بەجێ. تەییار بەزانیاری کۆمەڵایەتی. ڕووخۆش و کۆڕگەرمکارو دەم بەخەندە.

نەزیلەزان، تێلنیشان بەکارهێنان و ئەنگێوە. بەگوێرەی جۆری دانیشتنەکان قسەی شیاوی نێو ڕیزی برادەران. لە هێندێك دانیشتن وتەی توێکڵ و ماناشاراوە، لە هێندێکی دیکەدا دواندنی سادە و ساکار و پێکەنیناوی.

پیاوێکی کۆمەڵایەتی و دەربەستی چارەسەری کێشە و ڕووداوەکان. لەهەر دەڤەرێکدا ژیابێ، کۆڵەکەی ساباتی برایەتی و تەبایی بووە، ئەو کێشانەی کە زۆر ئاڵۆزبوون و چارەسەریان دژوار بووە، خۆنەویستانە و پشوودرێژانە ڕوو بەڕوویان بووەتەوە و چووەتە نێویانەوە و هۆی ڕوودانەکەیانی دیتووەتەوە و خاڵەکانی چارەسەرکردنی دەستنیشان کردوون و دەرمانی پێویستی و ئارامی پێ بەخشیون.

گەڕیدەی کوردستانی ئەمدیوە و دیوی خۆرهەڵات و باشووران، ئاشقی دیمەنی شیرینی چیای سەرکەش و دۆڵ و نشێوی بەرەزو باخ، دەشتی پان و بەرین و ڕووباری بەهاژەهاژ، ڕاوچییەکی کەموێنە، بەڵام نەکو بۆ نێچیر و خۆژیاندن و خواردن، بەڵکو بۆ دیتنی دیمەنی جوانی سبەینانی قەدو باڵای سەرسپی و دامێن سەوز و، بەچاوی گەشی ئەو سەردەمەی چاوبڕینە ئاونگی میوانی شەوێی سەر پەلکەگوڵ و بۆڕ و بێژانێ، کە وەکو بێچووەخۆران شەرە پڕشنگان لەگەڵ داکیان دەکەن و پێی دەڵێن، لە ژوانی خۆمان بە ئاکام گەیشتین و هەنووکە دەگەڕێینەوە.

قاسپەقاسپی کەوانی زۆر پێخۆشبووە، دەنوکی سوور و گەردنی بەخاڵ و میلی لا کەلەکان، فێری جوان پەرستییان کردووە، بەڵام هەمیشە لە خۆخۆریدا، لەدژایەتی یەکتر و یەکدی کردندا بە قەومی کوردیان دەچوێنێ.

شاگەنج و سوارچاکی نێو سواران، (مەحموود مەمەند وەیسی)، ناسراو بە (مەلا مەحموود). لە ساڵی (١٩١٧)دا لەبناری پشدەرێ لە گوندی (دێرێ) وەسەر زەمینی ئەم جیهانە ئاڵۆزو پڕ کارەسات و کوێرەوەرییەیان خستووە، هەر لەو گوندە ژیانی منداڵی بەسەربردووە، لەدواییدا ماڵیان هاتووەتە نێو شاری قەڵادزێ. بە منداڵی لە حوجرەی فەقێیان لەسەردەستی مەلایەکانی پشدەرێ خوێندویەتی، زیرەك و بەتوانا بووە لە

خوێندنی ئەو سەردەمەدا.

قورئانی تەواوکردووە، (گوڵستان و بوستان) و (جامی)ی تەواوکردووە. هەر بۆیەش پێیدەگوترێ (مەلا مەحموود) دەنا مەلایەتی نەکردووە، لەوەشەوە فێری زمانی فارسی بووە.

لە ساڵی (١٩٣٩)دا، کە بۆ یەکەمجار قوتابخانە لە قەڵادزێ کراوەتەوە، ئەو کەسانەی کە لە حوجرە خوێندویانە بەگوێرەی توانایان، لە پۆلی جوێ جوێدا دایاننناون. مەلا مەحموود لەوساڵەدا، لەگەڵ کۆمەڵێك لە برادەرانی چووەتە قوتابخانە و لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی وەرگیراوە.

مەلا مەحموود، دۆستایەتی لەگەڵ خوالێخۆشبوو (فانی) شاعیردا هەبووە و فانی بە حیزبی کۆمەڵەی ئێرانی ناسیوە و بۆ یەکەمجار چووەتە ناوچەی سەردەشت و لە گوندی (نەبنە) لەگەڵ چەند کەسانێك کە لە مەهابادەوە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوون، کۆبوونەوەی کردووە و هەر لەوێ بەخواردنی سوێندەکانی کۆمەڵە، بووە بە ئەندام و، لە ناسناوی حیزبیش (فەهمی) بۆ داندراوە.

پاش ئەو بوون بە ئەندامبوونەی لە کۆمەڵەدا لە ساڵی (١٩٤٢-١٩٤٣) بۆ کاری کۆمەڵە چووەتە مەهاباد و کاری پەیوەندی هاتن و چوونی پێ سپێرراوە لە نێوانی خەڵکانی کوردپەروەری دەڤەری پشدەر و مەرگە و بیتوێنێ و مەهابادا. لە کۆماری کوردستانی مەهابادا، پێشمەرگەیەکی دیارو ناسراو بووە، لەلای سەرکۆماری ڕێزی خۆی هەبووە، لەگەڵ خوالێخۆشبوو جەنەڕاڵ بارزانی دۆستایەتی هەبووە، زۆر جاران لە خزمەتیدا بووە و نامەی بۆ هێناوە بۆ پشدەر و وەڵامەکەی بۆ بردووەتەوە، لەڕووخانی کۆماردا داوای لە بارزانی کردووە کە لەگەڵیدا بێت، بەڵام ئەو وای بە باش زانیوە بگەڕێتەوە پشدەرێ، لەوکاتەشەوە تا ئێستا هەموو ژیانی تەرخانی مەسەلەی کوردایەتی کردووە لە ساڵی (١٩٦١) وە تاکو دوایی. چەند کوڕ و کچێکی بەکەڵکی بۆ پەرەپێدانی ڕەوتی ژیانی کوردایەتی خستووەتەوە و لەو بوارەدا جێگای ئاوەدان و زەنوێرە.

لە ڕاگواستنی بەعسیاندا[1]، لە قەڵادزێوە کەوتە هەولێر لە ئۆردوگای زۆرەملێی (دارەتوو) دا ئارامی گرت و تاکو هاوینی ساڵی (٢٠٠٥) هەر لەوێ مایەوە و لەدواییدا گەڕایەوە دەڤەری زێدی خۆی و ئێستا ژیانی خۆی بە بیتوێنێ سپاردووە و لەشاری ڕانیەیدا دەژی. شیعرەکانی مەلا مەحموود، ساکارن، هەڵقوڵاوی دروستی ناخی خودی خۆین، وشەی خۆماڵی ڕەسەنی کوردین، بەهۆی خوێندنی وانەی فەقێیایەتییەوە وشەی عارەبیان کەمێك تێکەوتووە، شیعری داشۆرینی زۆرە و کاریگەر و بەهێزیش، بەڵام پێی باش نەبوو لێرەدا بڵاوبکرێنەوە.

١ – مەبەستی لە ڕاگواستنی پشدەرە لەسەردەستی بەعسیان لە حوزەیرانی ١٩٨٩ بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکانی سلێمانی و هەولێر. (ئامادەکاران)

شیعرێکی لەسەر خراپی قەرزداری هەیە کە لە ساڵی (١٩٥٢)دا گوتوویەتی: بۆ نموونەی ەرزی شیعرەکە چەند دێڕێکی لێهەڵدەبژێرین:

**قەرزداری**

قـــــەرزداری دەبـــا ئـــاوی ڕوانـــت
دەکـــا فـــێری درۆ تـــەبـعـــەن زمـانـت
بـــرا، دەشـکـێ بـە سـەنـگ قـــەرزداری
موحەققەق شوشەی تەمکینی شانت
بـەوێـنـەی کـەر ئـەگـەر بـارەبـەربـی
ئـەوەت باشترە، نـەوەك قـەرز لەسەر بی
ئیدی مەحموود نەکەی قەرز و بەسەنگ بە
لەگەڵ ڕاستی ڕەفیق بە وەك خەندە بە

لە ساڵی (١٩٤٢–١٩٤٣) کە لەمەهاباد بووە لەنێو کۆمەڵێ برادەراندا بەچەبازێکی تێدابووە، مەلا مەحموود زۆر ئامۆژگاری کردووە، کە ئەو کارەی دەیکات لەگەڵ کاری پیرۆزی نیشتمانپەروەری نایاتەوە. لێرەدا مەلا وەکو پیاوێکی ئایینی ئاماژە بە ڕووداوی قەومی لوت دەکات کە خودا لەسەر ئەو کارە پیسە، چی پێکردن و چۆنی لەنێوبردن.
لەم شیعرەشدا چەند بەیتێکیان وەردەگرین:

**بەچەبازی**

خـــودا لـوتـی نـــارد بـــۆ ئـامـۆژگـاری
بـۆیـان بـەیـان بکا ڕێـگـای ڕزگـاری
بـــەڵام بـێـدیـنـان وازیـــان نـەهـانـی
ڕوویـــان نـــەکـــردە یـــاســـای یـەزدانـی

مەلا مەحموود، بێجگە لەوەی کە بە نموونەی ئایینی و داستانی قەومی لوت ئەو برادەرە ئامۆژگاری دەکا، دواڕۆژیشی بۆ دیاری دەکات و بەئاشکرا هاواردەکات و دەڵێ، ئەو جۆرە کەسانە بەکەڵکی کاری نیشتمانپەروەری نایەن و پێویستە لەم ڕیزە پیرۆزەدا نەمێنن وەك دەڵێ:

هەرکەسێ وابێ خۆی بەمنداڵی
کاتێ کە پیربوو، دەگۆڕێ حاڵی
لەباتی سواربێ، سواری خۆی دەکا
هەرچی پێویست بێ ئامادەی دەکا
ناترسێ لەخوا، ناترسێ لە دین
بۆتە موریدی شەیتانی لەعین
جا، کەسێک ئەوە کردوکاری بێ
خۆی ئەوی بکا هەتیو سواری بێ
چۆن سوودی دەبێ بۆ خەڵك و وڵات
دایکی نیشتمان نەفرینی دەکات

**مەلا مەحموود، شەڕی براکوژی زۆر پێ تاوانێکی گەورە بووە، بۆیە شوانەوێڵەی ڕەوەندی بێئاگای لەجیهان و ڕووداوەکانی پێ باشترە لە سەرکردەکانی شەڕی براکوژی و دوو بەرەکی و بەرژەوەندی کەسی و حیزبی:**

### هەزار خۆزگەم

هەزار خۆزگەم چونکە شوانن
لەسەر مەرزی عێراق و هەم ئێرانن
دەکەن حۆ حۆ بە بلوێر و بەشمشاڵ
لەژێر گوێنیو لەسەر شاخ و لە لاپاڵ
وەنەوشە و گیابەند و خاویان لەلایە
بۆ هەرجێ بچن نیانە پەردە و پایە
نەپارتین و نە یەکێتی بەبێ لایی ژیاون
کە چۆن کوردبوون بەکوردی وەك خۆ ماون
لە تاریخ و سیاسەت نیانە ئاگا
لەگەڵ دژمن ئەبەد نابن بە ئاشنا
دەکەن چایی بە ئاژنە و دار بەلاڵوك
نیانە غاز و نەوتی کەرکوك

دەروون پاکن لەگەڵ خاك و وەتەنیان
بەسەد زێڕ نایفرۆشن یەك دەوەنیان
ئەوەی کورد بێ دەبێ وابێ سیفاتی
لە کوشتنی خۆ بەخۆ، دوور بێ خەباتی
نەوەك، وەك قەومی کەو دوژمن بەخۆبێ
لەگەڵ دوژمن زەلیل و دەستەمۆ بێ
ئەسەف ئێوەی موسەققەف وا نەزانن
بۆ کوشتنی یەك، وەکو بەوری بەیانن
دە ئێوەش دانیشن وەك برابن
لەڕووی دژمن پڵنگ و ئەژدەهابن
مەبن دڵگیر لە ئەشعارم کە پەندە
لەلای کوردێ کە کورد بێ سوودمەندە[1]

---

١- گۆڤاری ڕانیە، ژ١٤، کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥، ل٤٢-٤٣.

## کارەساتی قەڵادزێ، درێژەی سیاسەتێکی دێرینە بوو

بێگومان هەرکەسێك لە مێژووی ستەمکاری و ستەمدیدەیی وردبێتەوە لە کوردستاندا، بۆی ڕووندەبێتەوە کە ئەو کارەساتەی بەعسیان بەسەر شاری قەڵادزێیانی هێنا، درێژەپێدانی سیاسەتێکی لەمێژینەی باب و باپیرانیانە، کە نەوە لەدوای نەوە، داویانەتە دەستی نەوەی نوێتر و، ئەوانیش بەئەمانەتەوە بەجێیان گەیاندووە.

دیارە هەر نەوەیەکیشیان تازەترین و کوشندەترین چەکی سەردەمیان بەکارهێناوە، لە کەچەچەکە دوو سەرەکەوە، تا فڕۆکەی سیخۆی ڕووسی و ناپاڵمی هیندی و ڕقی شۆڤێنیانەی نەوەی نوێی داگیرکەران. دیارە بەبیانووی چەند خوێندکارێکەوە، یان شۆڕشێکەوە، بەڵکو سیاسەتی کوردقڕان و کوردستان وێرانکردن بوو، جا هەرجارەی بەیانوویەکەوە و هـەرڕۆژەی لەلایەکەوە بەگوێرەی دەسەڵاتیان کە چییان بۆ کرابێ و چەندیان بۆ لوابێ بەهەموو توانایانەوە ئەنجامیانداوە.

ئەوەتا کارەساتی ڕشتنی غازی ژەهراوی لە هەڵەبجە و شێخ وەسانان و دۆڵی جافایەتی ڕاگواستنی گوند و شارۆچکەکان، گرتن و کوشتن و تۆقاندنی خەڵکی بێتاوان لە هەموو شوێنێکی کوردستاندا.

بێگومان ئێستاش کە کورد فریای خۆیان نەکەون، هەرکاتێك چ بەعسیان دەستیان بەرەڵڵا بکرێت یان ئەوانەی دوای بەعسیان دێن، هەمان کارەسات چەند بارە دەکەنەوە[١].

١– ساڵنامەی کارەسات و ڕاپەڕین، ٢٤/٤/١٩٩٧، ل٤.

# مردن

## لە یادی چلەی مامۆستا خالیددا خوێندرایەوە[1]

مردن، جانەوەرێکی نهێنگری بێمۆڵەتی دڕندەیە، کەس نازانێ کاتی هەڵمەت و پەلاماری کەیە، ئێشە، ژانە، ژوارە، ئازارێکی بەوەیە، نە کەس دەبوێرێ، نە لەکەسیش دەبورێ، کەس ناتوانێ خۆی لێوەشێرێ، بە هەموو کەسیش دەوێرێ، نە شەوێ تاکو ڕۆژێ دەوەستێ و نە ڕۆژێ دەگەیەنێتە شەوێ! نە بەپاڕانەوەی ڕازی دەبێ، نە ماڵی دنیاشی دەوێ. بەهێزترین بەهێزەکانی لەلا بێ دەسەڵات و زەبوونە، گەمەی بە هەوڵەکانی پزیشکان دێت بۆ ڕزگارکردنی هەر گیانلەبەرێك کە بیەوێ نەیهێڵێ، زۆر بە سووك و چروکی دەڕوانێتە دەرمانان و بەتوانجەوە پێیان پێدەکەنێ. دڕندەیەکی ئەوەندە دڕندەیە، دڕەندەترین دڕندە لەبەردەمیدا لەرزۆك و شەرمەزار و ملکەچە، هەتا زیاتر لێی ووردبببینەوە، ڕزگاریەکی بەزەیی و میهرەبانی تێدا نابینینەوە و نابینینەوە...، گوێ ناداتە تەمەن و پێویستی مانەوە و نەمانەوەی هەر خاوەن گیانێك، کێی بوێ! چ تەمەنێکی گەرەك بێ! کەی بیەوێ و لەکوێی پێویستبێ، گیان و جەستەی لەیەکتر جیادەکاتەوە و کۆتایی بەژیان دەهێنێ و لەبەرچاوی دۆست و دوژمن بێسەر و شوێنی دەکات! بێباك و بێدەربەستە، لە دوای ئەو، چی دەبێت و چ ڕوو دەدات! کێ سەرگەردان دەبێت و کێش بەختەوەرە!

تالاوێکی بێوێنەی نەویستراوی بێزراوە، بە گەرووی هەموو خاوەن گیانێکدا دەچێتەخوارێ. ئەو، لەو ڕۆژەوەی کە یەکەم مرۆڤ یان بڵێن یەکەم گیانلەبەر پەیدابووە و سەرپشتی زەوی ئاوەدانکردۆتەوە! ئەو دەعبا دزێوە کەڵپگرەی بەرابەر هەڵتروشکاوە و هەڕەشە لە بوون دەکات و بووە بە مێملی ژیان!

کەس نازانێ لەکوێوە هاتووین! یان بۆچی هەین و هاتووین و چ دەکەین! ناشزانین کەی

---

١- مامۆستا خالید: خالید محەممەد ڕەسوڵ، لە ساڵی ١٩٥٠ لە شاری قەڵادزێ لەدایك بووە، ١٩٩٩/٦/٣ لە ڕانیە کۆچی دوایی کردووە. پیاوێکی بوێر و تێکۆشەری گۆڕەپانی کوردایەتی بوو، دوای ئاشبەتاڵ و لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتیی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، داخلی کاری ڕێکخراوەیی بووە، لە گەڵ کاری ڕێکخراوەییدا سەرپەرشتی ڕێکخراوی خوێندکارانیشی دەکرد لە قەڵادزێ و تا ساڵی١٩٨٥ بەردەوام بووە، بەڵام لەبەرئەوەی کە ڕژێمی بەعس زۆر فشاری خستبووەسەر بۆ بەبەعسیکردنی و ئەویش ملی نەدەدا، ناچار بۆ خۆشاردنەوە لەچاوی کاربەدەستانی ڕژێم، بەدزییەوە باردەکات بۆ شاری هەولێر، دوای ماوەیەك سەرپەرشتی ڕێکخراوە نهێنییەکانی سنووری بادینانی پێسپێردرا. دوای ڕاگواستنی شاری قەڵادزێش لە حوزەیرانی ١٩٨٩ بۆ سنووری هەولێر و سلێمانی، لە ئۆردوگای دارەتوو، لێپرسراو و سەرپەرشتیی شانەیەکی بروسك بوو لەکاتی ڕاپەڕیندا. کۆتا پلەی ڕێکخراوەیی، کارگێری مەڵبەندی شەشی ڕاپەڕین بوولە ڕانیە. (ئامادەکاران)

دەڕۆین و بۆ کوێ مل دەنێین! کۆتاییەکەی تاریکی ئەنگوستەچاوی وەکو تاریکەشەوی گیارەشی بەهاریش چاوەڕوانمانە! لەسەرەتاوە تاکو بەرەتا، هەمووی هەر زۆرەملییەو بێدادی و بێبەزەییە!

مرۆڤ بوونەوەرێکە، لەنێوان دوو نەبوونی نەزانداروادا، ماوەیەکی دیاری نەکراو ژیان بەسەردەبات...، لە هەرشوێنێکەوە هاتوون، ئەوە هەیە و هاتووە و سەرپشتی زەوی ئاوەدانکردۆتەوە! یەکتریان ناسیوە، ئاشنا و هۆگری یەکدی بوون، خۆشەویستییان لەنێواندا دروست بووە، ژیان بەسەردەبەن و بەهەموو جۆرەکانییەوە پێیان باشە بمێننەوە، بەڵام هەروەکو چۆن لەهاتندا نازانرێ چۆن هاتوون، هەروەهاش بێپرس و مۆڵەت، مردن پەلاماریان دەدات و بێسەروشوێنیان دەکات، هەروەکو ڕۆژانە بە بەرچاوانەوە دەبینرێت هەرکەسەش بەجۆرێ دەڕوات و لە بیابانی نەبووندا بێسەروشوێن دەبێت.

ئەوەش یاسایەکی سروشتیە هەرچەندە پێشمان ناخۆش و ناڕەوابێت! ئەوەندەش ڕەوایە، ڕەوایە چونکە بوون هەیە، کۆنبوون هەیە، نوێبوونەوە هەیە! بەڕاستی دەتوانین بڵێین، مردن چەشتنی تاڵاوێکی ڕەوایـە، دڕندەی بێبەزەیی هەمیشەیی سەر دەماری بناگوێیە، هەرساڵێك پەلاماردا، دەیدا.

هەندێك کەس دەڵێن (مردن براگەورەیە)، دیارە بەگوێرەی ئەو براگەورەیەتیە، پێویستە ڕێزی لێبگیرێت، بەڵام ئەو ڕێزلێگرتنە، وەکو ڕێزلێگرتنی بێ دەسەڵاتێك وایە لە دوژمنێکی زۆردار و، یاسای (دەستێك نەتوانم بیبڕم ماچی دەکەم)ـە!

بەدرێژایی مێژووی بوون، ئەو کردارە یاسا سروشتیە تاڵە ڕەوایە، ئەوەندەی ئافەریدە لەنێوبردوون، تۆماری فەرهەنگی مردوانیش پێی لە ژمارە نایەت! ئەحمەد هەردی شاعیر لەو بارەیەوە باشی فەرمووە کە دەڵێت:

نـازانم کە هـەر پەنجەیەك لـەم خاکی زەمینە
دەمی دە هەزار لەیل و، کوڵی سەد مەم و زینە!

بەهەر چاویلکەیەك سەرنجی مرۆڤ بدەین، دەبینی کە لە زێڕی خاکەوە پەیدابووە لە هیچ جێگایەکی دیکەوە نەهاتووە تاکو بچێتەوە بۆ ئەوێ، لەکوێ دروستبووە و لەچی دروستبووە! لەکوێ کۆتایی ژیانی دێت وە دەبێتەوە ئەو مادەیەی کە لێی دروستبووە. ئادەم یەکەم مرۆڤی سەر زەوییە لە خاك دروست بووە، دیارە وەکو لاشەش هەر بۆتەوە بەخاك. خودی وشەی (ئادەم)یش یانی گڵێکی مەیلەو سوور.

دیارە مامۆستا خالیدی کۆچکردووی خۆشەویستی کۆمەڵی برادەرانی، وەکو هەموو ئەو ئازیزانەی کە مەرگ بەربینگی پێگرتوون، لەم یاسای سروشتییە بەدەرنیە، هەروەکو ئێمەش ناتوانین لێی بەدەربین، بۆیە پێویستە دایك و باوك و خوشك و براو منداڵەکانی،

ئارام و فەرامۆش بن، پەراگەندەکانی خەمەکانیان بکەن و بەرگی ماتەم نەکەن بە یارو یاوەری درێژخایەنی خۆیان. ئەوەندەی ئێمە ژیانمان لەگەڵ ئەو پیاوە شۆڕشگێڕ و کوردپەروەرەدا بەڕێکردووە، وامان هاتۆتە بەرچاو کە نمونەی بەرزی ڕەوشتی پاك و بێگەرد بووە و هەمیشە دورەپەرێزی کارە خراپەکان بووەو بۆ چاکەی نێو کۆمەڵ لە زۆر شوێن جێگا پەنجەی دیارە.

لەو ڕۆژەوە کە بیری کردۆتەوە هەستی بەژێردەستەیی گەلەکەی کردووە، کادیرێکی چاکی ماندوونەناسی ڕێبازی ڕەوای نەتەوایەتی و مرۆڤایەتی بووە. نەتەوایەتی لەلای ئەو، بەرزترین هەستی مرۆڤ بووە، هەر لەو پەنجەرەیەشەوە تەماشای مرۆڤایەتی کردووە و مرۆڤدۆستی بەلاوە پیرۆزبووە.

یەکێك لە تایبەتیەکانی ئەو پیاوە ئەوەبوو، تاکو دوژمنان دڕەندەتر دەبوون، ئەو ڕۆژانی نەمانیانی بەنزیکتر دەزانی لە ڕۆژانی ڕەش و بێهیوایدا، خۆری ڕزگاری لەلای ئەو، بەرز و گەش و درەوشاوەتر تیشکی سەرکەوتنی پەخشان دەکرد و گڕوتینی برادەرانی نوێ دەکردەوە.

زۆرن ئەوانەی تەنیا بۆ خزمەتی بیروباوەڕی پاکی نەتەوایەتییان ژیان، نەکو بۆ چڵێسی و چاوچنۆکی و...،...، زۆرن ئەوانەی زۆریان کردووە کەمیان بە بەرکەوت، بەڵام بە ویژدانی ئاسودەوە کۆڕی خەباتیان بەجێهێشت و لەدوای مەرگیان، هیچ کەسێك خراپەیەك نادۆزێتەوە تاکو بەگوێی نەیارێکیدا بچرپێنێ.

مامۆستا خالید، ئەو کادیرە بە وەج و شۆڕشگێڕە بوو کە لە مەیدانی کوردایەتیدا شاسوارێکی دیار و لێوەشاوە بوو، ئەوەندەی بۆیکرابێ و لەتوانایدا بووبێ، لەپێناوی ڕزگاری وڵاتەکەیدا کردویەتی، هیچ کاتێك شەرمەزاری ویژدانی خۆی نەبووە و هەتا ئەو ڕۆژەی گیان و جەستەی لەیەکتر جیابوونەوە، هەر بە نەهجی پیاوە دڵسۆزەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کاری کردووە، نە درۆیەکی لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کرد، نە فێڵێك، نە...، بۆیە، کە کۆچی دوایی کرد، وەکو ئیمامی عەلی و ئەبوزەڕی غەفاری، هیچ جۆرە سامانێکی لەدوای خۆی بەجێنەهێشت.

ئێستاش ئەمڕۆ چل ڕۆژە هاوڕێی خۆشەویستی کۆچکردومان لەباوەشی دایەزەمینی دایەگەورە و بەئەمەکماندا ئارامی گرتووە و پێڵوی چاوەکانی لەسەریەك داناوە و بە ئاسودەییەوە بۆ هەتا هەتایە سەر پڕ لە حەسرەت و ئاواتی لەسەر سەرینی بەردینی سنورداری کۆتایی ژیان، داناوە و ئێستا ڕۆمانسیانە کۆماری کوردی وەکو کۆمارەکەی ئەفلاتونی لە خەیاڵی گیانیدا نەخشکردوە، ئێمەی هاوڕێیانی ئەو تێکۆشەرە، گەلێك سوپاسی مردن دەکەین کە زۆر بێویژدانی لەگەڵ نەکردین و هەر بەشی خۆی کە بەجەستەی

مامۆستا خالید بوو، بردی و ئێمە و یادگارە جۆربەجۆرەکانی، پێکەوە هێشتەوە، ئێمەش ئەو یادگاریانە دەکەینە وێنەی نێو دڵ و بەردیدە و وێردی زمان و، میدالی شانازی، تاکو ئەو ڕۆژەی دەبینە میوانی ئەو کوردپەروەرە تێکۆشەرە.

بلغ سلامی علی من غاب عنی جماله
وما غاب عن قلب الحزين خياله[1]

---

١- سەرچاوە: گۆڤاری زنار، ژ٢، ساڵی ١٩٩٩، ل٨١-٨٢-٨٣-٨٤. گۆڤاری زنار، گۆڤارێکی وەرزی ڕووناکبیری گشتی بوو، لەشاری قەڵادزێ دەردەچوو، تەنها ٣ ژمارەی لێدەرچوو، مامۆستا زیاد لە هەرسێ ژمارەکەدا ئەندامی دەستەی نووسەرانی بووە. ژ١ لە تەمووزی ١٩٩٩ و، ژ٢ لە تشرینی دووەمی ١٩٩٩ و، ژ٣، کە کۆتا ژمارەی بوو، لە ساڵی ٢٠٠٠ دەرچووە، (ئامادەکاران).

**وتەیەك**

دوای پرس و سۆراغێکی زۆر، بۆ ئەوەی زۆرترین ئەو چاوپێکەوتنانە کۆبکەینەوە، کە لەگەڵ ڕەوانشاد مامۆستا زیاددا ئەنجامدراون، تەنیا ئەو شەش دانەیەمان بۆ پەیدابوو کە دیداری هەمەلایەنەی تێرەتەسەلن. لە میانی گەڕانماندا، بیستمان کە لە هەردوو کەناڵی تەلەفزیۆنی (کەی ئێن ئێن) و (گەلی کوردستان)یش، یەکەی یەك دیمانە هەیە، بەڵام وەك خۆیان باسیان کرد، یەکەم/ دیدارەکان لەنێو ئەرشیفی کۆندا، تا ڕادەیەك بزر بوون و دیتنەوەیان ئاسان نییە! دووەم/ لە حاڵێکدا ئەگەر دۆزراشنەوە، دیمانەکان بەتەنیا و تایبەت لەگەڵ مامۆستادا سازنەکراون، بەڵکو چەند کەسایەتییەکی ئەدەبی و فۆلکلۆرین و بە بەشداری مامۆستا زیاد، پێکەوە قسەو گفتوگۆ دەکەن و، لەوەیە ئەو قسانەی کە مامۆستا لەوێدا کردوونی، بەهۆی کەمیەوە، بۆ نووسینەوە دەستنەدەن.

بەهەرحاڵ، ئەوەی تا ئەم ساتەیش بۆمان پەیداکران و وەك خۆیان نوسیماننەوە، ئەوانەی خوارەوەن. وە پێشمان وایە، بەهۆی ئەوەی کە مامۆستا، وەك سەرچاوەیەکی کەلەپووری و فۆلکلۆری بووە و جێی بایەخ بووە بۆ کەسانی لێکۆڵەری تایبەت بەو بوارە، هێشتا دیمانەی دیکەش هەبن کە کەسان و لێکۆڵەران، تایبەت و بۆ ئەرشیفی خۆیان ئەنجامیان دابن، بەو هیوایەی ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئەوانیش بێنە بەرچرایە!

دیدارەکانیشمان بەپێی ڕێکەوت و بەروار ڕیزکردوون: لە کۆنترینیانەوە بۆ دواییینیان.

**دیدارەکان**

١–دیداری عومەر پەتی، بۆ کتێبی (فۆلکلۆرپەروەران) ١٩٩٢
٢–دیداری بوار نورەدین، بۆ کتێبی (ئەستێرەی سوور) ٢٠٠٨/٥/٢٨
٣–دیداری ئارارات ئەحمەد، بۆ کتێبی (قوتووی عەتار – قوتووی چوارەم) ٢٠٠٨/١٢/٢٦
٤–دیداری سامان عومەر سەیدگوڵ، بۆ تۆژینەوەی زانکۆ ٢٠١٠/١٢/٣٠
٥– دیداری مۆفەق میراودەلی، تایبەت بە ئەرشیفی خۆی ٢٠١٤/١٢/١
٦–دیداری محەممەد مەردان، بۆ کتێبی (٢٥ فۆلکلۆریست) ٢٠١٥/٢/٨

## زیاد محەممەد ئەمین (م. زیاد[1])
## دیداری: عومەر پەتی

**پرسیار: کورتەیەکی ژیان و بەرهەمی چاپکراو، وتاری بڵاوکراوەت لە چەند دێڕێکدا بۆ خوێنەران دەربڕە؟**

وەڵام: لە ساڵی ١٩٣٨ لە گوندی (بنگرد)ی دەشتی مەرگە لە دایك بووم، لە شاری سلێمانیش بە تەواوکردنی ناوەندیی و خانەی مامۆستایان کۆتاییم بە ژیانی قوتابیەتی هێناوە.

وەکو پەرتووك، هیچ بەرهەمێکی چاپکراوم نییە، بەڵام بە گوێرەی توانا، جار جارە لە نێو گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بەرهەمم وەدەردەکەون.

**پرسیار: ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسی کوردی لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی فۆلکلۆری و پاراستنی کەلەپووری نەتەوایەتیماندا چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

وەڵام: بە بۆچوونی من، لە هەشتاکانەوە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ڕۆڵێکی گرنگیان لە گیان وەبەرنانەوەی فۆلکلۆر گێڕاوە.

**پرسیار: بە ڕای ئێوە، دەستکاری فۆلکلۆر بکرێت یا نا؟ ئەگەر بکرێت، چۆن؟**

وەڵام: فۆلکلۆری وێژەیی، لە هەستێکی قووڵی دەروونەوە هەڵقوڵاوە، سروشتی جوانی کوردستان و کارەسات و ئاشووبی بە درێژایی مێژوو ئەم وڵاتەیان کردووەتە دانشگایەکی فراوان و پێشکەوتووی ژیان، کەسەکانیش بە ئارەزووی خۆیان کۆلێژیان تێدا هەڵبژاردووە و بە ئیشقەوەش کاریان تێدا کردووە، هەر بۆیەش بەرهەمەکان ئەوەندە بەهێز و پێزن کە پاشی سەدان ساڵ هەر بەکەڵکن، بۆیە لەسەر ئەو ڕایەم کە فۆلکلۆر تێکنەشکابێت، بە تێکشکاوی لەدایك نەبووە. ئەگەر بابەتێکمان بەتێکشکاوی دیت، بێگومان لە ئەنجامی دەماودەمی تووشی ئەو شکستییە بووە، شتی شکاویش پێویستی بە چاککردنەوە هەیە، بۆیە لەسەر ئەو باوەڕەم کە لە شوێنی پێویستدا فۆلکلۆر دەسکاری بکرێت، بەڵام چۆن؟

أ- هەروەکو چۆن زمانەکەمان زاراوەی جۆراوجۆری هەیە، فۆلکلۆرەکەشمان زادەی

---

١- ئەم چاوپێکەوتنە، لە پاشکۆی ڕۆژنامەی (عێراق) ڕۆژی ١٩٩٢/٢/٢٨، ژمارە ١٨٢، بڵاوکراوەتەوە. پاشان لە ساڵی ٢٠١٧، لەگەڵ کۆمەڵێك دیداری دیکەدا، کە هەموویان دیداری فۆلکلۆری و کەلەپوورین، لە کتێبێکدا بە ناوی (فۆلکلۆرپەروەران - د. عومەر پەتی) لە ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد، بە چاپی گەیاند. (ئامادەکاران)

زمانەکەمانە و لەبەرئەوە من وای بەباش دەزانم کە بۆ هەر شێوە زمانێك، لیژنەیەك لە شارەزایانی فۆلکلۆری ئەو زمانە دابنرێت.
ب ـ گەڕان بە دوای دەقی جیاجیای یەك بابەتدا و بەراوردکردنیان و فڕێدانی خراپ و چاکخستنە جێگای، هەتاکو ئەو ڕادەیەی کە بە باوەڕی هەمووان دەقە ڕەسەنەکەی دەرچووە.

**پرسیار: لە سەردەمی ئەمڕۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیادا فۆلکلۆر چۆن دەبینرێت؟**
وەڵام: لە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیادا کەرەستەی تازە بەناوی تازەوە دێتە پێشەوە، لەبەرئەوەی کە ئەو کەرەستانەش لە کوردستان دروست ناکرێن، ناوەکانیان ناوی ناکوردیە، ئەوەش دەبێتە هۆی لاوازی زمانەکەمان؟ چونکە هەر کەرەسەیەکی کوردی کە باوی نەما، ناوەکەشی نامێنێت.

**پرسیار: سوودوەرگرتن لە فۆلکلۆر لە ئەدەبی نووسراوی ئەمڕۆماندا چۆن خۆی دەنوێنێت؟**
وەڵام: فۆلکلۆر ژێرخانە و ئەدەبی نوێ، نهۆمی سەرەوەیەتی. ئەدەبی نوێ، لە زۆر بارەوە کەڵك لە فۆلکلۆر وەردەگرێت، وەکو، وشە، هێنانەوەی خاڵان (مثال)، هەژاندنی دەروون، ئاگاداربوونی ڕادەی زیرەکی باپیران و جۆری ژیانیان... دیارە کە ئەم بوارانەش لە ئەدەبی ئەمڕۆدا دەبیندرێن.

**پرسیار: ئایا ڕەخنەی فۆلکلۆرییمان هەیە، هەروەکو لە بوارەکانی دیکەی وێژەدا دەبینرێت؟**
وەڵام: کورد هەتا ئێستا فۆلکلۆرێکی کۆکراوەی یەکگرتووی لێکۆڵراوەی نییە، هەر بۆیەش ڕەخنەی فۆلکلۆرییمان نییە، ئەوەی کە هەشمانە، لە نێوانی فۆلکلۆریستەکانە کە ئەم دەقە لەلای ئەم، وایە و لەلای ئەو، جۆرێکی دیکەیە.

**پرسیار: بە ڕای ئێوە، پێویستە کاری فۆلکلۆرکۆکردنەوە یان لێکۆڵینەوە لە فۆلکلۆر لە پێشتر بێت؟ یان هەردووکیان وەك یەك گرنگن؟**
وەڵام: بە ڕای من وای بەباش دەزانم کە کۆکردنەوە لە پێشەوەی هەموو کارە وێژەییەکانی فۆلکلۆریستانەوە بێت.
سامانی کەلەپووری کوردی سامانێکی فرەی لەبننەهاتووە. وای بەباش دەزانم کە ژێر

چاوەدێری لێژنەیەك بكرێت بە كتێب و بە بەرگی یەك لە دوای یەك بە چاپ بگەیەنرێت ئینجا بخرێتە ژێر پێنووسی لێكۆڵینەوە و یەكالاكردنەوە.

**پرسیار: هاوبەشی یان لێكچوون و جیاوازی لە نێوەرۆكی فۆلكلۆری گەلاندا چۆن لێك دەدەیتەوە، وەك: گۆرانی، ئەفسانە، پەندی پێشینان...هتد؟**

وەڵام: هەر فۆلكلۆرێك ئاوێنەی باری ژیانی كۆمەڵگای ڕابردووی خۆیەتی، فۆلكلۆری گەلێكی ژێردەستە و دواكەوتوو، جیاوازی هەیە لەگەڵ فۆلكلۆری گەلێكی ئازادی پێشكەوتوو. بەڵام لە بارەگشتییەكەوە، لە نێو هەموو گەلاندا هەر یەكە و بەگشتی ژیانی دێرینی ئادەمیزاد لە تافێكی دیاریكراودا پیشانمان دەدات، لەیەكچوون و هاوبەشی لەنێوانی گەلاندا هەیە، چونكە فۆلكلۆر لە ئەنجامی گیروگرفت و ئەندێشە و خۆشیی و ناخۆشیە هاوبەشەكانی بەرەو پێشەوەچوونی تێكڕای گەلان هاتووەتە كایەوە.

**پرسیار: دواپڕۆژەی فۆلكلۆرییت چییە؟**

وەڵام: دوو شاییەكەی (عەلی بەردەشانی) دوا پڕۆژەی فۆلكلۆریمە[1].

**پرسیار: بە ڕای تێوە چۆن ئەو گەنجینە بەنرخە نەتەوایەتیەمان دەپارێزین؟**

وەڵام: لێهەڵماڵینی قۆڵی مەردانەی فۆلكلۆریستان و كردنی بە كتێب، ئەم گەنجینەیە نەتەوایەتیەمان دەپارێزێت.

**پرسیار: هیوا و ئاواتی فۆلكلۆرییت چییە؟**

وەڵام: هیوادارم كە ڕۆژێك بێت داستانی فۆلكلۆری كوردی، وەكو فلیمی سینەما خۆی پیشانی جەماوەر بدات.

---

١ ئەو ڕۆژگارەی كە دیدارەكەی تێدا سازدراوە، مامۆستا زیاد، جگە لە بابەتی بڵاوكراوە لەنێو ڕۆژنامە و گۆڤاراندا، هیچ بەهەرمێكی وەك كتێب بەچاپ نەگەیاندبوو، لۆیە لێرەدا وای وەڵامداوەتەوە. بەڵام دواتر ساڵی ٢٠٠٣ كە ئینستیتیوتی كەلەپووری كورد، بە ڕابەرایەتیی مامۆستا مەزهەر خالقی دروست بوو، یەكەمین كتێبی (دیوانی عەلی بەردەشانی) دوو جار چاپ كرا، چاپی یەكەم ساڵی ٢٠٠٦ و چاپی دووەم ساڵی ٢٠١٥، دواتریش هەموو كتێبەكانی دیكەی، كە لەم كتێبەدا باسیان لێوەكراوە و ناسێنراون، هەر لەو دەزگایە بەچاپگەیشتوون. (ئامادەكاران)

## زیاد محەممەد ئەمین ئەحمەد[1]
## دیداری: بوار نورەدین

لە ساڵی ١٩٣٨ لە ناوچەی بنگرد- دەڤەری مەرگە، لە دایکبووە. خوێندنی سەرەتایی لە بنگرد تەواوکردووە، خوێندنی ناوەندی و خانەی مامۆستایانی لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٦١ تەواوکردووە و لەم شوێنانە مامۆستا بووە: گوندی کانی تووی بنگرد، قەڵادزێ، عەممارە، سلێمانی، کرماشان، هەولێر، ڕانیە. زۆربەی ژیانی لە قەڵادزێ بردووەتە سەر. لە دوای ڕاگواستنی قەڵادزێ هاتووەتە ئۆردووگای (دارەتوو)ی نزیك هەولێر. لە دوای ڕاپەڕینەوە ماڵی لە ڕانیەیە و ئێستا خانەنشینە.

**پ/ ساڵی چەند پەیوەندیت بەڕێکخراوی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە کرد؟**

و/ لە دوای شۆڕشی ئەیلول، لەمانگی ٢ی ١٩٧٦ برادەرێك هات بۆ لام، کە خەڵکی بنگرد بوو، بەڵام لەسەنگەسەر دادەنیشت، ناوی کاك (قادری سۆفی خدر) بوو، هاتە قەڵادزێ و قسەی لەگەڵ کردم و چووینەوە بۆ ماڵی خۆمان و بۆی باسکردم کە ئەو پەیوەندی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە و گوتی: تۆ بۆچوونت چۆنە؟ منیش گوتم: لەمێژە بۆ ڕێکخراوێکی وا دەگەڕێم، بەڵام تاکو ئێستا کەس پەیوەندی پێوە نەکردووم، بۆیە من ڕازیم و ئیشت لەگەڵ دەکەم. ئیتر لەوکاتەوە، پەیوەندیم بەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کرد و یەکسەریش بەئەندام وەرگیرام.

**پ/ ئەو ڕێکخراوەی جەنابتان کارتان لەگەڵ دەکرد، دەزانی ناوی چی بوو؟**

و/ ئەوەندەی لەبیرم بێت، ناوی (ڕێبەندان) بوو.

**پ/ چەند کەس بوون لەو ڕێکخراوەدا؟**

و/ من تەنها کاك قادرم دەناسی، ئەوانی ترم نەدەناسی.

---

١- ئەم چاوپێکەوتنە، سەر لەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە، ڕێکەوتی ٢٠٠٨/٥/٢٨، لەسلێمانی لەلایەن (بوار نورەدین)، بۆ کتێبی (ئەستێرەی سوور) کە تایبەتە بە ڕێکخستنە نهێنیەکانی (کۆمەڵەی ڕنجدەرانی کوردستان) لە سنووری پشدەر، ئەنجامدراوە و نووسراوەتەوە. وەك بەشێك لە پرۆژەی ئامادەکردنی ئەم کتێبە، ڕامانگواستە ئێرە. (ئامادەکاران)

ئەستێرەی سوور: ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە: بوار نورەدین، چاپی یەکەم بە دوو بەرگ ٢٠٠٩، چاپخانەی حەمدی - سلێمانی. چاپی دووەم بە یەك بەرگ، ٢٠١١ چاپخانەی کارۆ - سلێمانی.

**پ/ ناوی نهێنیت چی بوو؟**

و/ من دوو سێ جار ناوم گۆڕاوە، لەڕێکخراوی ڕێبەندان ناوم (ڕێبوار) بوو، بەڵام لەپێش ڕاپەڕین ناوم بوو بە(دەریا).

**پ/ هەر پەیوەندیت بەکاک قادرەوە هەبوو؟**

و/ بەڵێ تەنیا ئەوم دەناسی، هەر ئەویش کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی لەناوچەکەدا، بەڕێوە دەبرد. کاک قادریش پەیوەندی بەپیاوێکەوە هەبوو لەسلێمانی کە (یاریدەدەری پزیشکی) بوو، ئەوەندەی لەبیرم بێت ناوی کاک (عەبدوڵلا تۆفیق) بوو. دواتر لەڕێکخراوی (ڕێبەندان) دوورکەوتمەوە و شانەیەکیان دامێ، بەڵام ناوی شانەکەم لەبیرنەماوە. خەڵك هەر وایدەزانی کە تەنیا بەعسی نیم، نەیان دەزانی کە ئیش بۆ کۆمەڵەی ڕەنجدەران دەکەم.

**پ/ لە شانەکەت کێت لەگەڵدا بوو؟**

و/ ئەو کەسانەی کە لەگەڵم بوون: کاک جەبار ناوێك بوو کە خەڵکی سەنگەسەر بوو، کاک بارزان فەتحوڵلا، کە ئەویش سەنگەسەری بوو، دکتۆر کاوە عەبدولڕەحمان کە ئێستا لەهەولێرە. لەدوایدا بارزان ماوەیەك بۆ کۆبوونەوە نەدەهات، کە پرسیم بۆ دیار نییە؟ گوتیان: بارزان بۆ دەرەوە چووە و لە(ئێران)ـە.

**پ/ پەیوەندیت بەکاک لوقمان حوسێن مەحموودەوە چۆن دروستبوو؟**

و/ دراوسێ بووین، هەردووکیشمان ئاگاداری بۆچوونی یەکتر بووین، هەروەها دڵنیایی لەنێوانماندا هەبوو.

**پ/ ئەوەندەی جەنابتان ئاگادار بن، کێ سەرپەرشتی خۆپیشاندانەکەی ١٩٨٢ی کرد؟**

و/ کاکەمین و شەهید محەممەد سوڵتان[1]، سەرپەرشتیان دەکرد.

**پ/ ئێوە وەك شانەکەتان چ ڕۆڵێکتان لەخۆپیشاندانی قەڵادزێدا هەبوو؟**

و/ کە بڕیاری خۆپیشاندان دەرچوو، ئێمە وەك لێپرسراوی یەکەم نەهاتینە پێشەوە، بۆئەوەی ئاشکرانەبین، ئەوەی کە زۆر ئاشکرابوو، کاکەمین و مامۆستا محەممەد سوڵتان بوون.

---

١- مامۆستا محەممەد سوڵتان کەسایەتییەکی دیار و دڵسۆز و چالاکی نێو ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگە بووە، کە بەڕاستی شایەنی هەڵوێستە لەسەرکردن و باسوخواسە... بەداخەوە لە ١٩٩٣/١٢/٢٠ لە شەڕی براکوژیدا، لەنێو کۆمیتەی ڕانیەدا بە دیلی گوللەبارانکرا...

**پ/ دوای خۆپیشاندانەکە، قەڵادزێ زۆربەی بەدەست خەڵك و هێزی پێشمەرگەوە بوو، ئەو کاتەدا شاسوارت نەناسی؟**

و/ نەخێر، تەنیا یەك دوو جارێك دیومە.

دواتر کاك محەممەد سوڵتان و مامۆستا عەبدە[1] و کاکەمین چوونە دەرێ، من بووم بەلێپرسراوی شانەکەی خۆم. دواتر تەنیا دوو کەسم مابەوە، کاك لوقمان حوسێن و کاك مستەفا مەلا عەبدوڵڵا. لەوکاتەدا من پێموابوو کە لوقمان تەنیا لەگەڵ من ئیشدەکات، توومەز لەگەڵ شاسواریشدا ئیشی کردبوو و لەلای من باسی نەکردبوو، بەڵام لەکاتی دانوستانەکانی یەکێتی نیشتمانی لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا، کۆمەڵێك ئاشکرابوون. لەو ماوەیەدا، من، کاك مستەفا سەید قادرم دیت. هەروەها مامۆستا محەممەد سوڵتان و مامۆستا سەعید، زۆرکات بۆ ماڵی ئێمە دەهاتن... دوای دانوستانەکان، کاك مستەفا سەید قادر داوای کاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵای لەمن کرد، گوتم: ناکرێت. گوتی: کاکە ئەو برادەرە وریایە و ئێمە پێویستیمان پێیەتی، ماوەی ساڵێك لێیان ستاندم و دوایی داوام کردەوە.

**پ/ وەك لێپرسراوی شانەیەك یان وەکو کەسێکی باوەڕپێکراو، داوایان لێنەکردی کە ئابوونە و یارمەتی بۆ شۆڕش کۆبکەیتەوە؟**

و/ بەڵێ من یارمەتیم کۆدەکردەوە و مانگانە دەمنارد.

**پ/ لەکێت وەردەگرت؟**

و/ جاری وابوو بۆخۆم، جاری وابوو کاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵا بوو، جاری وابوو لەکاك حەمیدی میرزا سەعیدم[2] وەردەگرت. دەمەوێ خاڵێکی گرنگت پێ بڵێم کە حاجی سەعیدی ڕەسام کە من نەمدەزانی ئاوایە، هەروەها حاجی سێمانی نورەدینی، هەردووکیان برادەربوون، ئەو حاجی سەعیدی ڕەسامە، بڕوام پێبکە، کادرێك بوو، کە بەدە کادر نەیاندەتوانی کارەکەی ئەو بکەن... حاجی سێمانی نورەدینیش هاوڕێی بوو، ماڵێکی لەنورەدین و ماڵێکی لەقەڵادزێ بوو. هەمیشە شتی بۆ نورەدین و لەوێشەوە بۆ گەرمکان، بۆ دەبردین. حاجی سەعیدی ڕەسام، دوکانی وێنەگرتنی هەبوو، کە هەواڵێکی یەکجار زۆر

---

١- مامۆستا عەبدوڵڵا ساڵح ناسراو بە مامۆستا عەبدە، یەکێك لە کەسایەتییە ڕۆشنبیر و سیاسییەکانی نێوچەی پشدەر بوو، لەساڵی ١٩٨٢ بووە بە پێشمەرگە و یەکێك لە دامەزرێنەرانی تیپی ٦٣ی جووتیاران - یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بووە، لەدوای دانوستانەکانی (١٩٨٣-١٩٨٤)ی نێوان ی. ن. ك، و ڕژێمی بەعسدا گەڕاوەتەوە شار. ئێستا لە دەرەوەی وڵات (بریتانیا) نیشتەجێیە.

٢- ئەویش یەکێك لە پیاوماقوڵانی شاری قەڵادزێ و کەسایەتییەکی کوردپەروەر بوو، بەتایبەت بۆ (ی.ن.ك). ئێستا لە هەولێر- دارەتوو نیشتەجێیە، بەڵام بەداخەوە نەخۆشە...

دەچووە لای، ئیدی هەر کەسێك کە دەبووە چەکداری ڕژێم و هەر فەوجێك دەکرایەوە، بەزۆری لەلای ئەو وێنەی دەگرت، حاجی سەعید لەکاتی گرتنی وێنەکەدا پرسیاری لێدەکرد و دەیخافڵاند و ئەگەر وێنەکەش تەواو بووبایە، نەیدەدایەوە هەتا بەتەواوی پرسیاری لێدەکرد: ئەو فەوجە کەی کراوە؟ کێ ئامر فەوجە؟ کێ موساعیدی ئامر فەوجە؟ چەند سریەیە؟ کاریان چییە؟ مقەڕیان لەکوێیە؟ ئیدی هەموو شتێکی تەواوی لێوەردەگرت و تەسلیمی منی دەکرد، یان حاجی سێمان بۆی دەگەیاندین، یان لەڕێگەی ڕێبازێکی تایبەتی خۆم کە (بنگرد) بوو، دەمگەیاند. کوڕە خاڵێکیشم لەگەڵ بوو، ناوی عومەر زێندین[1] بوو، ئەویش لەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کاری دەکرد، هەندێك جار بۆخۆم شتەکانم بۆ بنگرد دەبرد؟ چونکە لەوێ ناسیاوم زۆربوو. هەندێك جاریش لەسەری تووشی کێشە دەبووم. ئیتر هەرچییەك هەبوایە، لەبنگرد دەمدایە عومەر و ئەو بۆی دەناردم، کوڕە خاڵەکانیشم هەر لەوێ بوون، کاك حەمە جەزا لەوێ بوو، ئیدی ئەوان دەیاندا بەسەرەوە.

**پ/ بۆ لای کێت دەناردەوە؟**

و/ ئەو کاتە کۆمیتە نەبوو، کەرتی ڕێکخستن هەبوو، ئەوانەی کە لەوێ بوون: مامۆستا محەممەد سوڵتان، مامۆستا سەعید، کاك مستەفا سەید قادر، ئیدی ئەو کۆمەڵە ئیش و کارەکانیان بەڕێوەدەبرد و شتەکان بۆ لای ئەوان دەچوو، هەندێ جاریش بۆخۆم دەچووم.

**پ/ بەشداری کۆنفڕانسی کۆمەڵە، یان هیچ کۆبوونەوەیەکت لەدەرەوە نەکردووە؟**

و/ نەخێر ئەو شتانەم هیچی نەکردووە.

**پ/ بێینەوە سەر ئەو کەسانەی کە یارمەتی شۆڕشیان داوە؟**

و/ حاجی سەعیدی ڕەسام، دلێری کوڕی، کوڕەکەی کەیان (غەریب) ئەوەی بەتۆپی ئێران شەهیدبوو، لەو کاتەدا ئابوونەی من، مانگ هەبووە گەیشتووەتە ١٠٠ دینار، هەرچەندە تا ئێستاش لەبیرمە کە کیمیابارانەکەی دۆڵی جافایەتی کرا، زۆر سەخت بوو، برادەران هەڵاتن و چووبوونە دۆڵەکۆگە[2]، لەو کاتەدا یارمەتییەکەی من گەیبیشتبووە دۆڵەکۆگە و ئەوان نەگەیشتبوون، مامۆستا محەممەد سوڵتان ئەوەی پێ سەیر بوو بوو...

---

١- ئەو ڕێکەوتە (٢٠٠٨) ئەندامی بەش بوو لەمەڵبەندی هەشتی ڕاپەڕین و ساڵانی دواتریش بەرز بووە بۆ پلەی کارگێڕی.

٢- دۆڵەکۆگە: دەکەوێتە قەدپاڵی چیاکانی: سادر، چەکوچ، سەری جاسووسان. بەدیوی پشدەریشدا نزیکە لەگوندی سێوەیس بەرامبەر گوندی سونێ.

**پ/ چالاکییەك یان ڕووداو و بەسەرهاتێكی ئەو سەردەمە كە لەبیرت مابێت؟**

و/ ڕۆژێكیان لەناوەندی وانەم هەبوو، بەدوامدا هاتن، وەستا بەكری برای كاك ئەحمەد بچكۆل هات و گوتی: مامۆستا ئیشم پێتە. منیش گوتم: چییە، بۆ هاتووی بۆ ئێرە؟ ئەویش گوتی: دەبێت ئەمشەو بێیە ماڵی ئێمە. گوتم: مەسەلە چییە؟ گوتی: یەك دوو برادەر پێیان خۆشە چاویان پێت بكەوێت. منیش گوتم: ئاخر پێنازانم و بەشەو چوونە دەرەوە قەدەغەیە. ئەو گوتی: خەمت نەبێت، بۆخۆم دێم بەدواتدا. ئیدی شەوێ بۆ ماڵیان چووم، كە شەوێكی زۆر سارد بوو، كە چوومە ژوورێ، تەماشام كرد كاك مستەفا سەید قادر و كاكە مین لەوێ دانیشتبوون، كە چاوم پێیان كەوت، ترسام و شتێكی دیكە بەمێشكدا هات! گوتم: ئەمانە هەموو نهێنییەك دەزانن، كە ئەمانەش هاتبنەوە خۆیان تەسلیم بكەنەوە، ئەوە زۆر خراپە؟! ئەوانیش كە زانییان بیر لەشتی وا دەكەمەوە، گوتیان وەرە دانیشە ئەو شتەی بیرت لێكردووەتەوە، وا نییە. ئیتر لەگەڵیان دانیشتم و گوتیان: بەهۆی ئەو زەبرە زۆرەی حكومەت و كوشتنی كادرەكانمان و دەستگیركردن و هەڵاتنیان و كۆمەڵێك شتی دیكە... ڕێكخستنەكانمان تێكچووە، ئێمە هاتووینەوە، دەمانەوێ ئەو كارانە ڕێكبخەینەوە؟ چونكە سەركردایەتی ئێمەی ناردووە... ئەوانەی باسی دەكەم ساڵی ١٩٨٨ بوو. ئیدی گوتیان: دەمانەوێ ڕێكخستن گرێ بدەینەوە، بەتایبەت لەهەولێر كە زۆر بەربڵاوبووە، لەبەرئەوە دەمانەوێ ئەركێكت پێ بسپێرین، منیش گوتم: ئەركەكەم چییە؟ ئەوانیش گوتیان: دەبێت پۆلی قەڵادزێمان بۆ بەڕێوەبەریت. منیش گوتم: پۆلی قەڵادزێم بۆ بەڕێوەناچێت. ئەوانیش گوتیان: بۆ پێت بەڕێوەناچێت؟ منیش گوتم: لەبەر مامۆستایەتییەكەم، ئەگەر پۆلی قەڵادزێ بەڕێوەبەرم، ئاشكرادەبم. گوتم: ئەو خەتەی كە بۆ خۆم هەمە، لەو خەتە زیاتر نە خەتی دیكە وەردەگرم، نە كاری دیكەش دەكەم. گوتیان: زۆر باشە، مادام وایە، تۆ هەر برادەرەكانی خۆت و خەتەكەی خۆت بەڕێوەبەرە.

**پ/ نەتزانی كێ ئەو پۆستەی وەرگرت؟**

و/ نەمزانی؟ چونكە پەیوەندییەكی وام بەپۆلەوە نەمابوو، زیاتر كارە تایبەتەكەم وای لێهاتبوو كە بە كەرتی ڕێكخستنی قەڵادزێ لە شاخ، پەیوەستبم؟ چونكە كارەكان بەو شێوەیە بۆ من ئاسانتر بوون، لەبەرئەوەی خزم و كەس و كارم لەبنگرد بوون.

**پ/ هێشتا تۆ وەكو ڕێكخراوەیی شاسوارت نەناسیبوو؟**

و/ نەخێر، لەهەولێر شاسوارم ناسیوە.

**پ/ لەسەر شەهیدکردنی کاك فاروق، ئاگات لەچییە؟**

و/ شەهیدکردنی کاك فاروق، ئێمە پێمان گوترابوو کە کۆمەڵێك کەس دەکوژرێن، بەڵام حکومەت نایەوێت لەسەر خۆی ئیسپاتیان بکات، ئینجا ئیدی بەگرتن بیانگرێت و ئینجا بیانکوژێت، یان بەکەسی نادیار (فاعیل مەجهول)؟ یەکێك لەو کەسانە: من، کاك قادری سۆفی خدر، میرزا باپیر، فاروق و کۆمەڵێك کەسی دیکە بوون. بەڵام یەکەم کەس کە بەرکەوت، فاروق بوو، کە فاروقیش بەرکەوت، بارودۆخەکان، شڵەژان... لەدوای ئەوە، بۆ پارێزگاریکردن لەخۆمان، دەمانچەیان بۆ ناردین، جۆری (مەکاریۆف)ی ڕووسی بوو. دەمانچەکەی من، مامۆستا خالید[1] بۆی هێنام، بەینێکیش لەگەڵ مامۆستا خالید بەیەکەوە ئیشمان کردووە.

**پ/ لەگەڵ شەهید فاروق ئیشت نەکردووە؟**

و/ نەخێر، تەنیا متمانەمان بەیەك هەبوو، وەکو ڕێکخستن نەخێر، لەگەڵ ئەو نەبووم.

**پ/ وەکو بزانی شەهید فاروق کۆمەڵە بوو یا خەتی گشتیی بوو؟**

و/ خەتێکی تایبەتی هەبوو کە پێم وابێت سەر بەخەتی گشتی و پەیوەندی بەهەڤاڵ مام جەلالەوە بوو، بەڵام فاروق کوردانە ئیشی دەکرد و زۆر بەغیرەت بوو، پیکابێکی لاندکرۆزی بەڕێوەبەرایەتی کارەبای قەڵادزێی پێبوو (شلەخەجێیەکی سپی بوو)، حەقە ئەو سەیارەیە لە شوێنی تایبەت هەڵبگیرێت؟ چونکە کاری زۆری پێکراوە... هەتا ڕۆژێکیان گوتی: مەجلیسی تەشریعی و تەنفیزی دادەمەزرێت، لەسەرەوە ناوی تۆ هاتووە و دەبێت بچیتە ئەنجومەنی حکومەتەوە. گوتم: لەکوێوە بۆتان هاتووە؟ گوتی: لەسەرێوە دەستنیشانیان کردوویت. فاروق لەگەڵ کاك حوسێنی حاجی برایمی[2] بەیەکەوە بوون؟ چونکە ئێمە هەرچەندە یەك ڕێکخستن نەبووین، بەڵام هەر لەکۆنەوە یەکترمان دەناسی و سیقەمان بەیەکتر هەبوو. منیش گوتم: باشە بۆ، من خەتی خۆمم هەیە، بۆچی لەڕێگەی خەتی خۆمەوە ئاگادار نەکراومەتەوە؟ گوتی: بۆ ئێمە هاتووە. منیش چووم بەلوقمانم گوت، کە شتێکی وا بووە. گوتی: بەدواداچوونت بۆ دەکەم. دوایی هاتەوە، گوتی: لەخەتی من شتی وا نییە. منیش گوتم دیارە ئەوە بۆ خۆیان ئەو شتەیان گوتووە، کە کەسێك بچێتە

١- مامۆستا خالید محەممەد، ناسراو بە مامۆستا خالیدی حاجی محەممەدی هەللاج، لەساڵی ١٩٥٠ لە قەڵادزێ لەدایکبووە و مامۆستای سەرەتایی بووە. ئەندامێکی دڵسۆز و چالاکی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و سەر بەڕێکخستنەکانی قەڵادزێ بووە، بەداخەوە لە ١٩٩٩/٧/٣٠ بەنەخۆشی کۆچی دوایی کرد.

٢- حوسێن حاجی ئیبراهیم، مامۆستا حسێن، لەدایکبووی کۆتایی چلەکانی سەدەی بیست - قەڵادزێ، کۆچی دوایی لە ٢٠٢٠ بەکرەجۆ - سلێمانی.

سوڵتەی تەشریعی. ئەوانیش منیان دیاریکردووە؟! گوتم: کاک فاروق ئەوە بەمن ناکرێت. گوتی: بۆ؟ گوتم: کاکە ئەوە لەیەخەم نابێتەوە.

پاشان شیعرێکم نووسی و دام بەفاروق کە بیداتە ئەوان و بڵاویبکەنەوە. هەر بۆ خۆشی دامێ، کەچی کە سبەینێ دێمە دەرێ، تەماشادەکەم شیعرەکەی بەخەتی سوور بەرامبەر دیواری خۆمان نووسیوە، کە دیواری ماڵی حوسێنی حاجی مەحموود بوو. چوومە لای مزگەوتی خانەقا، تەماشادەکەم لەسەر ئەوێش نووسیویەتی؟ چونکە ئەو دوو سێ گەنجی لەگەڵ بوون: حەمە ڕەش و ئەوان، کە زۆر چالاك بوون و پۆستەر و شتیان بۆ هەڵدەواسی، نازانم کوڕەکانی کەمالی حاجی نوری بوو، یان نا، بەڵام زۆر چالاك بوون.

کە دیتمەوە، گوتم: ئەرێ شیعرەکەت نارد؟ گوتی: کوڕە ناردم، ئەدی نەتدی لەسەر ئەو دیوارانە... ئیدی دوای ئەوەی کە فاروق شەهید بوو، دەمانچەمان بۆ هاتن و پاشان کلاشینکۆف، نازانم ١٩٨٧ یان ١٩٨٨ بوو، بەڵام ئێستاش لەبیرمە کە کلاشینکۆفەکەی من مامۆستا محەممەد سوڵتان کاغەزێکی بۆ نووسیم و گوتبووی کە ئەوە دیارییەکمان بۆ ناردووی و لەڕۆژی پێویستدا بەکاری بهێنە. کلاشینکۆفەکە، لوقمان هێنای، لەناو گونییەکدا بوو بەدەستییەوە گرتبوو... دەمانچەکەش مامۆستا خالید بۆیهێنام.

**پ/ جەنابتان بەشداری هیچ چالاکییەکی وەك بەیان هەڵواسینتان نەکرد؟**

و/ نەخێر، تەنیا ئیشی ڕێکخراوەییم کردووە، بۆ نموونە: کۆکردنەوەی زانیاری و نووسینی ڕاپۆرت و ناردنی بۆ دەرەوە و ڕێکخستنی ناو شار، ئەو شتانە ئیشی من بوون. تەنانەت برادەرانی دەرەوە گوتبوویان باشترین زانیاری ئەو زانیارییانەن کە لەکەرتی ڕێکخستنی قەڵادزێوە بۆمان دێت. زانیارییەکانم لەکاغەزی (ڕایس) دەنووسی، ئێستاش لەو جۆرە کاغەزانەم ماون، تەنك بوو، دەمنووسی و بە بچووکی دەمپێچایەوە.

**پ/ دەربارەی ئەو هەوڵەی کە بۆ ڕێگەگرتن لەڕاگواستنی قەڵادزێ درا، هیچ ئاگادار بوویت؟**

و/ بەڵێ، لیژنەیەك پێکهێندرا کە بۆ بەغداد بچن. بێجگە لەوەش لەناو خەڵکیش لیژنەیەك پێکهێندرا، کە تێیدا حەسەن میرانیان گرت.

**پ/ چی دەربارەی ئەو بارودۆخە دەزانی؟**

و/ ئێمە بووین بەدوو بەشەوە، بەشێك دەیانگوت: با ڕاپەڕین بکرێت. بەشەکەی دیکە دەیانگوت: با نەکرێت. من لەگەڵ ئەو بەشە بووم کە پێی خۆش بوو ڕاپەڕین نەکرێت.

**پ/ ئێوە وەکو ڕێکخستن بوون بە دوو بەشەوە؟**

و/ نەخێر، وەکو بۆچوونی گشتی؟ چونکە خەڵکی پارتی و حسك و شیوعی بەشداری تێدا کردبوو. من پێم خۆش نەبوو ڕاپەڕین بکرێت؟ چونکە سەرکەوتوو نەدەبوو و کوژرانیشی تێدەکەوت. من کۆمەڵێك بەڵگەم بەدەستکەوت، لەبەرئەوەی لەفیرقەی بیست و چوار جارجار شتم بۆ دەدزرا. یەکێك لەو خاڵانەی کە دەستم کەوت، تێیدا هاتبوو: (حصل موافقه السيد رئيس القائد صدام حسين (حفظه الله) بالغاء ترحيل قصبتين زاخو و مندلي) واتە (زاخۆ و مەندەلی) لەو بڕیارەدا بوون (ڕاگواستن). بەڵام لەبەرئەوەی ڕێگای گشتین و پەیوەندییان بەهەموو دنیاوە هەیە و ئاشکرادەبێت، لەبەرئەوە هەڵیانوەشاندەوە. بەندی دووەم دەڵێ: (لم تحصل موافقة السيد رئيس القائد صدام حسين بالغاء ترحيل قصبة قلعةدزة) بەندی سێیەم (حصلت موافقة السيد الرئيس القائد صدام حسين بتأجيل ترحيل قصبة رانية و حوض بلنكان، بعد ترحيل قلعةدزة بسنة واحدة). واتە قەڵادزێ سەد دەرسەد دەگوازرێتەوە. یەکێکی دیکەیان لە (رئاسة مكافحة الشغب في السليمانية) بۆ هێنام، کە دەڵێ: دەبێت پشگیری هێزی دارەشمانە بکەن و هەر چواردەوری قەڵادزێ بەتەواوی بگرن، هەرچی بێت و بڕوا، بیکوژن. لەبەرئەوانە، من پێموابوو کە نابێ هیچ شتێك بکرێت؟ چونکە پیاو ئەگەر کوردپەروەری بکات، لەهەموو شوێنێك دەتوانێ بیکات. ئەو کڵاشینکۆفانەش کە بۆمان هاتن، بۆ ئەوەبوو کە لەساڵی ١٩٨٧ ڕاپەڕین بکرێت، بەڵام لەبەرئەوەی حکومەت و هێزەکانی ئەوەندە بەهێزبوون، وازی لێهێنرا...

**پ/ کەواتە لەو کاتەشدا پێت وابوو کە ڕاپەڕین نەکرێت.**

و/ بەڵێ؟ چونکە من پێموایە دەبێت لەکاتی لاوازیدا لەدوژمن بدرێت، نەك لەبەهێزیدا. ئێمە ئەو هێزەمان نەبوو کە بتوانین بەرەنگاریان ببینەوە، هەروەها لەوکاتەدا پیاوەکانی حکومەت زۆر خراپ بوون.

**پ/ لەڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا پێت باشبوو کە لە حکومەت بدرێت؟**

و/ بەڵێ؟ چونکە بارودۆخەکە لەباربوو، خەڵك بەتەواوی بێزار بوو، هێزی چەکداری ڕژێم چەند مانگێك بوو مووچەی وەرنەگرتبوو، خواخوای بوو پەیوەندی پێوە بکەیت، بۆئەوەی دواڕۆژێك بۆ خۆی مسۆگەر بکات؟ چونکە حکومەت هیچ هێزێکی تێدا نەمابوو، تەنیا ڕووکەش بوو...

**پ/ جەنابتان لەکاتی ڕاگواستندا بەرەو کوێ چوون؟**

و/ من خۆم بۆ سلێمانی نووسی، دواتر پەشیمان بوومەوە، بەڵام نەیاندەگواستمەوە. بۆ هەولێر چووم، لەوێ وەك ڕێكخستن كاك شاسوارم ناسی، ئەو شوێنەیان (خانووەكە) پێشاندام كە كاك مستەفا سەید قادری لێبوو، لەوێ بۆ یەكەمجار بوو كە لەدوای قەڵادزێ چاوم پێیكەوتەوە.

**پ/ كێ پیشانی دایت؟**

و/ كاك ئەحمەد بچكۆل و كاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵا. لەگەڵ كاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵا چووین، كاك مستەفا و كاك شاسوار لەوێ بوون، ئاگادارم كردنەوە كە لەسلێمانی وەزعم باش نییە و ناتوانم لەوێ ئیدارە بكەم، گوتم: پێمخۆشە بۆ هەولێر بێم. گوتیان: هۆكار چییە؟ گوتم: پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە.

ڕۆژێك لەپەروەردەی سلێمانی بانگیان كردم و وتیان كێ لێرە دەمێنێتەوە و كێ بۆ هەولێر دەچێت؟ منیش گوتم: من بۆ هەولێر دەچم. بۆ هەولێر هاتم و لەدارەتوو پارچە زەوییەكم وەرگرت. خۆشبەختانە كۆمەڵێك لەبرادەرانیش هەر لەوێ بوون، لەوانە كاك لوقمان و هێمن[1] (كوڕانی كاك حوسێن)، كاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵا، سەید عوسمان، سەباحی كاكە حەمە[2]، مامۆستا كەیفی[3]، دڵشادی عەبدوڵڵا ڕەش... دواتر من لەناو كەركووكییەكاندا خانووم بەكرێگرت، كە دووسێ جار بۆ بەخێرهاتن هاتن، كە بۆنی قسەكانم كردن، بۆمدەركەوت كە زۆر ڕێكوپێكن، بەڵام كەسێك نەبوو سەرپەرشتییان بكات... ئەو بارودۆخە وایكرد كە لەگەڕەكەكەدا ببم بەجێگای پرس پێكردن و متمانە، دواتر كەمەكەمە لەقوتابخانەكان جوڵەجوڵمان دەستپێكرد، وردە وردە خەڵكمان وریا كردەوە كە: كورد نەمردووە. ڕۆژێكیان مامۆستا خالید هات، ئەوكات من پەیوەندیم لەگەڵ ئەودا هەبوو، ئەو ماڵی لەگەڕەكی برایەتی هەولێر بوو، گوتی: هەر كاتێك ویستت بۆ لای كاك مستەفا و ئەوان بچیت، من دەتبەم. واتە ئەو بازنەی پەیوەندی نێوانمان بوو. بەڵام ئەوەی پێویستە باسیبكەم، ئەوان لەهاتنی من بۆ هەولێر، هاوكارییان كردم و كرێی باركردنی ماڵەكەشیان بۆ دام.

---

١- ئێستا لەدەرەوەی وڵات نیشتەجێیە.

٢- سەباح محەممەد مەلا ساڵح: لەساڵی ١٩٧٨وە پێشمەرگە و كادرێكی چالاك بووە، ئێستا لەڕانیە نیشتەجێیە و خانەنشین و كاسبە.

٣- مامۆستا كەیفی عەبدولڕەحمان: خەڵكی سەنگەسەر و ئێستا لەڕانیە مامۆستایە.

**پ/ پێش ئەوەی کاک مستەفا سەید قادر دەستگیربکرێت، ئێوە هیچ چالاکیتان کرد؟**

و/ نەخێر، تەنیا توانیبوومان کە قەوارەیەك بۆ خۆمان دروستبکەین، بەتایبەت لەدارەتوو، خەڵك وەك کەسایەتی و خەڵکی شۆڕشگێڕ ئاماژەی بۆ دەکردین؟ چونکە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ قسەمان بۆ خەڵك دەکرد.

**پ/ لەوکاتەدا کێ لەگەڵ تۆدا هەڵسوڕاو بوو؟**

و/ کاك مستەفای مەلا عەبدوڵڵا، کاك لوقمان حوسێن، سەید عوسمان، هەروەها کاك دڵشاد عەبدوڵڵا ڕەش، دراوسێم بوو، زۆر دەهاتە لام. بەڵام مامۆستا خالید لێپرسراوم بوو؟ چونکە ئەو (کادر متفرغ) بوو، تەنیا کاری حزبی دەکرد، منیش ئەندامی پۆل بووم، دواتر مامۆستا خالید ڕۆیشت، من بۆ خۆم بووم بەلێپرسراوی پۆلەکە.

کە کاك مستەفای سەید قادر دەستگیرکرا، ئێوارەیەك مامۆستا خالید هات بۆ لام و گوتی: مامۆستا زیاد، عەزیز دەستگیرکرا. دوای ئەوە کاك شاسوار هەموو ئیشەکانی کاك مستەفای بەڕێوەبرد و نەیهێشت هیچ کەموکوڕییەك بکەوێتە ڕێکخستنەکانەوە، وەك هیچ ڕوونەدابێت. دواتر دڵنیاشیان کردینەوە کە کاك مستەفا هیچی نەدرکاندووە...

**پ/ پێش ڕاپەڕین، ئێوە وەك خۆتان چ ئامادەباشییەکتان کرد؟**

و/ ڕۆژێك مامۆستا خالید هات و نامەیەکی بۆ هێنام، گوتی لەکاك نەوشیروانەوە هاتووە، کە خوێندمەوە دەڵێ: پەیوەندی بەو چەکدارە کوردانەوە بکەن کە دەستیان بەخوێنی کورد سوورنەبووە؟ چونکە هەندێکیان لەبەر بژێوی یان دوژمنداری، بوو بوون بەچەکدار، هەروەها پەیوەندی بەپێشمەرگە کۆنەکانەوە بکەن، پارێزگاری لەچەکەکانتان بکەن، هەروەها ئەگەر دەتوانن چەکی دیکەش بکڕن. دوای ئەو نامەیە، بۆ هەولێر چووم و لەبازاڕ شاسوارم دیت؟ چونکە ئەو هەمیشە بەجلوبەرگی جۆراوجۆر دەسووڕایەوە، لێمپرسی: ئەو نامەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە لەگەڵ حکومەت لێك بدەین، ئەگەر وایە با من واز لەخانووەکەم بهێنم...؟ گوتی: کوڕە گوێمەدەیە، هەردووکیان بەیەکەوە دەکەین. وردە وردە وەزعەکان چوونە پێش، تاکو سەدام لەکوێتی دا، قسەیەکم پێگەیشت کە کاك نەوشیروان گوتوویەتی: ئەوە بزنەکە نانی شوانەکەی خوارد. دوای ئەوە، بڕیاری ڕاپەڕین دەرچوو، کە لە٣/٧ لەسەرتاسەری کوردستان دەبێت بکرێت. دواتر بەهۆی ڕووداوەکەی خەباتەوە، ئەو ڕۆژەی دیاریکرابوو، واتە ٣/٧ هەڵوەشایەوە؟ چونکە ئەو ناکۆکییەی ئۆردووگای خەبات ڕوویدا؟

**پ/ ڕووداوەکەی خەبات کە لە٣/٤ ڕوویدا، لەبەرنامەکەدا بوو؟**

و/ خۆی ٣/٧ بوو، بەڵام دوای ئەو بروسکەیەی کە باسمکرد، شانە چەکدارەکانی (بروسك) دامەزرا، کە بەڕاستی شانەی زۆر وریا و ئازا و چالاك بوون؟ چونکە زۆربەیان (سرك) بوون، لەبەرئەوە بارودۆخەکە زۆر لەباربوو بۆئەوەی لەهەر کاتێکدا بتەقێتەوە، نەوەکو سەرکردایەتی داوابکات و ئەو (واتە بروسك) ئامادەنەبێت. هەمووی ئامادەبوو، چاوەڕێی سەرکردایەتی دەکرد. لەخەبات، بەختیار هوڕێوەیی لەگەڵ محەممەد فاروق[1] دوایان کەوتبوون، ئەوانیش دەستیان نەدابوو، بارودۆخەکە تەقیبوەوە و خۆیان بەناو قەڵادزێییەکاندا کردبوو، بوو بوو بەتەقە، هەردووکیان شەهید بوون و هەرکییەکانیش لێیان کوژرابوو. لەوکاتەدا مامۆستا خالید هات و گوتی: ئێستا لای شاسوار بووم و بروسکەیەکی کاك نەوشیران هاتووە و دەڵێ: بەهەرچی جۆرێك بێ کارێکی وا بکەن، ئەو ناکۆکییەی نێوان پشدەرییەکان و هەرکییەکان چارەسەر بکەن و با نەبێت بە بەرنامە تێکدەر. لەهەمانکاتدا دەبێت لەنزیکترین خاڵی نزیك بەپێشمەرگەوە، بتەقێتەوە. ئێمەش پەیوەندیمان بە مامۆستا مەلا دەڵگەیی و کۆمەڵێك لەپیاوماقوڵانی قەڵادزێوە کرد، ئەوانیش چوون و کێشەکەیان چارەسەر کرد. لەبیرمە مامۆستا کەیفی بەپیاوماقوڵەکانی گوت: ئێمە نامانەوێت لەگەڵ حکومەتدا هیچمان بۆ بکەن؟ چونکە ئێمە لەگەڵ حکومەتدا یەکلاییمان کردووەتەوە، تەنیا ئەو کێشەی نێوان پشدەریی و هەرکییەکانمان بۆ چارەسەر بکەن.

**پ/ ئەو پیاوماقوڵانە کێ بوون؟**

و/ مامۆستا دەڵگەیی، کاك حەمەی کانەبی ئاغا، کاك هۆمەری حاجی مووسا، مەلا حەمەدەمینی مزگەوتی مام قاسمی قەڵادزێ... چووبوون بۆ لای شێخ محەممەدی لۆلان، ئەویش گوتبووی: ئێوە مەیەن، با خۆم قسەیان لەگەڵ بکەم، ئەگەر ئێوەم لەگەڵدا بن، ناتوانم هەموو قسەیەك بکەم. پێی گوتبوون: واز لەبەعس بێنن، هەموو دنیا لێیان بێزارە... ئیدی بارودۆخەکە تەواو هێوربووەوە... دوای ئەوە، پەیوەندی بەڕانیەوە کرا، بەئۆتومبیلەکەی مامۆستا حەمەساڵحی مەلا عەلی[2] کەرسۆنان[3]. کە (لادا)یەکی زەردبوو، پێمان دەگوت (بارگیرە زەرد).

---

١- خەڵکی گوندی مەلاکاغەری دەشتی هەولێر و لە عەشیرەتی هەرکی بووە.

٢- لە زانکۆی سەلاحەدین مامۆستای زانکۆیە و لە هەولێر نیشتەجێیە.

٣- کەرسۆنان: گوندێکە بە چەند کیلۆمەترێك دەکەوێتە خوار ناحیەی ژاراوەوە.

**پ/ کێی لەگەڵ بوو؟**

و/ کاک ئەحمەد بچکۆل و مامۆستا حەمە ساڵح (کە ئەو لاداکەی لێدەخوڕی). لەکۆیە ویستبوویان پەیوەندی بە مامۆستا وریاوە بکەن، بەڵام لەماڵ نەبوو بوو، بۆ ڕانیە چووبوون، بەڵام پێشتر بۆ چوارقوڕنە و بۆ ماڵی کاک عەلی خەیات چووبوون، لەڕانیەش پەیوەندییان بە شەهید عەلی نەبی[1] و خوالێخۆشبوو ئەسعەد حەمە عەلی[2] و کۆمەڵێکی دیکەوە، کردبوو. کە لە ٣/٥ لەڕانیە ڕاپەڕین کرا، بێدەسەڵاتی حکومەت دەرکەوت، دوای ئەوە ٣/٧ دابەشکرا، ٣/٦ لە بازیان و ٣/٧ لە سلێمانی و هەولێریش بوو بە ٣/١١.

**پ/ لەو کاتانەی کە بارودۆخەکە لە هەولێر شێوا، کاک شاسوارت دیت؟**

و/ نەخێر، بەڵام مامۆستا خالید ڕۆژی واهەبوو دە جار لەهەولێرەوە بۆ دارەتوو دەهات. هەروەها من پەیوەندیم بەهەندێ چەکداری حکومەتەوە کرد، یەکێکیان کاک (بایزی حەسەنی بایزی[3]) بوو کە دراوسێ بووین. پێمگوت: ئێمە لەحکومەت دەدەین، تۆ دۆستی یان دوژمنیت؟ گوتی: مامۆستا لەپێش منی پێوە نانێیت.... هەروەها گوتی: ئەوە چەکی بیکەیسی و کلاشینکۆف و ئارپیجی. هەروەها پیاوێکی دیکە کاک (عەبدوڵڵا وسوو)ی ناو بوو، لەعەشیرەتی ئاکۆ بوو، ئەویش دراوسێم بوو... بەهەمان شێوە بەویشم گوت. ئەویش گوتی: مامۆستا بۆ خۆم و ئەحمەد و عەبدولڕەحمانی برام، لەخزمەت داین.

**پ/ کەواتە تۆ لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی دارەتوو بوویت؟**

و/ بەڵێ، لەناو گەڕەکی قەڵادزێییەکان، بەڵام ئاگاداری گەڕەکەکانی دیکە نەبووم، تەنیا شانەیەکم لەناو کەرکووکی و هەولێرییەکاندا، هەبوو.

**پ/ جگە لەقەڵادزێییەکان چەند کەسی دیکەت لەگەڵ بوو؟**

و/ کاک قادر، کاک ڕەفعەت، کاک تەلعەت، مامۆستا سابیر، کاک ئەکرەم، کاک نیزام، مامۆستا جەعفەرە درێژ، کاک نەبەز و کاک شەماڵ بوون...[4]

---

١- کەسێکی چالاکی ڕێکخستنەکان و پێشمەرگایەتی ناوچەی بیتوێن و بووە، کە لەڕاپەڕیندا لێپرسراوی شانەی چەکداری ٢٠٠ی بروسك بووە، بەڵام بەداخەوە لە٢/٥/١٩٩٤ لەقەڵادزێ و لە شەڕی نێوخۆدا شەهید بووە.

٢- ئەسعەدی حەمەعەلی ڕانیەیی، ساڵی ١٩٦٦ لەدایك بووە، خوێندکاری کۆلیژی زانستەکان (بەشی جیۆلۆجی) موسڵ بووە. لە دوای ڕاپەڕین ماوەیەك سەرۆکی شارەوانی ڕانیە بووە و بەداخەوە لە نیسانی ٢٠٠٣بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

٣- بایز حەسەن بایز: ئێستا لە ڕانیە نیشتەجێیە و خانەنشینە.

٤- بەداخەوە مامۆستا زیاد ناوی سیانی هیچ یەکێك لەو برادەرانەی لەبیرنەمابوو.

شاسوار بەمامۆستا خالیدی گوتبوو: خەمتان نەبێت من ۲۰۰ پارچە چەکم بۆ ئامادەکردوون، کە بۆ ئێمە پشتیوانی باش بوو؟ چونکە ئێمە تەنیا ۲۰ چەکێکمان هەبوو. کە هەندێکیان هی ئەو قوتابییانە بوون کە بە(جیش شعبی) گیرابوون، نەمانهێشت بیدەنەوە بەحکومەت. دەمەو عەسر لەدەنگی گەلی کوردستان بروسکەکە خوێنرایەوە، کە دەیگوت: لەباوکی ڕێناسەوە، بۆ هەموو شانە چەکدارەکانی بروسك، تکایە دەستبەکاربن. مامۆستا خالید هات، گوتی: گوێت لێبوو؟ گوتم: بەڵێ، ئەی چەکەکان هاتوون؟ گوتی: تائێستا نەهاتوون. گوتم: دەستبەکاربین و چەکمان کەم پێیە؟! مامۆستا خالید بۆ هێنانی ئەو چەکانە ڕۆیشت، بەڵام نەهاتەوە؟! ئێوارە دیسان بروسکەکە دووبارە کرایەوە، بەڵام ئەمجارەیان دەڵێ: لەباوکی ڕێناسەوە، بۆ هەموو شانە چەکدارەکانی بروسك، تکایە دەستبەکاربن، پێشمەرگە لێتانەوە نزیکە. مامۆستا خالید هاتەوە، گوتی گوێت لێبوو. گوتم: بروسکەکە جیاوازی هەیە، ئەو پێشمەرگانە، چەکەکانن. گوتی: دەبێت لەکوێ بن؟ گوتم: ڕەنگە لەو دەواجنانەی دەورووبەرمان بن. بڕیارماندا کە بەهەر شێوەیەك بێت، بەیانی دەستپێبکەین... شەوێ گوێم لەمنداڵێك بوو، هاواری دەکرد: ئەی هاوار بروسك کێیە؟ هاتمە دەرێ و گوتم: ئەوە چییە کاکە؟ گوتی: وەڵا کۆمەڵێك چەکدارن لە (بروسك) دەپرسن. گوتم: بۆ کوێ چوون؟ گوتی: ئاوا ڕۆیشتن. کە چووم، مامۆستا خالید لەگەڵیان بوو. لەبەر دەرکی ماڵی حەمەی کانەبی ئاغا ڕاوەستا بوون و مامۆستا خالید هەڵدەسووڕا.

**پ/ کەواتە پێش ئەوەی دەستپێبکەن، پێشمەرگە گەیشت؟**

و/ بەڵێ، هەر شەوێ بڕیاردرا کە بەیانی لێبدەین. ئێمەش پرسیارمان کرد ئایا ڕۆڵی ئێمە چی بێت؟ گوتیان: ئێمە لێیدەدەین و ئێوەش خۆپیشاندان بکەن. بەیانی چاوەڕێمان کرد، لێنەدرا؟! هاتینە دەرێ کە۳/۱۱ بوو، لەوکاتەدا بڵندگۆیەکیان پێبوو هاواری دەکرد: خەڵکینە هێرش بۆ سەر سەرای حکومەت، بکەن... خۆی بڕیاربوو ئەوان سەراکە بگرن، ئینجا خەڵکەکە دەستپێبکات، بەڵام دوای ئەو بانگەوازە، ڕوومان لەسەراکە کرد، بوو بەتەقە و یەکەم ئارپیجیی (شازاد) شەهید بوو.

**پ/ شازاد کێ بوو؟**

و/ پێشمەرگە بوو، بەڵام خۆی تەسلیم بەحکومەت کردبوەوە و لەناو شانە چەکدارەکانی بروسکدا بوو. جگە لەوان: ئومێد و شکوریش شەهید بوون... سەراکە دەستگیرکرا و بوو بەهەرا. دواتر بۆ هەولێر چووم و شاسوارم دیت، یەکترمان ماچکرد و پیرۆزبایی و...

**پ/ بۆچوونی تۆ لەسەر شاسوار؟**

و/ شاسوار، کەسێکی دڵسۆزی کوردایەتی، ئازا، وریا، چاونەترس، مودەبیر بوو... دیارە شاسوار نەبوایە، هەر کەسێکی دیکە بوایە، نەیدەتوانی بەوشێوەیە کارەکان ڕاپەڕێنێ و خۆیشی بپارێزێت، هەرچەند هەمووسان لای یەکتر ئاشکرابووین، بەڵام زۆر بەهەستیاری مامەڵەی لەگەڵ کەس و ڕووداوەکاندا دەکرد، جارێکیان لەپاسدا یەکترمان دیت، سەلامی لێنەکردم. زۆرجار لەبازاڕ دیومە، هەر تۆقەیەکیشی لەگەڵ نەکردووم، وەك ئەوەی کە هەر نەمناسێت، دیارە لەپێناوی کوردایەتیدا، دەربەستی هیچ ئازار و ئەشکەنجەیەکیش نەبوو...

**پ/ ئەم کارەت پێ چۆنە؟**

و/ خراپ نییە، بەڵام شتێك هەیە دەمەوێ لێرەدا بیڵێم: لەکاتی ڕاپەڕیندا لە هەموو شوێنەکان، قەڵادزێییەکان ڕۆڵی تەواویان هەبووە، بۆ نموونە: لەبازیان، دارەتوو، هەولێر، ڕانیە، خەبات... لە زۆربەی شوێنەکان خەڵکی شاری قەڵادزێ و ناوچەی پشدەر لە پێشەوەی ئیشەکان بوون، ئەوە شتێك نییە کەس بتوانێت نکۆڵی لێبکات، لە بەرامبەردا شاری قەڵادزێ بوونی نەبوو... لە پێش ڕاگواستنی قەڵادزێ، تاکە شوێن هەر ئەوێ مابوو کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەشۆڕشەوە هەبێت...

## گفتوگۆیەك لەگەڵ ڕاوچی مرواری
## مامۆستا زیاد محەممەد ئەمین
## ئەنجامدانی گفتوگۆ: ئارارات ئەحمەد

ئەم دیدارە لە ٢٠٠٨/١٢/٢٦ – ڕانیە، لە ماڵەکەی خۆیان ئەنجام دراوە و بە دەنگ تۆمارکراوە.

هەڵبەتا جەنابی مامۆستا زیاد، نەك هەر لە بواری پەروەردە و فێرکردندا کە ساڵانێکی زۆرە خزمەت دەکا، مامۆستایەکی سەرکەوتوو بووە، وە دڵسۆز بووە بۆ پیشەکەی خۆی وە بۆ خەڵك و بۆ قوتابییەکانی، لە تەواوی بوارەکانی دیکەشدا وەك مامۆستایەك ڕۆڵ و نەخشی خۆی پێشکەش کردووە. ئێمە ناتوانین لە چەند وشەیەکی کەمدا پێناسەی بکەین، دەمانەوێ لەم دیدارەدا کە لە بەینی پرسیار و وەڵامەکانماندا لە ژیانی ئەو دەگەین، دەتوانین جوانترین پێناسە بەدەست بێنین.

**پ: ئەم کاتەت باش**

و: بژیت، گیانت باش کا حەسەن.

**پ: مامۆستا حەز دەکەین سەرەتا لە ناوی خۆتەوە دەست پێ بکەین، وە شەجەرەی ناوی خۆت، بە ئەسڵ خەڵکی کوێن، ساڵی چەند و لە کوێ لە دایك بووی؟**

و: وەڵا کا حەسەن من وەکو شەجەرەی بنەماڵەمان، بنەماڵەی ئێمە کە لە باپیرمەوە، یانی لە بابی بابمەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، بۆ خانەوادەی ساڵحی ڕەشە، باپیرم ناوی ئەحمەد بووە، بە فەرمانی دەوڵەتی عوسمانی کەوتۆتە دەڤەری (مەرگە[1]) لەوێ ئیش و کارێکی هەبووە، ئینجا ئایا لەوێ تووشی گێرە و کێشەیەك بووە، پیاوێکی لە دەست کوژراوە، ئینجا ڕوون نەبۆتەوە بۆم ئایا داخوا بە عەمدی کوشتویەتی یاخود لە دەستی دەرچووە، شایی و شتی ئاوا بووە، لە شاییەکەدا لە دەستی کوژراوە و...

**پ: نازانی ساڵی چەند بووە کە ئاوا ناردراوە بۆ ئەو شوێنە؟**

و: وەڵاهی بەس ئەوەندە دەزانم، ئەو دەورانە دەورانی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی بووە، ئەو دەوروبەر بووە، وە ئیللا ساڵەکەم لە فکر نیە، هەر نازانم ئەو ساڵە چەندە... دیارە لەوێ کە ئەو کارەی لە دەست قەوماوە، شیلانەکان لەوێ سوڵحیان بۆ کردووە،

١– لە ئاخاوتنی عامیدا بە (مەرگێ) دەردەبردرێ.

لەویێ ماوەتەوە، لەویێ لە کوێخایەکان ژنێکیان داوەتێ بە ناوی (خانزاد)ەوە، ئیدی لەویێ ماوەتەوە و نەچۆتەوە بۆ سلێمانی و ژیانی عەشایەری هەڵبژاردووە، بابیشم هەر لەویێ لە دایك بووە، دیسان ئەویش هەر ژیانی عەشایری پێ خۆشتر بووە لە ژیانی شارستانیەتی و نەگەڕاوەتەوە و بۆ خۆشم هەر هەمان، لەو شوێنە، لە بنگرد لە دایك بووم و منیش هەر ژیانی عەشایری و دەرەوەم پێ خۆشتر بووە لە ژیانی شارستان و نەچوومەتەوە بۆ شارستان و هەر لەویێ ژیاوم...

**پ: رێك لە ساڵی چەند لە دایك بووی مامۆستا؟**

و: من بە هەموو مەزەندەکان، دیارە ئەو ساڵانەی کە تەسجیلی نفوس کراوە، ساڵانێك بووە، لەبەر عەسکەری، زۆر کەس کوڕیان بە کچ نوسیووە، زۆر کەس کوڕیان هەبووە هەر نەیاننوسیووە، ئیشیان بە دەفتەری نفوس و ئەوە نەبووە، چونکە زۆر تالیبی وەزائیفی حکومی و ڕەسمیات و ئەو جۆرە شتانە نەبوون، دیارە گۆڕانکاری بەسەر دەفتەری نفوسەکەی مندا هاتووە، بلێین وەکو ئێستا، هاتووە، بەڵان من قەناعەتی تەواوی خۆم وایە من ساڵی ١٩٣٨ من لە دایك بووم، چوکە من وەکو لە داکی خۆمم بیستووە، من ئەو ساڵە لە دایك بووم کە حکومەت هاتۆتە (بنگرد) کە ئەو کاتە پێیان گوتووە (حوکمەتی عەرەبی) ئێستاش کۆنینەکانی ئەو دەڤەرە[1] هەتا ئەو ساڵانەش هەر دەیانگوت حکومەتی عەرەبی، نەیاندەگوت حکومەتی عێراقی، نیسبەتەن بۆ ئەوەی کە شۆڕشی شێخ مەحموود کۆتایی پێ هات و حکومەتی عێراقی سەیتەری کرد و ئەو جۆرە شتانە، من ئەو ساڵە لە دایك بووم، دیارە خەڵکی دەڤەرەکەش، بە تێکڕایی پێیان ناخۆش بووە کە حکومەت هاتۆتە وێ، چونکە شیلانەکان سەرجەم هەموویان سەر بە شێخ مەحموود بوون، بەبێ جیاوازی، حکومەتی عێراقیش کە هات و لەویێ دامەزرا، بنگردی کرد بە مەرکەز، لە زەمانی عوسمانیدا مەرگە مەرکەز بوو. بنگردی کرد بە مەرکەز، چونکە بنگرد مەرکەزی شیلانەکان بوو، بۆ سەرکوتکردنی شیلانەکان بنگردی کرد بە مەرکەز، بۆ ئەوەی لێیانەوە نزیك بێ، جا من، بە قەناعەتی خۆم و بە ڕاستیشی دەزانم، ساڵی ١٩٣٨ لە دایك بووم، هەر لە بنگردیش چوومە مەکتەب و هەر لەوێشم خوێندن تەواو کردووە[2]...

---

١- کۆنینەکانی ئەو دەڤەرە: خەڵکە بە تەمەنەکانی ئەو دەڤەرە

٢- مەبەستی لەوەیە کە تا کۆتایی بە خوێندن هێناوە، ژیان و ماڵی هەر لەویێ بووە.

**پ: لە تەمەنی چەندا چوویە خوێندن.**

و: وەڵاهی من پێم وایە لە شەش و حەوت، لە تەمەنی ئاساییدا، چوومە مەکتەب و ئەمن پێم وایە، دەیگێڕمەوە بۆ ساڵی ١٩٤٦... ١٩٤٦ کە من چوومە مەکتەب، چونکە تەخەڕوجم لە پۆلی شەشی سەرەتایی، لە ٩٥٢ بووە، هەموو ساڵەکانی سەرەتاییش دەرچووم، مانای وایە دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٤٦...

**پ: مامۆستا ئێوە چەند خوشك برا بوون؟**

و: ئێمە هەر خوشکێك و برایەك بووین و داکمان و بابمان، بابمان زوو مردووە، بابمان، کە حوکمەتی عەرەبی، وەکو پێشینەکان دەڵێن، سەیتەرەی کرد لە مەنتیقەکە، زۆر پیاوی شیلانان[1] لەو دوو سێ ساڵەدا مردن، کە خۆیان بە بێ دەسەڵات دەزانی و سەر بە شێخ مەحموود بوون و وەکو تەعەدایان لێ بکرێ و دەسەڵاتیان نەماوە و ئەوانە، زوربەیان لە خەفەتی ئەم حکومەتە مردن، بابی منیش یەکێك بووە لەو کەسانەی کە لەو ساڵانەدا مردووە. من بە هەتیوی گەورە بووم، یانی، بابم بە جۆرێك بە فکر دێ کە مردووە، وەك خەونێك، عەقڵم بە مردن نەدەشکا داخوا ئەوە...

**پ: دە ساڵان نەدەبووی، لە پۆلی یەك و دووی سەرەتایی؟...**

و: باوەڕ ناکەم، دە ساڵان نەبووم و پۆلی یەك و دووی سەرەتاییش نەبووم، ڕەنگ بێ بچووکتریش بووم، چونکە ئێستا بەبیرم دێ ئەگەر بابمیان دەبرد بۆ سەر قەبران، دەیانگوت ئەوە بابت دەچێ بۆ شاری، یەعنی بەو شێوەیە، قسەکەم ئێستاش هەر لە فکر ماوە. ئیبتیدایی، دیارە ئەمن لەوێ خوێندوومە و، لە بنگرد و، هەر لەوێش دەرچووم و...

**پ: مامۆستا تەلەبەکانتان، لەو مەکتەبەی ئێوە چەند بوو؟ مەکتەب لە مەرگەش هەبوو؟**

و: مەکتەب تەنها لە بنگرد هەبوو، لە شوێنی کە نەبوو، لە دێهاتەکانی دەور و بەری نەبوو، تەنها لە بنگرد مەکتەب هەبوو، هێندێك تەلەبە، لە گوندەکانی دەور و بەری بنگردیەوە، ڕۆژانە دەهاتن دەیانخوێند و دەڕۆیشتنەوە، ئەگەر ڕۆژانی بەفر و سەرما و ئەو جۆرە شتانە بایە، بە وڵاخی دەیانهێنان، لە مەرگەییەکان دەهاتن، بەردەشانیەکان دەهاتن، ێناجیانیەکان، قەرەتەپە و مەمەنداوەییەکان دەهاتن، بە وڵاخی دەیانهێنان ڕۆژانی باران و سارد و سەرما و بەفر و، بە وڵاخیش دەیانبردنەوە، بەو شێوەیە ئەوانە خوێندنیان تەواو کرد...

---

١- مەبەستی لە پیاوی کەسایەتیی دیار و دەرکەوتەیە

**پ: مامۆستا، مامۆستاکانی ئەو کاتەت لە بیر ماون؟ لە سەرەتایی؟**

و: من ئەوەی کە لە بیرم مابێ، کابرایەکم لە بیر ماوە ناوی مستەفا فەندی بوو، پیاوێکی کە ناوی عیزەتە فەندی بوو خەڵکی سلێمانی بوو، پیاوێکی کەی عەرەب هەبوو، مامۆستا عەبوشیان پێدەگووت، بەرتەلەیی بوو، خەڵقی مەنتیقەی موسڵ بوو، مەسیحی بوو، هەتتا لەبەر مامۆستا کەمی، ئەو مەسیحی بوو بەڵام دینی پێ دەگوتین! یانی قورئانی پێ دەگوتین و مەسیحیش بوو، ئەو مامۆستایەم بە فکر دێ، لە پۆلی شەش کە من دەرچووم، ئەو مامۆستایانە لەوێ بوون، ئەوانەم بە فکر دێ.

**پ: مامۆستا، هەر ناوی قوتابخانەی بنگردی سەرەتایی بوو؟**

و: قوتابخانەی بنگردی سەرەتایی بوو، دیارە کە لە شەش دەرچووین، ئیمتیحانی وەزاریەکەش دەهاتە قەڵادزێ، دەبوو لە قەڵادزێ ئیمتیحانی وەزاری بدەی، چونکە ئەو کاتە بنگرد سەر بە قەڵازێ بوو، لە بارەی ئیدارییەوە سەر بە قەڵادزێ بوو، کە دەڵێم بنگرد، یەعنی دەڤەری مەرگە، وەکو چۆن قەڵادزێ مەرکەزی پشدەرە و، ڕانیە مەرکەزی بیتوێنە و، بنگردیش مەرکەزی مەرگە بوو، ئینجا مەرگە عایدی پشدەر بوو لە ڕووی ئیداری و ئەو جۆرە شتانەوە، بەڵام بەعسیەکان دوو سێ جار، بۆ ئەوەی نفوسی مەنتیقەی پشدەرێ کەم بکەنەوە، بنگردیان لا برد، جارێك هێنایانە سەر ڕانیەی و جارێکی کە بردیانەوە سەر دوکان و هاتوچۆیەکیان پێ کردووە، ئێستا کەوتۆتە سەر دوکان...

**پ: مامۆستا، لەو ڕەفیق تەلەبانەی سەرەتایی کێیان ماون؟ یان بڵێین کێیان ئیدامەیان بە خوێندن دا؟**

و: وەڵا ئەو جەماعەتەی ئەو برادەرانەی ئێمە، کۆمەڵێکمان کە لە سەرەتایی دەرچووین، ئاخر زەحمەت بوو خوێندن کە لە سەرەتایی دەردەچوو، ڕانیە، ئامادەییەك یا ناوەندییەکی لێ نەبوو، قەڵادزێ لێی نەبوو، بنگرد لێی نەبوو، دوکان لێی نەبوو، ئەو شوێنانە لێی نەبوو، تۆ کە لە شەش تەواو دەبووی یا دەبوو دەست بکەی بە ئیش و کاری کشت و کاری و حەیوانداری و ئەو جۆرە شتانە، یا دەبوو بە دوای خوێندنێ کەوی بۆ شارەکان، بۆ سلێمانی بوو، بۆ هەولێر بوو، بۆ کەرکوك بوو، هەتا هێندێك دەسەڵاتیان هەبوو، بۆ خوێندن گەیشتنە بەغداش، بۆ ئەو شوێنانە، بە گوێرەی ئەوەی کە خزمت لە کوێ هەیە، بە گوێرەی ئەوەی دەسەڵاتی خوێندن مەسروفاتت چەندە؟ لەوێ بەردەوامیت بە خوێندن دەدا... لەو برادەرانە، وەڵا، خۆشبەختانە ئێمە زوربەمان خوێندمان و بە گوێرەی توانای خۆمان توانیمان شەهادەیەك بە دەست بێنین، مەسەلەن من، مامۆستا کاکە سوار، مامۆستا

عەلی میرزا، مامۆستا سوارە عەبدوڵڵا، مامۆستا محەمەد حەمە ساڵح، مامۆستا مەسعوود. ئەوانە هەموو هاوپۆل بووین ئینجا یا دوو پۆل پێشتر یا دوو پۆل خوارتر، ئەو جۆرە شتانە. کە دەریش چووین هەروا دەرچووین، یەکێك مەسەلەن دوو ساڵ لە پێش مندا دەرچوو، ئی واش هەبوو دوو ساڵ لەدوای مندا دەرچووە، بەو شێوەیە ئێمە ژیانی خۆمان بەڕێوە برد...

**پ: مامۆستا متوەستەت لە کوێ بڕی؟**

و: لە سلێمانی، لە سلێمانیش وەکو ئێستا نەبوو، تاکە متوەستەیەك کە هەبوو لە چوارباخ، لەو دیووی حەسیب ساڵحی ئێستا، دائیرەی ئینحیسار بوو، لە دوای ئەویش یەکسەر مەکتەبەکەی ئێمە بوو، ئێستا زۆر جار کە بە وێدا دەچم، هەمان ئەو ژوورانەی کە تێماندا خوێندوون، کە جیایان کردبووینەوە لەسەر جادەکەی، ئێستا ئەو دوو ژوورە تێك نەچووە، زۆر جار یادی دەکەمەوە کە ئێمە کۆمەڵێك هار و هاج بووین، هێنابوویانین لەوێیان دانابووین، جیایان کردبووینەوە لە قوتابیەکانی دیکە...

**پ: ڕەفیقتان لەوێ کێ بوون؟ دیارە یەکێکیان مامۆستا غەریب بووە!**

و: وەڵا مامۆستا... ئەنجا لەوێ بنگردیەکان، قەڵادزەییەکان، ڕانیەییەکان، ئەوانە هەموو یەکترمان گرتەوە و وەکو ئەهلی مەنتیقە، دیارە مامۆستا غەریب پشدەری یەکێك بوو لە ئەوانە، مامۆستا ساڵح عەزیز، مامۆستا عەزیز محەمەدەمین، کە ئێستاش لە سەنگەسەرە، ماوە، تەقاعودە، وە کۆمەڵێك مامۆستا، کەواتە مەسەلەی برادەران، لەبەرئەوەی لە قیسمی داخیلی بووین، لە هەموو شوێنەکانەوە هاتبووین، تێکەڵاویەکی چاك بوو، مەسەلە برادەرمان لە چوارتا هەبوو، لە هەڵەبجە هەبوو، لە چەمچەماڵمان هەبوو، لە شارباژێڕ هەبوو، لە کۆیە هەبوو، هەمووی هاتبووین، تێکەڵاو ببووین، مامۆستا جەمال ڕەشید لە کۆیە بوو هاتبووە ڕانیە، لە ڕانیە هاتە سلێمانی، ئەویش لەگەڵ ئێمە هات خوێندنی تەواو کرد لەوێ.

**پ: مامۆستاکان کێ بوون لەوێ؟**

و: وەڵاهی مامۆستامان زۆر بوو، مامۆستا شەوکەت عەبدوڕڕەحمان، مامۆستایەکی کۆن بوو ئەوە سدارە درێژەکانی لەسەر دەکرد، وە مامۆستا مەسعوودێکی جوغرافیامان هەبوو، مەسعوود محەمەدەمین، ئینسانێکی زیرەك بوو، مامۆستا کەمال ئەمینێکمان هەبوو کە پێیان دەگووت کەماڵە سووسە، مامۆستای ئینگلیزی بوو، مامۆستای چاك بوو، مامۆستا غەفوورمان هەبوو، مامۆستا عەبدوڵڵا زێباریمان هەبوو، ئەوانە هەموو مامۆستای چاك چاك

و خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی زۆر و، بە ڕاستی ویستیان ئیستیفادەمان پێ بگەیەنن، هەتتا ماموستا بە ڕاددەیەك کەم بوو، مەسەلەن لە میسرەوە مامۆستایان هێنابوو، سلێمان مەللاح یەکێك بوو لەوانە، هەندەسەی پێدەگوتین. لە لەندەنەوە مامۆستایان هێنابوو کە دەرسیان بە خەڵك دەگووت، بۆ نموونە مامۆستا (جۆزیف)ێکمان هەبوو، مامۆستا جۆزیف خەڵکی لەندەن بوو، لەوێوە هاتبوو، هیچ زمانێکی کەی نەدەزانی، لە ئینگلیزی زیاتر، ئینگلیزی پێ دەگوتین، ئیستیفادەیەکی زۆرمان لێکرد، من بە شەخسی خۆم، لە متەوەستە دەمتوانی لەگەڵ ئینگلیزێك قسە بکەم، تێی بگەم و تێشی بگەیەنم، بەڵام لە ئەنجامی مومارەسە نەرکردن ئەوە لەبیر خۆمان بردەوە، کە کەوتمە دراسەشەوە، خووم بە کوردییەکەوە گرت و ئیدی ئاوای لێهات...

**پ: مامۆستا، ئەوە ساڵانی متەوەستە، سێ ساڵ بوو؟ وەنیە؟**

و: بەڵێ.

**پ: لە ساڵی چەند بۆ چەند بوو، وەك بەبیرت بێ؟**

و: وەڵا من، جارێ کە لە ئیبتیدایی دەرچووین، وا بزانم دوو ساڵ نەمخوێند، لە دوایە چوومەوە بۆ خوێندن، ساڵێك کەوتم، لە پەنجا و هەشت چوومە خانەی مامۆستایان، لە پەنجا و دوو دەرچووم لە سەرەتایی، بەڵام نەمخوێند ماوەیەك، ئنجا نازانم ساڵێك یا دوو ساڵ بوو، مەعلووم ساڵێکیش دەرنەچووم، لەوەوە بەوە دەزانم لە ساڵی ١٩٥٨ لە شۆڕشی عێراقی، من چوومە خانەی مامۆستایانی سلێمانی...

**پ: سێ ساڵ بوو یا دوو ساڵ بوو؟**

و: ئەو کاتە سێ ساڵ بوو، ساڵی خوێندنی ١٩٦٠ بۆ ١٩٦١ تەواوم کرد، ١٩٦١/١٠/٢٥ من ئەوەڵ ساڵی تەعینم بوو، لە مەکتەبی کانی توو...

**پ: مامۆستا، ئەو مامۆستایانەی لە متەوەستە، کە تەئسیریان هەبووە لەسەر جەنابت، هەم لە بواری ئەدەبی، هەم لە بواری کورایەتی؟**

و: بەڵێ، وەڵاهی لە بواری ئەدەبی و کوردایەتی بەڕاستی من کۆمەڵێك مامۆستا تەئسیرێکی کوللییان بەسەرمەوە هەبوو، مامۆستا جەمال غەفوور، مامۆستا عەبدوڵڵا زێباری، ئەوە لە خانەی مامۆستایان مامۆستام بوون، بەڕاستی لە بارەی کوردایەتییەوە ئیستیفادەیەکی باشم لێکردن، لە زۆر شوێنیش ناوم بردوون، بەتایبەتی لە ژیانی خۆمدا لە

کۆکردنەوەی دیوانی عەلی بەردەشانیدا، لە ئاخیریدا من ئاماژەم بەو دوو مامۆستایە کردووە کە مەمنوونیانم کە هێناویانمە سەر ئەو ڕێگایەی کە پێویستە من بیگرم بۆ تێکۆشان بۆ نەتەوەکەم، ئەوەی جەمال غەفورم لە فکر ناچێ، لە دەرسێکدا بۆی باس کردم کە: القومیە اسمی مشاعر البشر، یەعنی نەتەوایەتی بەرزترین هەستی مرۆڤە! لە دەلاقەی نەتەوایەتییەوە دەبێ تۆ بڕوانیە مرۆڤ، چونکە کە بۆ خۆت هیچ نەبی، هیچت بۆ مرۆڤ پێ ناکرێ، کە بۆ خۆت دەسەڵاتێکت نەبێ، چۆن دەتوانی خەڵکێك ڕزگار بکەی! دەبێ بۆ خۆت ببی، ئینجا پێی ڕزگار بکەی، مەمنوونی مامۆستا عەبدوڵڵا زێباریم کە ئەو ڕێگایەی پێشاندام، وە ئێستاش خۆم بە قەرزداری ئەو دوو مامۆستایە دەزانم...

**پ: مامۆستا، ئەی لە خانەی مامۆستایان؟ لەوێ ئەو مامۆستایانەی کە تەئسیریان بەسەر تۆوە بووە.**

و: وەڵا جا هەمان مامۆستایەکانی کە لە ناوەندی دەرسیان پێ دەگوتم، هەمان مامۆستایانیش هەر هاتنەوە بۆ هەمان شوێن و ئەو دوو مامۆستایە، هەر لە گەڵم بوون، هەتاوەکو من لە خانەی مامۆستایانی سلێمانی دەرچووم. من، قوتابیەکی خۆشەویست بووم لە کن مامۆستا، ڕێزێکی تایبەتی مامۆستا لە لای من هەبوو، لەبەر ئەوەی کە من ڕێزی مامۆستایانم زۆر دەگرت، کێشەم قەت بۆ مامۆستا دروست نەکردووە، وە ئەوانیش هەر بەو چاوەوە سەیری منیان کردووە وەکو کەسێك، دووبارە لەناو برادەرانی ئێمە بەڕاستی کۆمەڵێك خەڵك هەبوون لە سلێمانی کە خەڵقی سلێمانی بوون، زۆریان برادەرایەتی ئێمە کە وەکو لەو شوێنانە، لە قەزا و ناحیەکانەوە چووبوون، پێ خۆشبوو، وە ئێستاش کە دەمانبینن یا دەیانبینین، دڵمان بە یەکتر خۆش دەبێ. ژیانێکی ناخۆشم نەبوو، ژیانی خوێندنم لە سلێمانی، ژیانێکی ناخۆش نەبوو، بە تایبەتی من کە خزم و کەس و کارەکانیشم لەوێ بوون، بێجگە لەوەی ئێمە بۆ خۆمان ئیمکانیاتێکمان هەبوو لە ماڵێ، وەلەو ئێمە نفوسمان نەبوو، بابم نەمابوو، بەڵام توانایەکمان هەبوو، وەکو ژیانی لادێ کە بتوانن من بە گوێرەی پێویست بەخێو بکەن لە سلێمانی. لە سلێمانیش خزمەکانم هەمیشە یارمەتیان داوم و فەرقیان نەکردووم لەگەڵ کوڕەکانی خۆیان و بەو شێوەیە من خوێندنم بردۆتە سەرێ...

**پ: مامۆستا، چۆن بە کردەوە داخلی مەیدانی سیاسەت و کوردایەتی بووی؟**

و: من لە سلێمانی هەتا شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، لەناو قوتابیاندا لە مەکتەبێ، (یەکیەتی قوتابیانی عێراقی) هەبوو، یەکسەر چوومە ناو ئەو

ڕێکخراوەوە، لە دوای ئەوە، ماوەیەکی پێ چوو، لێك جیا بوونەوە، یەکیەتی قوتابیانی عێراق و یەکیەتی قوتابیانی کوردستان، لێك جیا بوونەوە، من چوومە ئەو خانەیەوە کە یەکیەتی قوتابیانی کوردستان بوو، هەر لەوێشەوە پارتیم ناسی. کە شۆڕشی ١٩٥٨ بوو، کە تەماشای شیعارەکانم دەکرد، شیعارە نەتەوایەتییەکەم زۆر بەدڵ بوو، بەتایبەتی ڕقم لە کۆماری عێراق بوو کە دروست بوو، چونکە لە فەقەرەیەك تێیدایەتی دەڵێ: العراق جزء من الامة العربية ئەو کاتە من کەوتە فکرم ئەگەر عێراق جوزئێك بێ لە ئوممەی عەرەبی، ئەی کوردستانیش دەبێ جوزئێك بێ لە ئومەی کوردی، چونکە هەردووکیان یەك سیاسەت دروستی کردوون، یەك سیاسەت لێکی دابڕیوون لە پارچەی گەورەی خۆیان. ئەو دوو مامۆستایەش تەئسیرێکی زۆریان لەسەر من هەبووە، مامۆستا عەبدوڵڵا زێباری و جەمال غەفوور، لەبەر ئەوە لە بواری نەتەوایەتی و کوردایەتیدا خۆم دیتەوە، وە لەوێ بە ئەندامێکی پارتی وەرگیرام و وە زوربەی چالاکییەکانی ئەو سەردەمە، تێیاندا بەشدار ببووم، وەکو گەنجێکی بزێو و چالاك، سەرم بە زۆربەی شوێنەکاندا دەگرت، کۆمەڵێك کەس بووین وەکو شتێکی ناسیاومان لێهاتبوو لە سلێمانیدا...

**پ: مامۆستا، لە شۆڕشی ئەیلوولدا پێشمەرگایەتیت کرد؟**

و: لە شۆرشی ئەیلوولدا پێشمەرگایەتیم نەکردووە، بەڵام ئەمری گرتنم دەرچوو لە سلێمانی لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە، چونکە ئەگەر تەعینیش بووم، لە کانی توو، هەم کار و باری تەنزیمی کوردایەتیم دەکرد و هەم مامۆستاش بووم. لە دوای ئەوە لەوێوە ئیدی کە تێکچوو هاتمە بنگرد و، لە بنگرد هاتینە قەڵادزێ و ئەو جۆرە شوێنانە و چوومە سلێمانی، لە سلێمانی لە مەکتەبێك بووم، ئەمری گرتنم دەرچوو، کە ئەمری گرتن دەرچوو، من هەڵاتم...

**پ: مامۆستا ببوورە، چەند ساڵ لە کانی توو مایتەوە؟**

و: ساڵێك لە کانی توو بووم، لە دوای ئەوە هاتمە قەڵادزێ، لە دوای ئەوە کە حومەت ئینسیحابی کرد...

**پ: چەند ساڵ لە قەڵادزێ مایتەوە؟**

و: لە قەڵادزێ، وەڵا وا بزانم سێ ساڵ چوار ساڵ مامەوە، دوایە چوومە سلێمانی

**پ: دەکرێ بڵێین تا شەست و چوار لە قەڵادزێ بووی؟**

و: تا شەست و سێ پێم وایە، ساڵێك دوو ساڵ لەوێ بووم...

**پ: چونکە ئەگەر تۆ ١٩٦١ تەعین بوویی...**

و: بەڵێ، ساڵێك لە کانی توو، ساڵی دووەمی تەعینم هاتمە قەڵادزێ، لەبەر ئەوەی ئیدارە لە بنگرد نەما، سەحبیان کردینەوە بۆ قەڵادزێ، لە قەڵادزێش، ئیدارە نەما، سەحبیان کردینەوە بۆ سلێمانی، من لە سلێمانی بووم ئەمری گرتنم دەرچوو، کە ئەمری گرتنم دەرچوو، هەڵاتم، هاتمەوە قەڵادزێ و مەنتیقەی بنگرد و ئەوە، وەکو کادیرێکی نەتەوایەتی، وەکو کادیرێکی پارتی، لە شۆڕشی ئەیلوولدا جم و جۆڵم هەبوو، وە ئیللا وەکو پێشمەرگەی ڕەسمی من پێشمەرگایەتیم نەکردووە.

**پ: مامۆستا دوای ئەوە کار بە کوێ گەیشت؟ گەڕایتەوە سەر ژیانی مامۆستایەتی؟**

و: لە دوای ئەوە مفاوەزەیەك هات، وا بزانم ١٩٦٤ بوو، ئێمە کۆمەڵێك خەڵك بووین، هەموو ئەمری گرتنمان دەچووبوو، هەڵاتبووین. لە مفاوەزەکە، ئێمە داوای ئەوەمان کرد کە بگەڕێینەوە بۆ سەر وەزیفە، ئەو کاتە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانی، لە ڕانیە، لە سەنگەسەر، لە پشدەر و ئەوانە دادەنیشت، ئێمە پرسێکمان بەو کرد و ئیجازەی داینێ کە ئێمە ئیعادە ببینەوە. کاغەزی داینێ بۆ مودیریەتی ئەمنی عام لە بەغدا ئیعادە بینەوە، بەڵام کە چووینە ئەوێ، دەلیلێکی لێ بوو کوتی ئەو کاغەزە تەسلیم مەکەن، چونکە خەتەرە ئەو کاغەزە بۆ دواڕۆژ، من بە پارە تەعینتان دەکەمەوە. هەر یەکی بە پێنج دیناری ئەو کاتە، یەکسەر لە مەجلیسی خیدمە ئەمری ئیعادەکەی بۆ هێنناینەوە بۆ تەربیەی سلێمانی. من نەقڵی ناحیەی سیروانیان کردم لە مەنتیقەی هەڵەبجە، من نەچووم، کوتم ناچم و ناشمەوێ ئیعادە ببمەوە. دوایە هێنایانمەوە بۆ قەڵادزێ...

**پ: نازانی ساڵی چەند بوو؟**

و: وا بزانم ١٩٦٤ بوو...

**پ: مامۆستا، تا ئێرە هاتین، لەو بەینەدا باسی خوالێخۆشبوو مام ڕەسوڵ مامەندت نەکرد، ئایا ڕەفیقت نەبووە؟ دواتر یەکترتان ناسیووە؟ بە حوکمی ئەوەی ئێوە خەڵکی یەك مەنتیقەن؟**

و: پێم خۆش بوو باست کرد. ڕەسوڵ مەمەند، لەو تەڵەبانە بوو کە باسم کرد کە لە

بەردەشانەوە دەهات بۆ بنگرد و لەوێ دەیخوێند. ئینجا وا بزانم ساڵێك یا دووساڵ لە دوای منەوە بوو. ڕەسوڵ مەمەند، بە حوکمی ئەوەی کە خزم بوو، زۆر جاران شەوانەش نەدەچۆوە، کە نەشدەچۆوە، لێیان نەدەپرسیەوە لە ماڵێ، بۆ نەهاتۆتەوە، دەیانزانی یان لە ماڵێ ئێمەیە یان لە ماڵێ مامۆستا کاکە سوارە، یان لە ماڵێ... یانی کەسێك لەو خزم و برادەرانەی خۆمانە. کاك ڕەسوڵ مەمەندیش هەر لەو ساڵانە دەرچوو، ئیدی ئەو ئیختیاری پێشمەرگایەتییە ڕەسمی کرد، بەڵام من ئیختیاری پێشمەرگایەتییە ڕەسمیم نەکرد، ئەوەندەی کە کردووشمە وەکو کادیر هەڵسووڕاوم...

**پ: مامۆستا، تا ساڵی ١٩٦٤ و ١٩٦٥ و ئەوانە، داکت لە ژیاندا ماوە؟ یان پێشتر یان دواتر وەفاتی کردووە؟**

و: ئێمە لەبەر ئەوەی ماڵەکەمان، ماڵێکی بچکۆلە بوو، هەر سێ کەس بووین، وەکو باسم کرد بە فکرم نایە کە بابم عەمری خوای کردووە، داکم، هەم بابمان بوو هەم داکمان بوو، ئینسانێکی ئازا بوو، خوشکێکم هەبوو، خوشکەکەم مێردی کرد. ئێمە دوو کەس ماینەوە لە ماڵێ، کە دوو کەس ماینەوە، ئیدی من دەربەدەر بووم، چ بۆ وەزیفە و چ بۆ کاری حیزبی و ئەو جۆرە شتانە، داکم بە تەنێ لە ماڵێ مایەوە، داکم تووشی نەخۆشی بوو، کە تووشی نەخۆشی بوو، ئەویش ماڵەکەی تێك دا، ماڵەکەمان تێکچوو، خاڵم بردبوویەوە ماڵی خۆیان، ئەو لەوێ مایەوە، ئەو ماڵەی کە هەمان بوو، حەیوانات و شتمان هەبوو، هەمووی بڵاو بوو، تێك چوو، ئیدی بەولا و بەو لادا ڕۆیی، ئەوی فرۆشرا داکم کردی بە مەسرەفی نەخۆشی خۆی و باقی کە، بەو لاو بەولادا ڕۆیشت، هەتا ساڵی ١٩٦٥، ١٩٦٥ من لە قەڵادزێ خێزانم پێکەوە نا، کە خێزانم پێکەوە نا، داکیشم هێنا بۆ کن خۆم، لەوێ مایەوە لە قەڵادزێ هەتا ساڵی ١٩٦٦، لە پایزی ١٩٦٦دا داکم عەمری خوای کرد لە گۆڕستانی قەڵادزێ بە خاکمان سپارد. لەوێش بە دواوە کە من خێزانم پێکەوە نا، ئیدی هەر ئەو ساڵەی کە من بووم بە خاوەنی خێزان و ماڵێکم پێکەوە نا، پێم وایە یەك دوو مانگی بەسەردا تێ نەپەڕی گرتیانم...

**پ: ساڵی ١٩٦٦؟**

و: ١٩٦٥...، کە گرتیانم ئەمن ماڵم هەبوو، بەس خۆم و ناسکەخانی خێزانم بووین، کە گرتیانم نەفیان کردم بۆ عەمارە...

**پ: بە تەنیا بووی؟**

و: ئێمە هەشت کەس بووین، ئەو ڕۆژە گرتیانین بە تۆمەتی ئەوەی کە بۆیان دروست کردبووین، ئەمانە حەلەقەی وەسڵن لە بەینی، وەکو بۆ خۆیان دەیانگووت، موتەمەڕدین و جەماوەردا، لەبەر ئەوە مەرغوب نین بمێننەوە لە کوردستاندا و دەبێ دوور بخرێنەوە، بە ئەمرێکی ئیداری گرتیانین و یەکسەر نەفیان کردین، من و مامۆستا عەلی میرزا بەر عەمارە کەوتین، کۆمەڵێکی کەمان بەر زوبێر[1] کەوتن، کۆمەڵێکی کەمان بەر مەنتیقەی ناسرییە و شوێنێك بوو پێیان دەگووت (سوق الشیوخ) بەر وێ کەوتن، ئەو نەفیکردنەمان مایەوە، ماوەی ساڵێکی پێ چوو، وا بزانم ١٩٦٦ یان زیاتر بوو، کابرایەکی مەدەنی هاتە سەر حوکمی عێراق ناوی عەبدولڕەحمان بەزاز بوو، عەبدولڕەحمان بەزاز کە تەماشای ئەم هەموو نەفیەی کردبوو، ئیدی قەراری دا، بۆ ئەم هەموو نەفیە کە لە خوارووی عێراقیيە، حەشدێکی زۆرە، ئەمرێکی دەرکردبوو کە ئەو نەفیانە ئارەزوی خۆیانە هەر کەسێك دەگەڕێتەوە، ئێمەش عەریزەمان دا و ئیدی گەڕاینەوە و هاتمەوە قەڵادزێیەکەی خۆمان و دوبارە دەستم بە مەسائیلی مەکتەب و خوێندن و ئەو جۆرە شتانە کردەوە.

**پ: لە کام مەکتەبەی بووی لە قەڵادزێ؟**

و: لە قەڵادزێ ئەووەڵ جار مەکتەبی پشدەر. پشدەر، لە خانوەکەی حەمەی حاجی برایم باوزی، وا بزانم (مەحموودی حەمەی ئەولێ) یا یەکێکی دیکە ناوی حوسێنە فەندی بوو، ئەو دوانە هەردوکیان مودیری مەکتەب بوون، لە دوایەش جارێکی کە چووینەوە مەکتەبی ئاسۆس و ئیدی لە دوایە هاتینەوە و، بە گوێرەی پێویستییە، تەنانەت لە حوکمی بەعسیاندا جارێك نەفیان کردم، هەر لە داخلی قەڵادزێ، وەکو نەفی بە ئیجباری، نابێ ئەتۆ لەو مەکتەبەی بی، دەبێ بچیە ئەو مەکتەبە...

**پ: مامۆستا لە شەست و شەشەوە تا نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول، ئەو بەینە چۆن گوزەرا، چت کرد، چت نەکرد؟**

و: من دایمە زۆر حاڵەتم ناخۆش بوو، دیارە لە لێکبوونەوەکەی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی پارتی بە قیادەی خوالێخۆشبوو مستەفا بارزانی، من کەوتمە باڵی مەکتەبی سیاسییەوە، بەڵام من هەموو کاتێك، ئەوە ڕۆیشت و بڕایەوە، وەکو کورد فکرم کردۆتەوە، هەموو دەمێ، ئێستاش و ئەو وەختەش من هەر وەکو کرد فکرم کردۆتەوە و هەرواش فکر دەکەمەوە، لەبەر ئەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان کەسێك نەبووە من، لە کاتێکدا کە دەسەڵاتم بووە، قسەیەك یا شتێکی ناشیرینی بەرابەر بکەم، بەڵکو خەڵکم بە کورد زانیووە و، ئیدی خەڵك

[1]– قەزای زوبێر– پارێزگای بەسرە.

کوردە، قەومێکی لێ قەوماو و لە وڵاتی خۆی دەربەدەرە و، خەڵکێکە حەقی خۆیەتی کوردایەتی دەکا، لەم بەرەی ناکا لەو بەری دەکا، کەیفی خۆیەتی...

**پ: مامۆستا گیان لە ڕۆژگاری نسکۆ، کە بڵێین چەند مانگێکی خایاند، کەمتر لە ساڵێك، چیت کرد؟ وە دوای ئەوە لە هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ، بۆیە دەڵێین شۆڕشی نوێ، چونکە جەنابت حەتمەن دوای ئەوە پەیوەندیت بە یەکێتیی نیشتیمانییەوە کردووە، ئەگەر باس لە جمو جۆڵەکانی خۆت بکەی...**

و: لە دوای ٢٤/٤/١٩٧٤، کە بۆردومانەکەی شاری قەڵادزێ کرا، خەڵکی قەڵادزێ پەروازە بوو بەو لا و بەو لادا هەڵاتن، من جاری یەکەم نەڕۆیشتم، مامەوە، چونکە نەمدەویست بچمە ئێران، بەڵام جاری دووەم، لە پاییزەکەی جارێکی کە قەسف کرایەوە، ناچار بووم چووم، ماوەی ساڵێك لە ئۆردوگای (سەراب گەرم) زستانێکمان بەسەر برد، ئیدی هەتا بەهارەکەی، بەهارەکەی کە نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول بوو، ئیدی وا بوو کە وەکو عەفوویەك کە گەڕاینەوە هاتینەوە و دووبارە ئیعادە بوومەوە بۆ وەزیفە و دیسان هاتمەوە قەڵادزێ. لەو کاتەدا من وەزعم زۆر زۆر نالەبار بوو، چونکە دەمدی بەعسیەکان بە هەلیکۆپتەر چەو و لم و چیمەنتۆیان دەبرد بۆ سەر شاخی، ئەوان دەیانگوت ئەگەر بارزانی نەمێنێ، کورد لەجێی خۆی بە ئیستیقرار دادەنیشێ و ئیدی ئێمە حوکمی زاتی دەدەینێ و وا دەکەین و وادەکەین، ئەم قسانەم بە لاوە هەموو وەکو شتێکی تەفرەدەر و یاخود ئەو جۆرە شتانە وابوو، نەدەچۆ عەقڵمەوە، هەمیشە دەترسام لە بەعس بەڵام هیچ چاریشم نەبوو تازە هاتبوومەوە و تێکەوتبووم و دەرچوونم نەدەکرا، لەو کاتەدا کە تروسکایی نەمابوو، من دەگەڕام بۆ ڕێکخراوێك، بۆ کەسێك کە بزانین ئایا ئەم شۆڕە زەبەلاحە ئاوا وەکو دەڵێن بەکون فەیەکونێك توایەوە، ئایا چی جێی دەگرێتەوە؟ خۆی سەرهەڵدەداتەوە؟ هیوای خەڵك چیە؟ برادەرێك هات پەیوەندیی پێوە کردم، کاك عەبدولقادری سۆفی خدر کە ئێستا ماوە، ئەو کاتە ماڵی لە سەنگەسەر بوو، موزەمید بوو، هەر لە تەمەنی مندا بوو، گوتی ڕێکخراوێك هەیە، دەزانم زۆر موتەئەسیری، دیارە لەبەر ئەوەی کە ئێمە خزمیشین، ماڵمان وەکو ماڵی یەکتر وا بوو، پێی گوتم پێم خۆشە بچینەوە ماڵێ، هاتبۆ قەڵادزێ، چووینەوە ماڵێ خۆمان، بۆی باس کردم کە ڕێکخراوێك هەیە پێی دەگوترێ ڕێکخراوی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان) وە ئەو پەیوەندیی پێیەوە هەیە بەو ڕێکخراوەوە و پەیوەندیەکەشی لە سلێمانیە، برادەرێك هەبوو ناوی عەبدوڵڵا تۆفیق بوو، مەعاون توببی بوو، ئەوە حکومەت گرتی و ئیعدامی کرد، کاك عەبدولقادر پەیوەندی بەو برادەرەوە هەبوو، منیش بڕیارم دا لەگەڵ کاك عەبدولقادر ئیش بکەین، وا بوو ڕێکخراوێکمان هەبوو،

ڕێکخراوی (ڕێبەندان) کە ئەو کاتە لەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. ڕێکخراوی ڕێبەندان، ڕێکخراوێکی بەناوبانگ بوو، کۆمەڵێك خەڵکی ئازای تێدابوو، کۆمەڵێك خەڵکی وریای تێدا بوو، ئیدی کاریان دەکرد...

**پ: مەسئولی ڕێکخراوی ڕێبەندان کێ بوو؟**

و: مەسئولی ڕێکخراوی ڕێبەندان، ئەوەل جار کاك عەبدولقادر بوو، لە دوایە ڕێکخراوەکە، پەرەی ستاند، زیاد بوو، لق و پۆپی لـێ بۆوە، من بۆ خۆم بووم بە مەسئولی شانەیەك لە شانەکانی ئەو ڕێکخراوە، دوایە وای لـێ هات ئیدی کاك محەمەد سوڵتان و کۆمەڵێك خەڵکی کە چوونە دەرێ[1] و کاك مستەفای سەید قادر چۆ دەرێ و مامۆستا سعید و نازانم... ئیدی لەوێ (کەرت)ێکی ڕێکخستنی قەڵادزێ دروست بوو، کە لە چنارنێ بوو، یەکسەر من کە ئیستیقلالیەتی خۆم وەرگرت، پەیوەندیم کرد بەو کەسانەوە...

**پ: تا دەگاتە ڕۆژگاری ئەمڕۆ...**

و: تا دەگاتە ڕۆژگاری ئەمڕۆ، من لە زەمانی بەعسدا، لە مانگی ۲ ی ۱۹۷٦ من پەیوەندیم کرد بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە، یەکەم کەسیش، یەکەم ڕێکخراویش بوو کە پەیوەندیی بە منەوە بکا لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوولدا. بڕوام پێ بکە ئەگەر حیزبێکی کەش با هەر دەچوومە ناوی، پارتی زووتر لە ئەوان پەیوەندیی پێوە کردبام، دەچوومە ناوی، بەڵێ حیزبێکی کەی نەتەوەیی هەبایە پەیوەندیی پێوە کردبام... ئەمن دەگەڕام بۆ کەسێك، کە ئەو هات و گوتی شتێکی ئاوا هەیە، یەکسەر داخڵ بووم، بۆیە یەکسەریش موددەی ئەوەم بۆ دانەنرا، ئەوە پاڵاوتنە، ئەوە تەجرووبەیە و ئەوە، یەکسەر بە ئەندام وەرگیرام بە ناوی (ڕێبوار)ەوە، وە کارەکانی خۆشم، چی بەسەرمدا فەرز کرابێ، ئەنجامم داوە، تەنانەت یەك خاڵم ئەنجام نەدا، لە دوای کیمیا بارانەکەی (دۆڵی جافایەتی) پاشی ماوەیەك کە پێشمەرگە زۆر خۆی تەسلیم دەکـردەوە، ڕۆژێك بە دوامدا هاتن، گوتیان ئەمشەو وەرە بۆ فلان ماڵەی، گوتم ئاخر مەنعەتەجەولە و من پێشی نازانم، چۆن بێم ئەم هەموو جاش و عەسکەر و شتە، گوتیان کاکە بە دواتدا دێین. دیارە شەوەکە بەفر بوو، بە دوامدا هاتن، کە چووم ماڵی (وەستا بەکری ئاسنگەر)ی برای (ئەحمەد بچکۆل) بوو، کە چوومە ژوورێ، ئەم کاك مستەفای سەید قادر و (کاکەمین قادر[2]) ئەو دوانە لەوێ بوون،

---

۱- چوونە دەرێ: مەبستی لەوەیە کە لە سنووری دەسەڵاتی ڕژێم چوونە دەر و چوونە شاخ، بۆ سنووری ئازادکراوی شۆڕش و بوون بە پێشمەرگە... ئەو ناونانە، ناونانێکی عامی بوو، لەنێو خەڵکدا زۆر باو بوو، کە دەگووترا فلانکەس چۆتە دەرێ، واتا ئەو کەسە بووە بە پێشمەرگە. (ئامادەکاران)

۲- کاکەمین قادر: ئەمین قادر مینە ناسراو بە (چیا)، لەدایکبووی ساڵی ۱۹٥٦ قەڵادزێ، دانیشتووی

که هاتبوونەوە، که چاوم پێکەوتن پێم سەیر بوو لەو زروفەدا، چونکە خەڵك زۆر خۆی تەسلیم دەکردەوە، گوتم ئەمانەش دەبێ هاتبنەوە خۆ تەسلیم بکەن، یەعنی تەسەوری من ئەوە بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر ئەمانە خۆیان تەسلیم بکەنەوە، مەعنای وایە هەرچی سرپیاتەکان هەیە دەیزانن ئەوانە، کە چاوم پێکەوتن پێم ناخۆش بوو، یەکسەر زانیان هەستم چییە! گوتیان ئەوەی تۆ تەوەقوعی دەکەی ئەوە نییە، وەرە دانیشە، دانیشتم لە لایان، گوتیان ئێمە هاتووینەوە تەنزیمات بە تەواوی تێك چووە، بە تایبەتی تەنزیماتی هەولێر هیچی بە هیچەوە نەماوە، دەمانەوێ ئەو تەنزیماتەی کە تێکچووە، بەهۆی کیمیاباران و ئیدی نەقڵ کردن و لێك بڵاوبوون و ئەوە، ئەم تەنزیماتی ناوخۆیە هەموو پەیوەندی پێوە بکەینەوە بە یەکەوە، گوتم باشە کاری من چییە؟ گوتیان کاری تۆ، ئێمە پێمان باشە کەرتی ڕێکخستنی ناو شاری قەڵادزێمان بۆ وەرگری، من ئەو کەرتەم وەر نەگرت، گوتم ئەوە بە من ناکرێ وەری ناگرم، گوتیان بۆ ناکرێ؟ گوتم من وەزیفەم هەیە، عەلامەتێکی ئیستیفهامیشم لەسەرە، جەماعەتێکی خۆم هەیە بەڕێوەیان دەبەم، بۆ ئەوەی نە منیش توشی مەشاکیلێك بم نە کەسێکی کەش تووشی موشکیلەیەك بکەم، پێم باشە ئەوەیان بدەن بە کەسێکی دیکە، من تەنانەت ئەوەی خۆم بەڕێوە دەبەم. لە هەموو ژیانی دەوری چواردە پازدە ساڵ (کۆمەڵە)یەتی، ئەم خاڵەم جێبەجێ نەکردووە، ئەویش وا بزانم، کە من نەمکرد یەکسەر ئەحمەدە چوکەلیان دانا، کاك لوقمانیان دانا، شاسواریان دانا، عەلاکوللین یەکێك لەو برادەرانە کەرتەکەی گرتە دەست. تەبیعەتی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانیش وا بوو، تۆ هەر خۆت و ئەوەی لەگەڵتە دەیناسی، هەقت نیە بەسەر کەسی کەشەوە، کە بشت ویستبایە کەسێك بهێنیە ڕیزی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە، لەگەڵ قسەکردن تێی دەگەیشتی پەیوەندیی هەیە یان نییە، چونکە ئەدەبیاتەکانی یەك ئەدەبیات و یەك سەرچاوە و یەك قسەکردن و یەك ڕۆشنبیری بوو، یەکسەر تێی دەگەیشتی... هەتاوەکو ڕاگواستن[1]، لە ڕاگواستن دیارە من چوومە سلێمانی و لە سلێمانی وەزعم ناجۆر بوو، چوومە هەولێر، کە چوومە هەولێر، لەوێ کاك مستەفا شاسوار و کاك مستەفای سەید قادرم دیتەوە کە خانوویەکیان گرتبوو نازانم لە گەڕەکی مفتی بوو پێم وایە، حەی زەراعە و شتی وایان پێدەگوت، چووم لەوێ ئەوانم دیتەوە قسەم لەگەڵ کردن، گوێتان پێمان باشە بێیە ئێرە و خۆت نەقڵ کەی، بێی لە هەولێر لەگەڵ ئێمە بی، ئیش لە گەڵ ئێمە بکەی. وابوو چوومەوە سلێمانی و لەوێ بە هەچ مەسەلەیك بوو توانیم خۆم نەقڵ

لەندەن – بریتانیا، نووسەری کتێبی سێ کوچکەی بەعسیان – تەڕحیل، تەبعیس، تەهجیر، کە نێوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە شاخ لە ساڵی ١٩٨٧ چاپی کرد.

١– مەبەست لە ڕاگواستنی تەواوی خەڵك و قەزای قەڵادزێ و ناحیە و دێهاتەکانی سنووری پشدەرێیە بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەکانی سلێمانی و هەولێر لە حوزەیرانی ١٩٨٩.

بکەم. دیارە مامۆستاکانیان لە تەربیە کۆکردینەوە: کێ پێی خۆشە بچێتە هەولێر؟ کێ پێی خۆشە لە سلێمانی بمێنێتەوە، بۆ من فرسەتێکی زۆر باش بوو، یەکسەر دەستم بەرز کردەوە کە من دەڕۆم بۆ هەولێرێ، بیتاقەی تەرحیلەکەم، کە ئێستاش ماوە، بۆیان گۆڕیم بۆ هەولێر و هاتم و چوومە لای هەردوو کاک مستەفا، مستەفای سەید قادریش و مستەفای شاسواریش و کۆمەڵێك برادەرانی کەش لەوێ بوون، هات و چۆیان دەکرد، کاك مستەفای مەلا عەوڵا بوو، کاك لوقمان بوو، مامۆستا کەیفی بوو، کۆمەڵێك خەڵکی دیکەش بوو کە هاتوچۆمان دەکرد. ئیدی وەکو جاران دەستمان کردەوە بە کارکردن. لەوێ مەسئولیەتی کەرتی ڕێکخستنی (دارەتوو)م وەرگرت، بەشی قەڵادزێیەکان.

**پ: مامۆستا با لەو بوارە زۆر نەدوێین، چونکە کاك بوار دیمانەیەکی تێر و پڕی لەگەڵدا سازداوی وە لە کتێبەکەشیدا۱ بڵاوی دەکاتەوە، بەس من دەمەوێ بێمە سەر بواری ئەدەبی و کەلەپوور و فۆلکلۆر، جەنابت یەکەمجار لە بواری شیعردا کارت کردووە و شتت نووسیووە، دواتر بەلای کەلەپوور و فۆلکلۆردا شکاویتەوە، یەکەمجار دەمەوێ ئەوە بپرسم کێ تەئسیری ئەدەبیی لەسەر جەنابت هەبوو؟**

و: وەڵا تەئسیری ئەدەبیەکەم، شوێنەکەی کە تێیدا ژیاوم، مەسەلە دەڤەری مەرگە، چ دەڤەری پشدەر، دەڤەرێکە پڕیەتی لە کەلەپوور و داستانی خۆش خۆش و بەسەرهات و... کە چوشمە سلێمانی، لە سلێمانی زیاتر واسیع بوو، مەنتیقەی کەلەپوورەکە واسیعتر بوو، مێشکی منیش لەگەڵ کەلەپوورەکە، لەگەڵ شوێنەکە، ئەویش مەدایەکی کەی وەرگرت، چونکە ڕۆژانە من جەریدەم دەخوێندەوە، جەریدەی ژین، جەریدەی ژین کە دەردەچوو، چەند عەدەدی لێ دەرچووبێ من هەر هەموو عەدەدەکەیم خوێندۆتەوە، وە تەئسیری شیعری هی کوردیش بە تایبەتی حەمدی ساحێبقڕان زۆر لەسەر من هەبوو، چوارینەکانی عومەر خەییام، کە شێخ سەلامی عازەبانی تەرجومەی کردبوو، وە دیوانی شێخ سەلام بۆ خۆی، ئەوە زۆر تەئسیری لەسەر من هەبوو، وە لەوێ ئیدی گرنگیم دا بە ئەو مەسەلە. بەینێك خەریکی شیعر نووسین بووم، لە دوایی داستانەکانم ئەوەندە پێ خۆش بوو، ئەو داستانە، بەیتەکان و لاوکەکان و، مەسەلە مەم و زین، قەر و گوڵەزەر، خەج و سیامەند و ئەو جۆرە شتانە... ئینجا دیوانی شاعیرەکان بەتایبەتی دوو سێ دیوانی شاعیرم هەر بە کامیلی لەبەر بوو، مەسەلە، ٢٥٦ ڕوباعیاتی عومەری خەییام، کە شێخ سەلام تەرجەمەی کردبوو بە کوردی، هەر ٢٥٦یم لەبەرکردبوون وە لێکدانەوەشم لەسەر دەکرد. شیعرەکانی ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان، لێکدانەوەم لەسەر دەکرد. دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی

---

١- مەبەست لە کتێبی (ئەستێرەی سوور)ە، کە تایبەتە بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و چالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوە، لە سنووری پشدەر هەر لە ساڵانی ١٩٧٦ تا ڕاگواستنی پشدەر لە ١٩٨٩

بەشە کوردییەکەی، بە تەواوی هەر هەموویم لەبەر بوو، ئەوانە منیان ڕاکێشا بۆ ئەوەی کە بکەومە خۆشەویستی ئەدەب و ببمە ئەدەبدۆستێك و بەوشێوەیە...

**پ: مامۆستا، یەکەمجار لە کوێدا شتت بلاو کردەوە؟ وە چی بوو بابەتەکە؟**

و: دیارە من، شتەکان، وەکو فۆلکلۆرەکە، کۆشم دەکردنەوە و دەشمەویست بۆ خودی خۆشم فێریان ببم، لەبەر ئەوە گرنگیم پێدان و دەمنووسینەوە، یا لە مێشکی خۆمدا، وەکو خەزن، خەزنم دەکردن، یا زۆر جار بۆ خۆم بە هەمان ئاوازی کە دەمبیست، بە هەمان ئاواز دەمگوتەوە، وا بزانم ئایشە گوڵ بوو کە لە داستانی بەسەرهاتەکەی چوکەلەسوار و ئایشەگوڵێ دوام، کۆپلەکانی، کۆپلەی زۆر ئەدەبی بە قوەت بوون و لە (هاوکار)یدا، نازانم ساڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری حەفتاکان، من یەکێك لە هینەکانم ئەوەیە ساڵم لە فکر نامێنی!... لە دوایە، ئایشەگوڵ کە یەکەم بەرهەمم بوو کە بلاو کرایەوە، هەر لەو سالانەدا داوایان لێکردم، چووم لە کتێبخانەی گشتی دیتمەوە و ئیستینساخم کرد بۆیان. لە دوای ئەوەی بلاویان کردەوە، خەڵکێك خوێندبوویەوە، کە خەڵکێك خوێندبوویەوە، دیارە بێجگە لە خودی ناوەرۆکی داستانەکە، نووسینەکەی منیشیان پێ خۆش ببوو، پێشەکیەکم بۆ نووسیبوو، پێشەکییەکەیان پێ خۆش بوو، من پێم خۆش بوو کە خەڵکێك هەیە باس دەکا دەڵێ شتێکی بە پێزە و شتێکی خۆشە، ئیدی لەسەر ڕەئی برادەرانیش، ئەوەندی دەسەلاتم بەسەریدا بشکێ ئەو بەیتە کوردیانە بە دوایاندا کەوتم و کۆم کردنەوە و لە دەفتەری گەورە گەورەدا نوسیومنەوە و...

**پ: مامۆستا لە سەرەتای مامۆستایەتیتەوە، خەریکی کۆکردنەوە و ئامادەکردنی ئەو بەیت و بابەتانەی، باشە بۆ لە دوای ڕاپەڕینەوە، بلێین لە دوای ٢٠٠٠ەوە کەوتیە چاپکردنیان بە کتێبە؟ بوار نەبوو؟**

و: بەڵێ، کاك ئارارات، شتێك هەبوو، لە زەمانی دەسەلاتی بەعسدا، شتێك ئەگەر بشتزانیبایە دەبوو بیمرێنی، نەك ئاشکرایکەی! چونکە یەکسەر داوایان لێدەکردی کە ئەوان لێت وەرگرن، وە بۆ خۆیان بۆت جێبەجێ بکەن، وە هی خۆیانی بزانن، لەبەر ئەوە من زوربەی ئەو شتانە، پێم خۆش بوو، نەك هەر شتەکان، بۆ خۆشم بمرم نەك هی ئەوان بم، نەك هەر بابەتەکە، پێم خۆش بوو بابەتەکەش بمرێ بەلان هی ئەوان نەبێ، بۆ نموونە من لە قوتابخانەکان لە خۆمەوە لەنێو مامۆستایان هینێکی خێریم دانابوو بۆ قوتابیی هەژار، سەری مانگان ئەو مامۆستایە دینارێك و ئەو نیو دینار و ئەوە و لە حانووت شتێك و هەمووم کۆ دەکردەوە، هێندێك شتم دەکڕی بۆ تەڵەبەی هەژار، وە دووبارە لە بازاڕدا دوو سێ کەس

هەبوون یارمەتیان دەدام، کاك جەلالی خەیات – جەلالی عەولاغای، خالیدی مەلای حاجی حەسەنی، کابرایەکی کە هەبوو حەسەنی چایچییان پێدەگووت، دوکانی دانابوو، کراس و فانیلە و ئەوەی دەفرۆشت، ئەوانەش یارمەتییان دەدام، بۆ خۆشم پارەیەکم کۆ دەکردەوە. دەچووم لە ئۆردوگای پێماڵکێ، کە لەوێ موحازەرەم هەبوو، شتم دەکڕی دەمهێنا دامدەنا لە مەکتەبێ، تەلەبەیەك کە دەمبینی ڕووتە، یەکسەر فانیلەم دەدایە، تەڵەبەیەك قەڵەمی نیە بۆم دەکڕی. بەعسیەکان پێیان زانی بۆوە، بانگیان کردم ڕۆژێك، گوتیان ئەتۆ کارێکی زۆر پیرۆز دەکەی و کارێکی باش دەکەی ئێمەش یارمەتیت دەدەین و پێویستە ئێمەش ئاگادر بین و ئەوە و ئەوە، بۆ ئەوەی تێوە بگلێم لە هێندێك مەسایل، لەبەر ئەوە وازم لەوەش هێنا وردە وردە لێی کشامەوە بۆ ساڵی دوایی هەر بەلایدا نەچووم، لەبەر ئەوە، ئەوەش کەوتە سەر بەر ئەو فکرەیە، هەر کۆم کردۆتەوە و نووسیومە لە دەفتەراندا. ئێستا دەفتەرەکانم ناوم لێناون، مەسەلە یەکێکیان بە ناوی (چووزە بیزا)وەیە. چووزە بیزا، چووزە، ناسکترە لە چرووزە، دەنا چرووزەیە و کردوومە بە چووزە، ئەویش کچۆلێکی هێند جوانکیلەم دیت خێرا بۆ لەسەر نووسینی ناردم بە دوای (ئەحمەد قادر) و (غەریب پشدەری)دا، بێن لەسەری بنووسن، بەلام هەتا هاتن ڕۆیشت و... بە ناوی ئەوەوە ناوم نا چووزە بیزا. ئەو دەفتەرە، دەفتەرێکی گەورە بوو، دەوری ٤٠٠ لاپەڕەی گەورە دەبێ، پڕ بۆوە، کە پڕ بۆوە ئەوجار لە خۆشی گۆرانیی (دەبا لێ نێن پێشباران هەواری کەند و لەندان خێڵی قادری سێمانی هەڵیان دا لە سامرەندان) ئەو دەفتەرەشم ناو نا (پێشبار)، ئنجا لە دوای ئەوە (جوانستان) و (وڵاتی جوانان) ئەوانە دوو دەفتەری گەورەن، شتەکانم هەر هەموو لەوێدا دەنووسیەوە بەبێ ئەوەی بڵاوی بکەمەوە. لە دوای ئەوە کە زانیم ئیدی وەکو کە تۆ لە ئنستیتیوتی کەلەپووری کوردی باست کردبوو، دیارە ئەوان بە دوایاندا ناردم دکتۆر ئەلبێرت و کاك مەزهەری خالەقی، جارێك، من و کاوسێن بووین[1]، دیارە جاری یەکەم فەرامۆشمان کرد، لەبەرئەوەی ئەوەندە پڕ ئیش و کاری حیزبایەتی بووین، بۆمان نەدەکرا، وا بوو بۆجاری دووەم دیسان هەر ئەوە بوو، بۆ جاری سێیەم، ئاخیری گوتم ئەوە دەبێـتە بێ ئەدەبییەکی گەورە بەرامبەری ئەو پیاوانە دەیکەم سێ جار بە دواتدا

---

١– بۆ یەکەمجار لە ئەیلوولی ٢٠٠٣، کە هێشتا چەند مانگێك بوو (ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد) لە سلێمانی دامەزرابوو، لەسەر داوای مامۆستا مەزهەر، کە ئەویش هاوڕێی ئازیزم کاك بوار نورەدین باسی منی بۆ کردبوو، سەردانیم کرد و بەڵێنی هاوکاری و پەیوەندیی ئەدەبی و کاری فۆلکلۆریم پێدان. هەر ئەو ڕۆژەش ناوی سێ کەسی سنووری بیتوێنم برد کە لە نزیکەوە دەمناسین و دەمزانی خاوەنی بابەتی کەلەپووری و فۆلکلۆری بوون، داوام لێکرد کە داوەتنامەیان بۆ بنووسێ کە لە دەرفەتێکدا سەردانیان بکەن و ئەو دەستنووس و بابەتانەی لایانە، بیدەنە ئنستیتیوت و بە چاپیان بگەیەنن، یەکێك لەوانە جەنابی مامۆستا زیادی ڕەحمەتی بوو، کە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، پێکەوە چووین. بەداخەوە دوو کەسەکەی دیکە داوەتنامەکەیان پشتگوێ خست و نەچوون (ئارارات ئەحمەد).

بنێرن و تۆ هەر مەجالت نەبێ مەجالت نەبێ، یەعنی چ دەبێ با ئینسان ئیشێك بۆ ئیشێك بفەوتێنی، ئەوەش ئیشێکی پیرۆزە، ئەگەر هیچ نەبێ لەبەر ڕێزی ئەو برادەرانە، وا بوو من چووم بۆ ئەوێ، ئەوان داوای ئەوەیان لێکردم کە من دیوانی عەلی بەردەشانیم لە کنە و ئەو بەرهەمەم کۆ کردۆتەوە و حازرە و ئەوان ئامادەی دەکەن، بەڕاستی من دڵم لێی نەدەبۆوە، بەڵام ئیدی ئەوان داوایان کرد گوتیان ئێمە بە ئەمانەتەوە چاپی دەکەین و ئیدی دەبێ بە بەرهەمێکی باش و وا بوو کە من شیعرەکانی عەلی بەردەشانیم، نوسین و شتەکانی، کە لەسەر ئەوە هەبوو، تەسلیمی ئەوانم کردن، خوا هەڵناگرێ کاك بوار و کاك مەزهەر و تۆش و، گرنگییان بە مەسەلەکە دا و دیوانێکی عەلی بەردەشانی ڕێك و پێك هاتە کایەوە، من ناڵێم لە سەتا سەت کامڵە لە سەتا سەت هەموو شیعرەکانیەتی، بەڵام توانیومە ئەگەر عەلی بەردەشانی هیچی کەم دەست نەکەوێ، یەعنی عەلی بەردەشانیم کردووە بە ساحێبی دیوانێك لە پەڕاگەندەیی و لەو لا و لەو لایان، دوو دێڕ لەوێ و دێڕێك لەوێ و یەکێك لەوێ، من نەجاتم داوە لەوە و وەکۆم کردۆتەوە، لەو بارەوە سوپاسی تۆش دەکەم سوپاسی کاك بواریش دەکەم سوپاسی کاك مەزهەری خالەقیش و دکتۆر ئەلبێرتیش و ئینستیتیووتی کەلەپووری کوردیش دەکەم، وە لەوەو دواش بڕیاریان دا هەتا من شتم هەبێ و بیاندەمێ، ئەوانیش درێغی نەکەن، بۆم چاپ بکەن، دیار بوو لە دوای عەلی بەردەشانیش، (ئاواز و بەسەرهات)ەکە، من بۆ خۆم پێم خۆش بووە چەند جارێکم خوێندۆتەوە، ئنجا لە دوای ئەویش، (هەتا دەمری نازانی چت بەسەر دێ) و ئینجا لە دوای ئەوە (مامان برازا بزر کرد) و ئەو جۆرە شتانە، وە ئێستا شتی کەمان بە دەستەوەیە، ئەگەر تەمەن باقی بێ و بمێنین، ئەوە وردە وردە لەگەڵی دەڕۆین و...

**پ: بە قسە شاهیدی لەو شتانە نادرێ، ئینسان تا کتێبەکە نەخوێنێتەوە، بە تایبەت عەلی بەردەشانی، ئەو کات دەزانێ چ ئیشێکی فەرهادانە کراوە، بەڕاستی کارێکی سەختت بۆ کردووە، پێم وانیە هیچکەسێکی دیکە ئەگەر موختەسسیش بێ، ئاوا بۆی بگەڕێ، دێڕ بە دێڕ، یەك لەوێ، یەك لەوێ کۆی بکاتەوە، ئاوا بەو جۆرە دایڕێژێتەوە و ساغی بکاتەوە و بەیتەکان بەرێتەوە سەر یەك. مامۆستا یەعنی سەرجەمی کتێبەکانی جەنابت ئەو چوار کتێبەن؟**

و: بەڵێ، یەکەمیان عەلی بەردەشانی، دووەمیان ئاواز و بەسەرهات، هێندێك گۆرانی هەن کە گوتراون، نازانی ئەو گوتراوە سەببەبەکەی چییە؟ گۆرانییەك نیە کە بۆ پارە گوترابێ، گۆرانیەك نیە کە وا هەر لە خۆیەوە هاتبێ، چیرۆکێکی لە پشتەوە هەیە، من بۆ ئەو چیرۆکانە گەڕاوم، ئەو چیرۆکانە بدۆزمەوە...

**پ: بۆ خۆت زۆر لە ساغکردنەوەیان ڕازی، بە تەخمین لە ڕووداوەکیان نزیک بوویتەوە؟**

و: بەڵێ تا ڕاددەیەکی زۆر لێیان نزیک بوومەوە، لێشیان ڕازیم، وە پێم وایە چاکیشم هەدەف پێکاوە، چونکە ئەوەی کە لە سەتا سەت نەمزانیووە لە سەتا سەت هەدەفەکە دەپێکم، بڵاوم نەکردۆتەوە، بۆ نموونە ئێستا (زێنەبێ)م بە دەستەوە بەدوایدا دەگەڕێم. زێنەبێ وەی زێنەبێ، زێنەب دوو ددانی زێڕە، ئەوە لە خۆیەوە نەهاتووە، ئەوە شتێکی لە پشتەوەیە، عەشقێکی لە پشتەوەیە، کۆمەڵێك داستانی لە پشتەوەیە، لەبەر ئەوەی نەمتوانی وەدەستی بێنم، لەسەر چی ئەم گۆرانییە دروست بووە؟ لە چ قوڕگێکەوە هاتۆتە دەرێ؟ چ سۆزێکی دەربڕیووە؟ خۆم لێ بواردووە، هەڵمگرتووە بۆ کاتێکی دیکە، دیارە زۆر داستانیش بە قوربانی ئەوە دەبن کە سەرچاوەیان نیە و ون دەبن و، ئەم وڵاتە وڵاتی عاشقانە ئیدی بەینی ئەرز و ئاسمانەکانیشی پڕە لە عیشق، بەڵان چی دەکەی ئەوە هەموو فەوتاون و دەست ناکەونەوە و...

**پ: مامۆستا، ئەم بەرهەمانەی کە ئێستا لە ژێر دەستتدان، بە تەمای بیاننوسییەوە، چین؟**

و: کۆمەڵێك شت هەیە لەبەر دەستمدایە، کۆمەڵێك لاوکن، داستانەکان بادینین، بەڵام گێڕانەوەکەیان سۆرانین، من هەستاوم وەختی خۆی، ئەو لاوکانەم تەسجیل کردوون، هەم بە نووسین هەم بە تەسجیل تۆمارم کردوون، وە هێندێکیشیان لە لای من نەبێ لە لای کەس دەست ناکەون، بۆ نموونە (حەمە شین)، بەیتبێژ و حەیرانبێژ و لاوکبێژێکی دەڤەری مەرگەی بوو، زۆر بە توانا بوو، بە تایبەتی شتی بۆ گوتووم. (مام یونس)، سەرۆکی چاوەشەکانی پشدەرێ بوو، بە ڕەحمەت بێ، کابرایەکی قسە خۆش بوو، بە تواناش بوو، زۆر شتی هەبوو لەو لا و لەو لایان، فێرم کردبوو، لەو کاتانەی کە زگوڕتی بووم من، شەوانە دەهات بۆ لام، ئەو کاتە لۆکس هەبوو دایاندەگیرساند لە شەستەکاندا لە قەڵادزێ. دەهات شەوێ، دادەنیشت، ئیدی دەمانکرد بە قسەی خۆش و ئەو لاوکانەی بۆ دەگوتم، ئەو داستان و بەیتانەی بۆ دەگێڕامەوە، منیش هەر هەموویم تۆمار کرد و لە دەفتەراندا تەسجیلم کردووە. وردە وردە، ئێستا زروفێك هاتۆتە پێشێ خۆم بە خەڵکی ئەم وڵاتە دەزانم، من هەتا دوای ڕاپەڕینیش و دواتریش، خۆم بە خەڵکی ئەم وڵاتە نەزانیووە، چونکە هەمیشە تۆ تابیعی ئەوە بووی بتگرن، بتکوژن، نەفیتکەن، هەڵبێی، ئاوارە بی، دەربەردەر بی، کۆمەڵێکم لەوانە هەموویم بەسەر هاتووە، لە دووبارەبوونەوە و سێبارەبوونەوە، بەڵام ئێستا هەست دەکەم کە خەڵکی ئەم وڵاتەم، وە ئەگەر منیش بفەوتێم، بەرهەمەکانم دەگاتە دوورەدەست و ئەوانە، بۆ نموونە ئێستا (هەتا دەمری نازانی چت بەسەر دێ) بە فەترەیەکی

زوو کە مانگێك نابێ ئێستا گەیشتووە لە کەنەدا باسی دەکەن، لە بەریتانیا، لە ئەمریکا، لە سوید، لە نەرویج، لەم وڵاتانە، لە زوربەی شوێنانەوە جوابیان بۆ ناردووم، یەعنی تازە ئەو ئەدەبیاتە هیچی نافەوتێ، نافەوتێ، تازە شت ئەگەر کەوتە کتێبخانەی لەندەنەوە، چی دەیفەوتێنێ؟ کەوتە کتێبخانەی ئەمریکاوە بە چی دەفەوتێ؟ وەنیە؟ ئەوانە نافەوتێن، لەبەر ئەوە من بۆیە ئێستا کەوتوومە چاپکردنیان، جاران لەوانە بوو نەهێڵن لە خۆت زیاتر دوور بکەوێتەوە...

**پ: مامۆستا، ئەو بەرهەمەی کە ئێستا باست کرد وردە وردە خەریکم، هیچ ناوێکت لێ ناوە؟**

و: ناوێکم لێ ناوە، ئەوە لە ئینستیتیووتە، بەڵام بە هیواین ناوەکەی بگۆڕین، کا حەسەن من، کۆمەڵێك شت هەیە، دوایی نایە شتەکان، یەعنی ئەوەندە زۆرە من دەترسم تەمەنەکەم پێیانڕا نەگا...

**پ: قسەی وا مەکە، تەمەنا دەکەم خوا لە تەمەنی من بخاتە سەر تەمەنی تۆ لەبەر خاتری تۆ و لەبەر خاتری ئەو ئیش و بەرهەمانە...**

و: بژی سپاست دەکەم، من ئەوەندەی پێم بکرێ، وەکو ئەو ڕۆژەش لەوێ، لە کۆڕی ڕێزلێنانەکە[1] باسم کرد، من مادام بێجگە لەوەی بۆ خۆم وەکو پەرۆشی ئەدەبیاتی میللەتەکەی خۆمم و کەلتور و کەلەپووری میللەتەکەی خۆمم و دەمەوێ نەفەوتێ، شتێکی دیکەش هەیە کە ئەو ڕێزەی بۆ من دروست کرد کە کۆمەڵێك خەڵك دەستخۆشی لە من بکا و ئەوە شتێکی دیکەیە، ئەم هەموو بروسکەی تەئید و ئەم هەموو قسە خۆشانەی کە بۆ من هاتووە و تەلفۆنانەی کە بۆ من کراوە، ئەوەش بۆ خۆی هاندانێکە...

**پ: مامۆستا سوپاست دەکەین ماندوومان کردی، بەڵام با لە دامێنی موقابەلەکەماندا هێندێك پرسیاری نێو ژیان و وردەکارییەکانی شتی کۆمەڵایەتیی خەڵك بکەین، لەنێو خەڵکدا زۆر جار باسی ساڵی گرانی دەکا، تۆ هیچکام لە ساڵەکانی گرانیت بەبیر دێ، دیارە ساڵی گرانیی یەکەم، حەڕبی عالەمی یەکەمە، بەبیرت نایە ئەتۆ ئەو کاتە نەبوویت، بەڵام ئەوەی دووەمیان مەبەست لە جەنگی دووەمی جیهانە یان شتێکی دیکەیە؟**

و: کاك ئارارات، دیارە شەڕەکان، شەڕی قورس بوون، شەڕی یەکەم و شەڕی دووەمیش،

---

١- مامۆستا زیاد، دوو جار مەراسیمی ڕێزلێنانی بۆ ساز کرا: جارێك لە ٢/١١/٢٠٠٨ لە قەڵادزێ، کە ئینستیتیووت بۆی ساز کرد و، جاری دووەمیش بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ- ڕانیە بۆی ئەنجام دا، مەبەستی مامۆستا لە ڕێزلێنانەکەی دووەمە. (ئارارات ئەحمەد)

دیاره ئەگەر شەڕ بوو کاسبی نامێنێ، گەنجەکان هەموو ڕاپێچەك دەدرێن بۆ چەك هەڵگرتن و بۆ بەرەی شەڕ و ئەوانە، لەبەر ئەوە، ئەو بەرهەمانە کەم دەبێتەوە. دیارە من بۆیان گێراومەتەوە شەڕی یەکەم کە خەڵك لە کۆڵانان مردووە، زستان بووە، شەوێ خەڵك دەرگای داخستووە، ئەگەر هاتۆتە دەرێ تەماشای کردووە لە دەورووبەری مزگەوتەکەی خەڵکێك مردووە لە برسان. دیارە شەڕ بۆ خۆی چی پێوەیە؟ برسێتی پێوەیە، گرانیی پێوەیە، نەخۆشیی پێوەیە، نەخوێندەواریی پێوەیە، یەعنی ئەو ئافاتە کۆمەڵانەی هەموو پێوەیە، بەڕاستی جەنگی یەکەمیش، جەنگێك بووە کە زوربەی وڵاتانی دنیای گرتۆتەوە، خەڵکێکی زۆر بەو شێوە تێداچووە، کوردستانیشی گرتۆتەوە، من بە ڕەحمەت بێ خاڵیشم و داکیشم بۆیان دەگێڕامەوە دەیانگووت خەڵك هاتووە نانێکت بە دەستەوە بووە بۆ منداڵەکەی پەلاماری داوە، فڕاندوویەتی، خەڵك پارووی لە دەمدا بووە لێیانداوە کەچی نەیتفیوەتەوە هەر قوتیداوە، ئەگەر سبەینێ دەرگایان کردۆتەوە، هاتوونە دەرێ لەبەر دەرگای مردووە لە برسان، خەڵك تاقەتیان نەبووە یەکتر بنێژن، ئەوە لە بارەی یەکەمەوە، لە بارەی دووەمیشەوە خۆی دیسان هەمان شەڕ هەمان کارەسات دێنێتەوە لە فەقیری و لە نەبوونی و لە چی و لە چی، دیارە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٥ و کۆتایی شەڕ، فیعلەن ئەودەمە گرانی بوو، دواکەوتوویی بوو، نەخۆشی بوو، کۆمەڵێك لەو بابەتانە هەبوو... بەتایبەتی دەوڵەتی عوسمانی، تۆ دەوڵەتی عوسمانی، ئەم دەوڵەتە بێ خێرە، ئەم وڵاتە پان و پۆڕەی لە ژێر دەستی تۆدا بووە هەر هەمووی تووشی فەقیری و نەدامەتی کردووە، لەشکرێکیان هەبووە ئەو لەشکرەیان تەنانەت بەس مشەخۆر بووە، مەسەلە، ماڵێك مریشکێکیان هەبووە، کوڕەکە گوتویەتی دایە بییەنە با ئەو مریشکەی خێرا سەر بڕین بیخۆین، ئەویش داکەکەی گوتویەتی ئەدی ڕۆڵە ئاخر چی هێلکەمان بۆ بکا؟! گوتویەتی دایە (ئەنەدۆڵی) دێن دەیخۆن! ئێستا خێرا سەری نەبڕین. یەعنی نە نیسکیان لە ماڵاندا هێشت، نە ماشیان هێشت، نە برنجیان هێشت، ئینجا سەرەڕای ئەوە، تەعەددا کردن و بێ شەرەفی، لە شەرەف و کەرامەتی خەڵکانی ژێر دەستە، وەکو دەوڵەتی عوسمانی، خۆ لەو هینەدا نووسیومە، کڵاو دانێ و سڵاو لێ بکە!... کڵاو دانێ و سڵاوی لێ بکە!، کابرایەکی زابتێکی عوسمانی دەچۆ ماڵێك ژنێکی جوانی تێدا بوو، دەچوو، دەبوو خەڵکەکە بڕوا تەنها ژنەکە لە ماڵێ بمێنێتەوە، کڵاوەکەشی لەبەر دەرگای دادەنا بۆ ئەوەی ئەوە زابتێکی عوسمانی لە ژوورێیە کە ساحەبی هاتەوە، بگەڕێتەوە، ساحەبی هاتۆتەوە چاوی بە کڵاوەکە کەوتووە، هیچ دەسەڵاتیکیشی نەبووە، گوتویەتی دە وەرە کڵاوی دانێ و سڵاوی لێ بکە!... لە دوایەش کە تەمی شەڕیش ڕەویوەتەوە، ئاسەوارەکەی نەماوە و وردە وردە خەڵك بوژاوەتەوە و دەستی بە کاسبی کردۆتەوە و ئنجا بەهاریش خۆ کە

داهات بۆ خۆی بژێوی بۆ خەڵکی کوردستان دروست دەبێ. شەڕ یەعنی دواکەوتوویی، لە وڵاتی مەشدا، وڵاتی شەڕێ بووە، هەموو نەگبەتیەکان گرتویەتیەوە، لە بەینی سەفەوی و عوسمانیاندا شەڕ بووە کوردستانی گرتۆتەوە، لەبەینی عەرەب و فارساندا شەڕ بووە کوردستانی گرتۆتەوە، لە بەینی تورك و عەرەبدا شەڕ بووە هەر کوردستانی گرتۆتەوە، ئەم وڵاتە وڵاتی فرمێسك و خوێنە و هیوادارم لەمەودوا ئیستیقراریەك هەبێ خەڵك بتوانێ وەکو ئادەمیزاد بژی!...

**پ: مامۆستا، باسی بەفرێك دەکەن، هێندێك دەڵێن بەفرەستوور، هێندێك دەڵێن بەفرەسوور، بە ڕای تۆ کامەیانە، وا بزانم دەبێ لە چلەکان یان پەنجاکاندا بووبێ، داکم زۆر جار باسی دەکا... جا، بەفرەستوورەیە یان بەفرەسوورەیە؟**

**ناسکەخان: (هاوسەری م. زیاد): بەفرەستوورەیە[1]...**

و: ئەمن ئەو بەفرەم بە فکر دێ، ئەو بەفرە دەگەڕێتەوە بۆ چلەکان، ئەستوور بووە، زۆر باریووە، چونکە بە چی دەزانم، وەکو بۆم باس کردی لەوە پێش، ئەمە[2] لە ماڵێدا خۆم و خوشکەکەم و داکم بووین، من تازە دەگەیشتمێ، تەڵەبەی سەرەتایی بووم، پێرا نەدەگەیشتم سەربانی بماڵم، بە بەفر ماڵینێ، مەسەلە چووین لەسەر بانەکە ئەگەر ١٠ مەتر درێژ بایە سەربانەکە، نەماندەتوانی بەفرماڵەکەی وەپێش خۆمان دەین و ماوەی ١٠ مەترەکەی ببیەین دەمانکرد بە ٣ بەش، بەشی پێشەوەمان فڕێ دەدایە خوارێ، ئینجا بەشێکی کەمان لەدوای وی فڕێ دەدایە خوارێ، ئینجا بەشێکی کە، هەتا ئەوەمان تەواو دەکرد، هێندەی کە، خێرا خێراتر دەباری. دەرگا گیرا بوون دەرگا، من بۆ خۆم تاقەتم بە دەرگا کردنەوەی نەدەشکا، بەبیرم دێ خاڵم دەهات، خاکەناز و پێمەڕەی دەهێنا و دەرگای بۆ دەکردینەوە کە ماڵاتەکەمان لە ژوورێ بچێتە دەرێ بۆ سەر حەوزێك، شوێنێك ئەگەر ئاوێکی لێ بێ ئاوەکەی بخواتەوە، ئینجا لەو ساڵانەدا لەبەر ئەوەی هەر لە ژوورێدای، هەر بۆ خۆت و وڵاخەوە خەریکی خواردنێی، تۆ ئەو کا و جۆ و زەخیرەی کە داندراوە، هەر دەبێ لێی بخوا، ئنجا لەوەیدا جار هەبوو کا دەبڕا، ئێمە بۆ خۆمان کامان لێ براوە دێ بە دێ گەڕاوین سواری ئێسترێ بووین کە دوو گونیە کا بکڕین بە پارەیەکی زۆری ئەو دەمە بۆ ئەوەی مەڕێکمان نەمرێ، مانگایەکمان نەمرێ، پێی بژیەی هەتاوەکو ئەوە پەیدا دەبێ، ئەوە نەك هەر بە نسبەت ئالیکی حەیواناتیەوە، بەڵکو بە نسبەت زاد و زەخیرەشەوە، ئەوەنیە پەندەکە دەڵێ: ڕەشەمێی ڕەشندو، بەتاڵ بوون چاڵ و کەندوو، پێك وەربوون بووك و خەسوو! یەعنی بووکەکە تومەز زۆری لێناوە، خەسووەکەش کە

١ – بەفرەستوور: بەفر ئەستوور، ئاماژەیە بە بەفرێکی زۆر.

٢ – ئەمە: مە، ئێمە

تەماشای کردووە زۆرە، ئەوەی پێگوتووە، گوتویەتی ئەتۆ دەستبڕێژی، شت دەڕێژی. ساڵ زۆری بە بەرەوە ماوە، دەست پێوە بگرە، دەمرین لە برسان، یەعنی نیزاعی بەینی بووك و خەسووی، لەسەر یەکێك ئەو جۆرە شتانە دروست بووە، ئنجا کە شەڕیش بێ و کاسبیس نەبێ و بەفرەستووریش بێ و، خۆ مام هێمن بە درێژی باسی دەکا لە کتێبەکەیدا، مەسەلە دەعبای کێوی... دەعبای کێوی، خواردنی نەماوە، دیارە کەو باڵدارێکی سەختە بۆ خۆخواردنێ و خۆڕاگرە، بەڵان ئەوەندە باریبوو، کونە بەردیش، چونکە ئەو زیخیش دەخوا!، کونە بەردیش پڕ ببون لە بەفر! شوێن نەمابوو، بە دەشتێ وەربوو، خەڵك بە دەستی دەیگرتن، من بۆ خۆم منداڵ بووم کەوم گرتووە ئەو کاتەی، کۆمەڵێکی مێرمنداڵ بووین، ئەوا دەچووین، کە گەنجەکان دەچوون بۆ ڕاوێ ئەمەش بەدوایان دەکەوتین، کەوێك ئە لەوێ دەکەوت، کە دەکەوت ئەو توانایەی نەدەما هەڵفڕێتـەوە، دەچووین دەمانگرت، من بۆ خۆم ئەو ساڵەی کەوم گرتووە. وە ئەو منداڵانەی کە لە سەرەتایی دەهاتن لە لادێکانەوە بۆ مەکتەبی بنگردی، ئەو ڕۆژانە نەیاندەتوانی بە وڵاخیش بێن بەڵکو ئێمە کە لە داخلی نێو دێیەکەی بووین، بە سواری وڵاخی دەیانبردین، کە دەوامیش تەواو دەبوو بە واماندا دەهاتن بە سواری وڵاخی دەیانبردینەوە. بەڕای من ئەو بەفرە، بەفرەستوور، ئەو بەفرەیە کە لە ١٩٤٥ و ١٩٤٦ و ئە لەو دەورەدا بووە...

**پ: مامۆستا، یەك پرسیاری کەت لێکەم، لەنێو خەڵکدا زۆر جار دەڵێن مەلیك مەحموود سکەی خۆی لێداوە، من لە کتێب و سەرچاوەی ڕەسمی و شتی ئاوادا نەمدیووە، ئایا بە حوکمی ئەوەی جەنابت لە سەردەمێکدا ژیاوی، مەلیك مەموود ماوە، ئەو قسە و باسانە ڕاستن؟**

و: من، کاك ئارارات، بە حوکمی ئەوەی وەکو شیلانە، یا بە حوکمی ئەوەی خاڵێکم[1] بە درێژایی تەمەنی هەر لەگەڵ شێخ مەحموود بووە، تەنانەت پیاوی تفەنگی شێخ مەحموودیش بووە، شێخ مەحموود چۆن ژیاوە، ئەو ئاوا ژیاوە، دیوەخانی تایبەتی خۆی هەبووە، هەر لەگەڵ شێخ مەحموودی بووە، هەتا ئێستا ڕۆژێك لە ڕۆژان باسی ئەوەی بۆ نەکردووم کە شێخ مەحموود سکەی خۆی هەبووبێ، شێخ مەحموود سکەی خۆی نەبووە، ئەگەر سکەی خۆی هەبایە من دەمزانی، چونکە ئەو خاڵەم زوربەی شتەکانی پاراستبوون، زوربەی شتەکانیم لەو بارەوە لەو وەرگرتووە، بەڵام پوڵی هەبووە، پوڵی بەریدی هەبووە، بەڵام سکەی نەبووە، پارەی نەبووە، پارەیەك نەبووە بە ناوی مەلیك مەحموودەوە...

---

١ – خاڵێکم: یەکێك لە خاڵۆکانم.

**پ: مامۆستا دیاره جولەکەکانی کوردستان بەتایبەتی هی مەنتیقەکە، له کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەجاکاندا ڕۆیشتوون، هیچت بە بیر دێ سەبارەت بە داب و نەریتیان، بە ئیشیان، بە گەوره پیاوەکانیان له قەلادزێ؟**

و: وەکو بەبیرهاتن، بەبیرم نایە، جولەکە چیە و موسڵمان چیە و یاخود ئەمانە ئیشیان چیە چ نیە، بەڵام بەس ئەوەندە دەزانم لە کاتێکدا من کە چوومە ئیبتیدائی، ئەو کاتە جوولەکە لە بنگردی هەبووە، جولەکەی لێ هەبووە، ئەو جولەکانە، مەسائیلی تەموینییان گرتۆتە ئەستۆ، هاتووە قوماشیان تەوزیع کردووە، کە دابەشکراوە بەسەر خەڵکیدا، شەکریان دروست کردووە، دابەش کردووە، گەنم و جۆ و ئەوانە کە حکومەت ناردوویەتی بۆ خەڵك ئنجا لە تەڕەف ئینگلیزەوە بووبێ، لە تەڕەف حکومەتی عەرەبییەوە بووبێ، ناردویانە، دابەشیان کردووە، ئەو ئیشانەیان کردووە، ئەوانەم تەقریبەن وەکو شتێك بەبیرە، بەڵام بەبیرم نایە فەرقم نەکردووە ئەوە جولەکەیە وە یاخود ئەوە موسڵمانە، بەبیر نایە، بەڵام زۆریشم لە بارەیوە بیستوون کە لە قەلادزێ ژیاون و لە بنگرد ژیاون و لە مەرگە ژیاون و... جولەکە لە هەموو شوێنان هەبوون، لەبەر ئەوە، زۆر ئیقتیسادی بوون، ئیش و کاریان زێڕنگەری و تیجارەت و و بازرگانی و لەبەر ئەوە لە هەر شوێنێك بووبن، دەوڵەمەندی شوێنەکان بوون...

**پ: مامۆستا گیان دووباره دەستت خۆش بێت، هەر تەمەندرێژ بیت، هەر لەشساغ بی، من گەیشتوومەتە کۆتایی پرسیار و باسەکانم، ئەگەر جەنابت خۆت حەز بکەی شتێمان پێ بڵێی...**

و: وەڵا، من سوپاسی هەستتان دەکەم، سوپاسی ئەو بەسەرکردنەوەیەتان دەکەم، پێم خۆشە جارجاریش کە ئاوا یەکێکی وەکو تۆ سەرمان لێ بدا، هەم وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەك وە هەم هاندانێکیشە بۆ من کە بەردەوام بم لێی لە هێندێك مەسائیل و ئیش و کار و ئەو جۆره شتانەدا هیوادارم خەڵکیش بزانێ کوڕی چ نەتەوەیەکە، نەتەوەکەی له چ ئاستێکدایە؟ چی پێویستە بۆ بەرز بوونەوەی نەتەوەکەی، بۆ ڕزگار بوونی نەتەوەکەی بۆ ئەوەی جارێکی کە تووشی ئەنفال نەبێتەوە کە کارەساتێکی دڵتەزێنە، تووشی گوند ڕووخان و کوشت و کوشتار نەبێتەوە، چونکە دوژمنەکانمان دوژمنی بێ ویژدانن، ئینسانیش لەگەڵ ئینسانی بێ ویژدان نابێ تەوەقوعی چاکە کە چاکەیەکی بەرامبەر بکرێ، دەبێ بۆ خۆت هەبی، داوام لە زوربەی خەڵکان و گەنجان و هەیە کە دەربەست ئەدەبیاتی خۆیان بن، مەبەستم فۆلکلۆری خۆیانە، دەربەستی نەتەوەی خۆیان بن، خاکی خۆیان خۆش بوێ، چونکە خاك لە هەموو شتێك خۆشەویستترە، تۆ لە خاك دروست بووی و لەو خاکەشدا

ژیاوی، وە لەو خاکەشدا دەمری، نەتەوەی ئەو خاکەی، هەوای ئەو خاکەی هەڵدەمژی. ئاوی ئەو خاکەی دەخۆیەوە، تیشکی ڕۆژ لەسەر ئەو خاکە لێت دەدا، بەسەر ئەو خاکەدا دەڕۆی، پێویستە ڕێزی ئەو شتە بگری کە ئیستیفادەت لێ کردووە، کە ئەویش لەو وڵاتە جوانەدا هەیە.

**پ: مامۆستا سەبارەت بە دراوسێکانمان کە زۆر دراوسێی چڵێس و بەدڕەفتار و خراپن، یەك پەندی کوردی زۆر جوان هەیە دەڵێ: دەگەڵ سەی کەوتووینە دە چاڵا! پێم وابێ ئەوە بۆ کورد دەگونجێ...**

و: فیعلەن جا ئەوە ئاوایە، بەزەییان پێتدا نایەتەوە، حیسابی ئەوە بۆ تۆ ناکا کە تۆ ئینسانی، لەبەرئەوە، ئەو هەوایەی هەڵیدەمژی بە ئی خۆی دەزانێ، غەدری لێدەکەی! ئەو خاکەی بەسەریدا دەڕۆی، بە ئی خۆی دەزانێ و غەدری لێدەکەی، ئەوەی کە دەیخۆی، بە هی خۆی دەزانێ و غەدری لێدەکەی، هەمووی بە هی خۆی دەزانێ، تۆ بە غەددار دەزانێ کە غەدرت لێ کردووە، بەو چاوەوە سەیرت دەکا. من پێم وایە فەلاحێك چەند ڕقی لە مشکێکە، چەند ڕقی لە کوللەیەکە، چەند ڕقی لە سنێکە، دوژمنەکانی ئێمەش ئەوەندە ڕقیان لە ئێمەیە، وە بەزەیی فەلاحێك بۆ سن و کوللە کە بەرهەمەکەی دەخوا، بەزەیی ئەوانیش بۆ ئێمە بەو شێوەیەیە...

**پ: زۆر سپاس مامۆستا**

و: من سوپاسی ئێوە دەکەم...

(مامۆستا زیاد، لە ڕێکەوتی ٢٠١٧/٣/٢١ لە شاری ڕانیە کۆچی دوایی کرد.)

## چاوپێکەوتن لەگەڵ م. زیاد، فۆلکلۆرناس
## سازدانی: سامان عومەر سەیدگوڵ[1]

"٣٠-١٢-٢٠١٠ دوای نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە، لەگەڵ عومەر حاجی[2] لە شاری ڕانیە لە ماڵەکەی خۆی سەردانمانکرد، بە مەبەستی وەرگرتنی هەندێ زانیاری و بابەتی بڵاونەکراوەی فۆلکلۆری، بۆ بەکارهێنانی لە توێژینەوەیەکی مەیدانی بەناونیشانی (بابەتە ئەدەبییەکانی فۆلکلۆری دەڤەری بیتوێن-پشدەر) کە وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی پلەی بکالۆریۆس لە قۆناغی چوار، بۆ بەشی زمانی کوردی، کۆلێژی زمان لە زانکۆی کۆیە، ئامادەکرا."

تێبینی: ئەم چاوپێکەوتنە، بە شێوەی ئاخاوتنی پشدەر، کە شێوەی ئاخاوتنی م. زیاد خۆیەتی، نوسراوەتەوە بێ دەستکاریکردن.

* م. زیاد: ئەو داستانانەی لە خودی دەڤەری پشدەرێدا ڕوویانداوە، تایبەتن، نەك هی شوێنیکەبن هاتبن، هەر هی خودی پشدەرێن...

* شێخ فەرخ کە داستانێکە، داستانێکی زۆر بەهێزە، هی زەمەنێکی کۆنە، دیارە تاریخەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوای دەرکەوتن و هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، چونکە مۆرکی ئیسلامەتی پێوەیە، وەکو نوێژو مزگەوت و ڕەمەزان و ڕۆژوو، ئیدی ئەو جۆرە شتانە... دیارە ئەو داستانە تایبەت پشدەرییە، چونکە ئەو شوێنانەی کە باسدەکرێن تەنها لەپشدەرێدان، مەسەلەن باسی (داودێ) دەکات، داودێ ئێستا دێیەکە کە باسیدەکات وەختی خۆی شاربووە. گوندی داودیە، بە ٢٠ بۆ ٣٠ کیلۆمەترێك لە پشتی قەڵادزێوەیە. باسی کانییەکە دەکات کە هەر ماوە، باسی (ئاڵان) دەکات، باسی (گردی مروان) دەکا ئێستا ئەوە هەر لەجێی خۆیە. باسی کوێستانی هی (سەرگوێن)ی دەکات، باسی (کانییە میری) دەکا، باسی (زینوی چاوڕەشان)ی دەکا، ئەوە شتێکی مەوجودن ئێستا کە ماون... هەموو داستانەکە پشدەرییە، تابعێکی دیانەتی هەیە دەکەوێتە بابی ئەفسانەوە، هەرچەندە هەندێ کەس ناڕەحەتن بەوەی کە دەڵێم دەکەوێتە بابی ئەفسانەوە، چونکە ئەوانە بە قودرەتی شێخ و ئەوانەی دەزانن، بەڵام من ڕەئی خۆم وایە، ئەو داستانە، هەر لە کتێبە دینییەکانەوە هەندێ

١ - سامان عومەر سەیدگوڵ، مامۆستا و ڕۆژنامەنووس، لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٩ ناحیەی حاجیاوای سەر بەقەزای ڕانیە.

٢ - عومەر حاجی: عومەر حاجی ئیبراهیم ڕۆستەم، خزم و نزیکی مامۆستا زیاد.

سەرچاوەی لێهەڵهێنجراوە، وەکو مەسەلە قسەکردن لەگەڵ باڵداران یان منداڵ کە ئەبێت دەبێ، قسەدەکات، یان (شێخ فەرخ) کە لەدایك بووە، قسە دەکا. من دەزانم ئەو بیرە (فکرە)، لە بیری عیسای کوڕی مەریەمەوە هەڵگیراوە، کە بە منداڵی (تەبهیبە)ی بۆ دایکی کردووە، قسەکردن لەگەڵ تەیر و ئەوانە، کە لە حەزرەتی سولەیمانەوە سەرچاوەی گرتووە و وەرگیراوە و هاتووە، بەڵام هەندی کەس کە من بڵێم ئەوە ئەفسانەیە، پێیان ناخۆشە، چونکە من لەو ڕوانگەیەوە دەڵێم ئەفسانەیە وەکو من بیستومە لە پیاوە دینییەکان، ئەگەر بە موعجیزەی حساب بکەین، موعجیزە تەنها موختەس بووە بە پێغەمبەرانەوە، موعجیزە موختەس نەبووە بە خەڵکی غەیری پێغەمبەرانەوە، ئەگەر موعجیزە موختەس بوایە بە خەڵکی تری غەیری پێغەمبەرانەوە، مەسەلە عەلی کوڕی ئەبی تاڵب، ئەبوبەکر عومەر، ئەوانە دەبوون بە ساحێبی موعجیزە، لەبەر ئەوە، ناتوانی ئیعتیماد بکەیە سەریان. بەڵام بیرەکە دیارە لەو شتانەوە وەرگیراوە، ئەوە یەکێکە لە داستانە بەهێزەکانی هی مەنتیقەی پشدەرێ، کە گۆیندەکانیش ئێستا لەم حاڵەتەدا پێم وایە یەك دوانێکیان مابن، ئێستا مردوون، بەڵام پێش ئەوەی بمرن من توانیومە لە هەشتایەکان و هەتا لە شەستەکانەوە ئەو داستانانەیان لێوەربگرم و تەسجیلم کردوون و نوسیومنەوە. لەو ئاخیرەیدا کردومن بە کتێب.

* داستانێکی دیکەیش هەیە، پشدەرییە (برایمۆك)، ئەویش هەر داستانێکی پشدەرێیە، دیارە برایمۆك، بەیتبێژەکان (حاجی مەحموود گەناوی) چاکی دەگوت، ئێستا خدری قادری (خدر بلوێر) کە لەو دیووە[1]، ئیستاش ماوە، ئەو چاکی دەگوت. داستانێکی خۆشە بەڵام لایەنی ئەفسانەیی تێدانییە. برایمۆك، لە دیووی ئێرانی بووە، ئەو کاتەی مەنتیقەی سەردەشتیش لەگەڵ کوردستانی عێراقێ یەك بووە، لەگەڵ برازای (میر زەیندین) و ئەوانە بووە، دەیهێنن دەسەڵاتدارەکان لێیوەردەگرن دەڵێن ئێمەش کوڕێکمان هەیە ناوی برایمە، با بێن پێکەوە بخوێنن، دەیهێنن بۆ لادێی و بۆ ئەو شوێنانە و لەگەڵیان دەبێ و، وەلحاسڵ دوایی وای لێدێ برایم تووشی نەخۆشییە دەبێ و ئەو جۆرە شتانە و، دوایی وەك دەڵێن حەوت ساڵان بەکۆڵی گێڕاویەتی. لەدوایی ئیدی چاك بووەتەوە... داستانەکە لە بازاڕ زۆرە، دەتوانی بیکڕی و گوێی لێبگری، بە کاسیەت هەیە و حەقیقەتەکە دەزانی...

* (قەر و گوڵەزەر)، دیارە بیتوێنییە، بە ڕای من تاریخەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نیزاعی سەفەوی و عوسمانیان، نیزاعی مەزهەبی شیعە و ئەوانە، ئەو داستانەی کە من

---

١ — لەو دیوو: مەبەست لە ئەو دیوو سنوورە، کە بەتایبەت مەبەست لە مەحاڵی سەردەشتە لە خۆرهەڵاتی کوردستان.

پەیوەندیم پێوە هەیە داستانی (سەلیمی بایزی)، سەلیمی بایزی چاکی دەگوت هی قەر و گوڵەزەری، چونکە بۆخۆی بۆی گوتوم ئەو داستانانە... گوڵەزەر، کچی (حەمەدی باشاغا) ی بووە، باپیرە گەورەی (هەباس ئاغا)ی، ئاخر ئێرە کاتی خۆی هەموو خێڵەکی بوون، هەندێك دەڵێن وانییە هەندێ دەڵێن وایە (قەر) دەچێتە ڕاووشکارێ، خەونی دەبینێ لە خەوێدا تووشی گێرەوکێشەیەکی ئاڵۆز دەبێ، نجومگەر بۆی دەگرنەوە دەڵێن: پاشا، بە بابی دەڵێن، با بچی بۆ ڕاووشکارێ لەبیری دەچێتەوە و، لەوێ، تووشی دەروێشێکی دەبێ، دەروێشەکە لەبەردەستانی ڕادەوەستێ و ڕەسم، عەکسێکی بۆ دەردێنێ، ڕەسمی خاتوو (گوڵەزەر)ییە، لەوێ بێهۆش دەبێ و... لەدوایە دێتەوەو تووشی سەوداییەکی دەبێ و، کە توشدەبێ، دێ بە پاشایەکەی دەڵێ لەگەڵ شوانەکان ژنەکانیان دەگۆڕنەوەو ئەو دەبێ بە شوانی حەمەدی باشاغای و، شوانەکە جلو پارەی دەبا و دەڕوا... ئەوەنییە ئیدی لەدوایە قەر کە عەشقی دەبێ، سبەینییەکی قەر، بەرخان دەبا بۆ لەوەڕێ، حەوزێك دەبێ، خۆی تێهەڵدەکێشێ، ئاوی دەخوا و مەلەی دەکا، دێتە دەرێ و وەکو غەریبێك بەخۆی هەڵادەڵێ، خاتونیش دەڵێ ئەو سەگبابە منی بە تفەنگی بێتەقە کوشت! وەڵاهی دەبێ بەدوایکەوم، ئەوە چییە، هەر کە دێتەدەرێ، قەر دەستی لەبنا گوێی دەنێ و بەخۆی هەڵدەڵێ و دەڵێ:

"کوڕە خۆ من قەر نەبووم، هەر بەئارەزوویەکێ دڵی خۆ، نێوم لەخۆدەنایەوە قەرە.
ئەمن شازادە عیزەد خانم پێدەڵێن، کوڕەگەورەی شاعەباسی قەجەرە و
بابی خۆم بەزیندی خۆی، تاج و تۆماری دە پاشایەتیەی دەنام لەسەرە
حوکمێ خۆمدەکرد لە ئێرانێ، لە چینێ، لە ماچینێ،
لە بەڵخێ، لە بوخارایە،
هەر لەوان کوێستانی دە بڵند و لەسەرە..."
،...

م. زیاد: ئینجا کە بە خۆیدا هەڵدەڵێ و زەلیلی خۆی دەگێڕیتەوە بە شوانی و... ئینجا دەڵێ:

"هەرچەندی قەڵەمێکی[1] پارم بەلاقیدا دەچوونەوە، دەبوونەوە بە نشتەرە![2]
ئەوجا زەلامێکیش لەوێرا دێ، دەڵێ فلانکەس ئەوی مەبەگی[3] وێوە بەرە[4]

١ – قەڵەم: درك، چقڵ، یان هەر دار و چیلکەیەکی سەرتیژ یان تیژکراو... لە موکریان و پشدەر و بیتوێن و هێندێك جێگەی دیکە، بە درك دەڵێن قەڵەم.
٢ – نشتەر: نەشتەر، چەقۆی قەبارە نێوەنجیی زۆر تیژ.
٣ – مەبەگی: ساغ نەبۆوە کە مەبەست لە چییە. (ئامادەکاران)
٤ – وێوە: ئەولا، ئەولاوە، بۆ ئەولا.
بەرە: ببە.
وێوە بەرە: ببە ئەولای.

بەڵام ئێشتاشم ئەو حاڵە پێخۆشترە لە پاشایەتییەکەی قەجەرە،
چونکە هەموو نیوەڕۆیان ئەگە دێمەوە،
خاتوون دێ دەستم لەملی دەکا
سێ جارم بەدڵ ماچدەکا،
دەڵی ڕەبی بەخێرێیەوە شوانۆکەی غەریبۆکەی بێکەس و بێدەرە...[1]"
خاتون گوێی لەو لاوانەوەیە دەبێ و لێك ئاشکرا دەبن، تەگبیردەکەن...

م. زیاد: وەختێك، خێڵەکی چوون بۆ کوێستانێ بەدەربەندیدا، لەودیووی دەربەندی، ماوەیەکی ماونەوە، کە بەهار ساردبووە و ماویەتی پێهەڵگەڕێن، کوڕێك خەڵکی مەنتیقەی سەنگەسەری دەبێ حەز لە کچێکی لەو ڕەوەندانە دەکا، دەیەوێ خۆی برازێنێتەوە کە شایی و شتی وادەکەن خێڵەکی. لەوێ ئەو کوڕە دەیەوێ خۆی برازێنێتەوەو پێویستی بە شەدەیەکی دەبێ خۆی جوانکا، هیچی نابێ فەقیر دەبێ، کابرایەك شەدەی دەبێ، دەڵێ ئەو شەدەم پێبفرۆشە، ئەویش دەزانێ مەسەلەکەی چییە، داوای سعرێکی گرانی لێدەکا، کوڕەکەش ئەو پارەی نابێ دوو سێ ڕۆژان دەچی فایدەی نییە، سێ چوار ڕۆژان شایی دەگەڕێ، ئاخیری کوڕەکە دەچی بەبێ شەدە لەگەڵ خێڵەکیان هەڵدەپەڕی، تا ماڵ باردەکرێن و پێهەڵدەگەڕین بۆ کوێستانێ. کوڕەکە، بە بەرماڵی کابرای شەدەیدا دەڕوا، کابرا بانگیدەکا دەڵی وەرە کاکە، ئەو شەدەیەی کە داواتکرد، بەو پارەیەی داتمێ، پێت دەفرۆشم، ئەویش دەڵێ: "شەدەم بۆ دەربەندی دەویست! تازە پێویستم بە شەدەی نییە!" ئینجا ئەوە دەتوانی تەفسیراتی زۆری بۆ بکەی بۆ هەندێ مەوزوع.

بۆیە پەندی کوردی کەمی هەیە لەخۆوە گوترابێ، یان پەندەکە گوتراوە داستانەکەی بەدواوە بووە یاخود داستانەکە کورتکراوەتەوە لەپەندەکەدا.

م. زیاد: کەر لەکوێ کەوتووە و کوندە لەکوێ دڕاوە!

کابرایەك، سەپانیان دەبن، لە دەشتێ دەغڵی دەدورنەوە. جاران ئاویان کە بۆ دەچوو، کوندە بوو، لە کەرێیان باردەکرد و دەرۆیشتن. کوڕێك حەزی لە کچێکی دەکا، کوڕەکە ئاوی دەبا بۆ سەپانان، کوندەیەکی ئاو دەبا بۆ سەپانان و، لەپێش خۆی دادەنێ، ئینجا دەڵێ ئەمن مادام بەکن ماڵی کچەکەیدا دەڕۆم، دەڵێ بەڵکو ئێ... چاوێکم پێبکەوێ، یا دانیشتنێکی بکەم و ئەوانە... بەوێدا دەڕوا و کچەکە لەکن ڕەزی دەبێ، کوڕە دادەبەزی و

[1]- ئەو بەیتەی قەرو گوڵەزەر، کە بەیتبێژ (سەلیمی بایزی) خوێندوویەتی، م. زیاد بەدەنگی خۆی و بە ئاوازەوە، چەند کۆپلەیەکی بۆ گوتین. لە هەندێ شوێن چەند وشەیەك بۆم ڕوون نەبوون. - (ئامادەکاری چاوپێکەوتن).

لەگەڵ کچەکەی دەخافڵێن بەقسان، کە دەخافڵێن بە قسان، کەرەکە بە کوندە ئاوەکەیەوە دەڕوا، کە دەڕوا، جۆگەیەك دەبێ کەرەکە دەیـەوێ بپەڕێتەوە و، کوندە ئاوەکەی لێبەردەبێتەوە. کەرەکە دەچەقی لە قوڕێدا و، کوندە ئاوەکەی لێبەردەبێتەوەو ئاو دەیبا و دەدڕێ. کوڕەکە کاتێ بەخەبەردێ، نە کەر ماوە و نە کوندە! دەچی دەگەڕێ و کەرەکەی دەبینێتەوە و کوندەش ئاو بردوویەتی. ئاوا دەچی بۆ کن سەپانەکان، سەپان دەڵێن کوا ئاو؟ دەڵێ وەڵا کەرەکەم چەقیووە و کوندە ئاوەکەش دیارنییە و نازانم چی لێهاتووە! سەپانەکە دێن دەگەڕێن، کە دێن دەگەڕێن، تەماشا دەکەن کەرەکە لەوێ کەوتووە، بەڵام کوندە، نییە! پێدادەگەڕێن لەئاوێدا لە خوارێ، کوندەکە دەبیننەوە، ئاهۆۆۆووو، کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە! ئینجا دەزانن ئەو کوڕە لەکوێ و بۆچی خافڵاوە و لەوێ ئاوای لێهاتووە!

م. زیاد: کابرایەك باراشی دەبا بۆ ئاشی. جاران لە ئاشی ئاوی لێدەکرا. کابرایەکی دیکەش، هەر باراشی دەبا بۆ ئاشی، لە ڕێیە پێکەوە دەڕۆن، ئەو دەڵێ ئەگەر گەییشتینە ئاشی، نۆبەی من دەبێ ئەویش دەڵێ نۆبەی من دەبێ. لەوێ لێیان دەبێ بە هەرا، هێشتاش نەگەیشتوونە ئاشی. دەوەنێکی لێدەبی، (دەوەن یەعنی کۆمەڵە دارێکی بچووك بەیەکەوە)، لێیان دەبێ بەهەرا. لەوێ دەڵێن باشە پێش ئەوەی بگەینە ئاشی، با لەیەکی دەرکەین، لەو هەرایەدا، یەکیان یەکی دەکوژێ، ئینجا مەسەلەی (دەوەنەئاش)ی، لەوەوە هاتووە، بۆیە دەڵێن هێندە لەسەر شتی مەڕۆ! مەیکە بە دەوەنەئاش!

بەسەرهاتی هاوڕێیەکی مامۆستای بۆ گێڕاینەوە، بەڵام ناوەکەی بەیان نەکرد:

م. زیاد: لە قەڵادزێ، وەختی خۆی کە لە ئێرانێ هاتینەوە ساڵی ١٩٧٥، ڕۆیشتین بۆ جنووب، لە جنووب لە دیوانییەی، ڕۆیبوو، ئینجا گوتی ئاودەست و ماودەستی لێنەبوو لەو شوێنەی، گوتی منیش ڕۆژێکی زۆر تەنگاوبووم نەمدەزانی عەرەب لەکوێ گووی دەکەن، گوتی زۆرم فکرکردەوە تەماشامکرد عەرەبێکم دیت، تۆزێك دوورکەوتەوەو عەبایەکەی بەخۆیداداو دەستی بە گووکردنێ کرد. گوتم ئێهێێێی!... ئەوە دیمەوە، بەڵام بەڕاستی من عەبام نەبوو، گوتی منیش عەبام لە یەکی وەرگرت، ڕۆیشتم بۆ ئەو دەشتەی، گوتی چونکە فێرنەبووم، عەبایەکە وەبن خۆم کەوتەوە، گوتی ئەگەر هەستام، سەرسێڵێکم گوو لەسەر عەبای کردبوو! گوتی وەڵا تا تۆزێ پاکم کردەوە، هاتن گوتیان ئەوە چتکردووە!؟ گوتم وەڵا ئەوە شتێکی ئاوا بووە، نەعلەت لە بابی ئەوەی هێنامیە ئێرە!

م. زیاد: کەوای بەری کەسکە

دەڵێ لە کۆیە، ماڵێك زاوایەکیان دەمرێ. لە شین و گریانێدا ژنێکیان پێیهەڵدەڵێ و دەڵێ: "کەوای بەری تەسکە، پڕی بەرییەی میسکە! (واتە پڕی بەرۆکی میسکە، پڕی بەرۆکی عەترە) لاڵبم چاوی ڕسکە![1]"... ژنێکیکەیان بانگیکردە ئەو ژنەی کە ئەو پێداگوتنەی دەڵێ و زۆری پێخۆشدەبێ و پێیدەڵێ: "ئەوەی هەڵگرە تا ژنی حاجی بەکری دێن، ئەگەر ژنی حاجی بەکری هاتن، ئەوکاتەی ئەوەی بڵێ![2]"

م. زیاد: کچ و کوڕ کە دەچن بۆ گیاو کنگر و کاردو و ئەوانە پێکهەڵادەڵێن، جار هەیە شەڕەجنێوی دەکەن و جار هەیە شتی حەزلێکردە بەیەکتری دەڵێن و ئاوازێکی تایبەتی هەیە وەك گۆرانی، ئینجا یەکێك لە باڵۆرەکان دەڵێ:

شاخۆلکەم چاولێیە شاخۆلکەم چاولێیە

لانکەی ساوام پێیە دورم ناگەمێیە

هێڕۆۆۆۆۆ هێڕۆۆۆۆۆ

یەکێکی دیکەیان دەڵێ:

باڵۆرێ نازانم، دەڕێژم چاوانم، خوشکی حەوت برایانم،

ئەمبەروبەر چۆمە، کەوم لێبوون کۆمە، تێکڕا دەمکەن لۆمە

م. زیاد: داکێ کوڕان پەڵەیان بڕان[3]، داکی کچان کەوتوون لە خڕان!

لێرەدا ئەو پەندە لایەنی پیاوسالاری زاڵە و قیمەتێك بۆ ڕەگەزی مێ، دانانێت. یانی داکی کچان ئەوەی کچی هەبن، بێدەسەڵاتە، چونکە جاران مەمنوع بووە بچن کاسبی بکەن و دەرو دەشتێ بکەن، ئەوەی کە کوڕیشی هەبووە جیاواز بووە.

---

١ – ڕسك: ساغ نەبۆوە مانای چییە، بەڵام دیارە کە وەسفێکە بە خراپی. (ئامادەکاران)

٢ – نیوەرۆکی ئەو پێداهەڵگوتنە زۆر ڕوون نییە، بەداخەوە ئامادەکاری دیدارەکەش، لەوکاتەدا بیری نەبووە کە مانا و مەغزاکەی لێپبرسێت. بەڵام لەوانەیە (ژنەکانی ماڵێ حاجی بەکری) کۆستێکی لەو شێوەیەیان کەوتبێت و حەزیان لێبوربێت گوێیان لە چەشنە لاواندنەوەیەکی وا بێت و، ئازیزەکەی خۆیان بێتەوە پێش چاوان. (ئامادەکاران)

٣ – پەڵەیان بڕان: عەیب و عاریان نەمان، مەبەست لەو ژنەیە کە کوڕی بووە، مادام کوڕی بووە، ئیدی هیچ پەڵەی تێدا نەمان!. (ئامادەکاران)

زوو کە مانگێك نابێ ئێستا گەیشتووە لە کەنەدا باسی دەکەن، لە بەریتانیا، لە ئەمریکا، لە سوید، لە نەرویج، لەم وڵاتانە، لە زوربەی شوێنانەوە جوابیان بۆ ناردووم، یەعنی تازە ئەو ئەدەبیاتە هیچی نافەوتێ، نافەوتێ، تازە شت ئەگەر کەوتە کتێبخانەی لەندەنەوە، چی دەیفەوتێنێ؟ کەوتە کتێبخانەی ئەمریکاوە بە چی دەفەوتێ؟ وەنیە؟ ئەوانە نافەوتێن، لەبەر ئەوە من بۆیە ئێستا کەوتوومە چاپکردنیان، جاران لەوانە بوو نەهێڵن لە خۆت زیاتر دوور بکەوێتەوە...

**پ: مامۆستا، ئەو بەرهەمەی کە ئێستا باست کرد وردە وردە خەریکم، هیچ ناوێکت لێ ناوە؟**

و: ناوێکم لێ ناوە، ئەوە لە ئینستیتیووتە، بەڵام بە هیواین ناوەکەی بگۆڕین، کا حەسەن من، کۆمەڵێك شت هەیە، دوایی نایە شتەکان، یەعنی ئەوەندە زۆرە من دەترسم تەمەنەکەم پێیانڕا نەگا...

**پ: قسەی وا مەکە، تەمەنا دەکەم خوا لە تەمەنی من بخاتە سەر تەمەنی تۆ لەبەر خاتری تۆ و لەبەر خاتری ئەو ئیش و بەرهەمانە...**

و: بژی سپاست دەکەم، من ئەوەندەی پێم بکرێ، وەکو ئەو ڕۆژەش لەوێ، لە کۆڕی ڕێزلێنانەکە[1] باسم کرد، من مادام بێجگە لەوەی بۆ خۆم وەکو پەرۆشی ئەدەبیاتی میللەتەکەی خۆمم و کەلتور و کەلەپووری میللەتەکەی خۆمم و دەمەوێ نەفەوتێ، شتێکی دیکەش هەیە کە ئەو ڕێزەی بۆ من دروست کرد کە کۆمەڵێك خەڵك دەستخۆشی لە من بکا و ئەوە شتێکی دیکەیە، ئەم هەموو بروسکەی تەئید و ئەم هەموو قسە خۆشانەی کە بۆ من هاتووە و تەلفۆنانەی کە بۆ من کراوە، ئەوەش بۆ خۆی هاندانێکە...

**پ: مامۆستا سوپاست دەکەین ماندووماں کردی، بەڵام با لە دامێنی موقابەلەکەماندا هێندێك پرسیاری نێو ژیان و وردەکارییەکانی شتی کۆمەڵایەتیی خەڵك بکەین، لەنێو خەڵکدا زۆر جار باسی ساڵی گرانی دەکا، تۆ هیچکام لە ساڵەکانی گرانیت بەبیر دێ، دیارە ساڵی گرانیی یەکەم، حەڕبی عالەمی یەکەمە، بەبیرت نایە ئەتۆ ئەو کاتە نەبوویت، بەڵام ئەوەی دووەمیان مەبەست لە جەنگی دووەمی جیهانە یان شتێکی دیکەیە؟**

و: کاك ئارارات، دیارە شەڕەکان، شەڕی قورس بوون، شەڕی یەکەم و شەڕی دووەمیش،

---

١– مامۆستا زیاد، دوو جار مەراسیمی ڕێزلێنانی بۆ ساز کرا: جارێك لە ٢٠٠٨/١١/٢ لە قەڵادزێ، کە ئینستیتیووت بۆی ساز کرد و، جاری دووەمیش بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ– ڕانیە بۆی ئەنجام دا، مەبەستی مامۆستا لە ڕێزلێنانەکەی دووەمە. (ئارارات ئەحمەد)

دیاره ئەگەر شەڕ بوو کاسبی نامێنێ، گەنجەکان هەموو ڕاپێچەك دەدرێن بۆ چەك هەڵگرتن و بۆ بەرەی شەڕ و ئەوانە، لەبەر ئەوە، ئەو بەرهەمانە کەم دەبێتەوە. دیارە من بۆیان گێڕاومەتەوە شەڕی یەکەم کە خەڵك لە کۆڵانان مردووە، زستان بووە، شەوێ خەڵك دەرگای داخستووە، ئەگەر هاتۆتە دەرێ تەماشای کردووە لە دەوروبەری مزگەوتەکەی خەڵکێك مردووە لە برسان. دیارە شەڕ بۆ خۆی چی پێوەیە؟ برسێتی پێوەیە، گرانیی پێوەیە، نەخۆشیی پێوەیە، نەخوێندەواریی پێوەیە، یەعنی ئەو ئافاتە کۆمەڵانەی هەموو پێوەیە، بەڕاستی جەنگی یەکەمیش، جەنگێك بووە کە زوربەی وڵاتانی دنیای گرتۆتەوە، خەڵکێکی زۆر بەو شێوە تێداچووە، کوردستانیشی گرتۆتەوە، من بە ڕەحمەت بێ خاڵیشم و داکیشم بۆیان دەگێڕامەوە دەیانگووت خەڵك هاتووە نانێکت بە دەستەوە بووە بۆ منداڵەکەی پەلاماری داوە، فڕاندوویەتی، خەڵك پاروی لە دەمدا بووە لێیانداوە کەچی نەیتفیوەتەوە هەر قوتیداوە، ئەگەر سبەینێ دەرگایان کردۆتەوە، هاتوونە دەرێ لەبەر دەرگای مردووە لە برسان، خەڵك تاقەتیان نەبووە یەکتر بنێژن، ئەوە لە بارەی یەکەمەوە، لە بارەی دووەمیشەوە خۆی دیسان هەمان شەڕ هەمان کارەسات دێنێتەوە لە فەقیری و لە نەبوونی و لە چی و لە چی، دیارە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٥ و کۆتایی شەڕ، فیعلەن ئەودەمە گرانی بوو، دواکەوتوویی بوو، نەخۆشی بوو، کۆمەڵێك لەو بابەتانە هەبوو... بەتایبەتی دەوڵەتی عوسمانی، تۆ دەوڵەتی عوسمانی، ئەم دەوڵەتە بێ خێرە، ئەم وڵاتە پان و پۆڕەی لە ژێر دەستی تۆدا بووە هەر هەمووی تووشی فەقیری و نەدامەتی کردووە، لەشکرێکیان هەبووە ئەو لەشکرەیان تەنانەت بەس مشەخۆر بووە، مەسەلە، ماڵێك مریشکێکیان هەبووە، کوڕەکە گوتویەتی دایە بییەنە با ئەو مریشکەی خێرا سەر بڕین بیخۆین، ئەویش داکەکەی گوتویەتی ئەدی ڕۆڵە ئاخر چی هێلکەمان بۆ بکا؟! گوتویەتی دایە (ئەنەدۆڵی) دێن دەیخۆن! ئێستا خێرا سەری نەبڕین. یەعنی نە نیسکیان لە ماڵاندا هێشت، نە ماشیان هێشت، نە برنجیان هێشت، ئینجا سەرەڕای ئەوە، تەعەددا کردن و بێ شەرەفی، لە شەرەف و کەرامەتی خەڵکانی ژێر دەستە، وەکو دەوڵەتی عوسمانی، خۆ لەو هینەدا نووسیومە، کڵاو دانێ و سڵاو لێ بکە!... کڵاو دانێ و سڵاوی لێ بکە!، کابرایەکی زابتێکی عوسمانی دەچۆ ماڵێك ژنێکی جوانی تێدا بوو، دەچوو، دەبوو خەڵکەکە بڕوا تەنها ژنەکە لە ماڵێ بمێنێتەوە، کڵاوەکەشی لەبەر دەرگای دادەنا بۆ ئەوەی ئەوە زابتێکی عوسمانی لە ژوورێیە کە ساحەبی هاتەوە، بگەڕێتەوە، ساحەبی هاتۆتەوە چاوی بە کڵاوەکە کەوتووە، هیچ دەسەڵاتێکیشی نەبووە، گوتویەتی دە وەرە کڵاوی دانێ و سڵاوی لێ بکە!... لە دوایەش کە تەمی شەڕیش ڕەویوەتەوە، ئاسەوارەکەی نەماوە و وردە وردە خەڵك بوژاوەتەوە و دەستی بە کاسبی کردۆتەوە و ئنجا بەهاریش خۆ کە

داهات بۆ خۆی بژێوی بۆ خەڵکی کوردستان دروست دەبێ. شەڕ یەعنی دواکەوتوویی، لە وڵاتی مەشدا، وڵاتی شەڕێ بووە، هەموو نەگبەتیەکان گرتویەتیەوە، لە بەینی سەفەوی و عوسمانیاندا شەڕ بووە کوردستانی گرتۆتەوە، لەبەینی عەرەب و فارساندا شەڕ بووە کوردستانی گرتۆتەوە، لە بەینی تورك و عەرەبدا شەڕ بووە هەر کوردستانی گرتۆتەوە، ئەم وڵاتە وڵاتی فرمێسك و خوێنە و هیوادارم لەمەودوا ئیستیقراریەك هەبێ خەڵك بتوانێ وەکو ئادەمیزاد بژی!...

**پ: مامۆستا، باسی بەفرێك دەکەن، هێندێك دەڵێن بەفرەستوور، هێندێك دەڵێن بەفرەسوور، بە ڕای تۆ کامەیانە، وا بزانم دەبێ لە چلەکان یان پەنجاکاندا بووبێ، داکم زۆر جار باسی دەکا... جا، بەفرەستوورەیە یان بەفرەسوورەیە؟**

**ئاسکەخان: (هاوسەری م. زیاد): بەفرەستوورەیە[1]...**

و: ئەمن ئەو بەفرەم بە فکر دێ، ئەو بەفرە دەگەڕێتەوە بۆ چلەکان، ئەستوور بووە، زۆر باریووە، چونکە بە چی دەزانم، وەکو بۆم باس کردی لەوە پێش، ئەمە[2] لە ماڵێدا خۆم و خوشکەکەم و داکم بووین، من تازە دەگەیشتمێ، تەڵەبەی سەرەتایی بووم، پێرا نەدەگەیشتم سەربانی بماڵم، بە بەفر ماڵینێ، مەسەلە چووین لەسەر بانەکە ئەگەر ١٠ مەتر درێژ بایە سەربانەکە، نەماندەتوانی بەفرماڵەکەی وەپێش خۆمان دەین و ماوەی ١٠ مەترەکەی ببیەین دەمانکرد بە ٣ بەش، بەشی پێشەوەمان فڕێ دەدایە خوارێ، ئینجا بەشێکی کەمان لەدوای وی فڕێ دەدایە خوارێ، ئینجا بەشێکی کە، هەتا ئەوەمان تەواو دەکرد، هێندەی کە، خێرا خێراتر دەباری. دەرگا گیرا بوون دەرگا، من بۆ خۆم تاقەتم بە دەرگا کردنەوەی نەدەشکا، بەبیرم دێ خاڵم دەهات، خاکەناز و پێمەڕەی دەهێنا و دەرگای بۆ دەکردینەوە کە ماڵاتەکەمان لە ژوورێ بچێتە دەرێ بۆ سەر حەوزێك، شوێنێك ئەگەر ئاوێکی لێ بێ ئاوەکەی بخواتەوە، ئینجا لەو ساڵانەدا لەبەر ئەوەی هەر لە ژوورێدای، هەر بۆ خۆت و وڵاخەوە خەریکی خواردنێی، تۆ ئەو کا و جۆ و زەخیرەی کە داندراوە، هەر دەبێ لێی بخوا، ئنجا لەوەیدا جار هەبوو کا دەبڕا، ئێمە بۆ خۆمان کامان لێ براوە دێ بە دێ گەڕاوین سواری ئێسترێ بووین کە دوو گونیە کا بکڕین بە پارەیەکی زۆری ئەو دەمە بۆ ئەوەی مەڕێکمان نەمرێ، مانگایەکمان نەمرێ، پێی بژیەی هەتاوەکو ئەوە پەیدا دەبێ، ئەوە نەك هەر بە نسبەت ئالیکی حەیواناتیەوە، بەڵکو بە نسبەت زاد و زەخیرەشەوە، ئەوەنیە پەندەکە دەڵێ: ڕەشەمێی ڕەشندو، بەتاڵ بوون چاڵ و کەندوو، پێك وەربوون بووك و خەسوو! یەعنی بووکەکە تومەز زۆری لێناوە، خەسووەکەش کە

١ – بەفرەستوور: بەفر ئەستوور، ئاماژەیە بە بەفرێکی زۆر.

٢ – ئەمە: مە، ئێمە

تەماشای کردووە زۆرە، ئەوەی پێگوتووە، گوتویەتی ئەتۆ دەستبڕێژی، شت دەڕێژی. ساڵ زۆری بە بەرەوە ماوە، دەست پێوە بگرە، دەمرین لە برسان، یەعنی نیزاعی بەینی بووك و خەسووی، لەسەر یەكێك ئەو جۆرە شتانە دروست بووە، ئنجا كە شەڕیش بێ و كاسبیس نەبێ و بەفرەستووریش بێ و، خۆ مام هێمن بە درێژی باسی دەكا لە كتێبەكەیدا: مەسەلە دەعبای كێوی... دەعبای كێوی، خواردنی نەماوە، دیارە كەو باڵدارێكی سەختە بۆ خۆخواردنێ و خۆڕاگرە، بەڵان ئەوەندە باریبوو، كونە بەردیش، چونكە ئەو زیخیش دەخوا!، كونە بەردیش پڕ ببون لە بەفر! شوێن نەمابوو، بە دەشتێ وەربوو، خەڵك بە دەستی دەیگرتن، من بۆ خۆم منداڵ بووم كەوم گرتووە ئەو كاتەی، كۆمەڵێكی مێرمنداڵ بووین، ئەوا دەچووین، كە گەنجەكان دەچوون بۆ ڕاوێ ئەمەش بەدوایان دەكەوتین، كەوێك ئە لەوێ دەكەوت، كە دەكەوت ئەو توانایەی نەدەما هەڵفڕێتـەوە، دەچووین دەمانگرت، من بۆ خۆم ئەو ساڵەی كەوم گرتووە. وە ئەو منداڵانەی كە لە سەرەتایی دەهاتن لە لادێكانەوە بۆ مەكتەبی بنگردی، ئەو ڕۆژانە نەیاندەتوانی بە وڵاخیش بێن بەڵكو ئێمە كە لە داخلی نێو دێیەكەی بووین، بە سواری وڵاخی دەیانبردین، كە دەوامیش تەواو دەبوو بە واماندا دەهاتن بە سواری وڵاخی دەیانبردینەوە. بەڕای من ئەو بەفرە، بەفرەستوور، ئەو بەفرەیە كە لە ١٩٤٥ و ١٩٤٦ و ئە لەو دەورەدا بووە...

**پ: مامۆستا، یەك پرسیاری كەت لێكەم، لەنێو خەڵكدا زۆر جار دەڵێن مەلیك مەحموود سكەی خۆی لێداوە، من لە كتێب و سەرچاوەی ڕەسمی و شتی ئاوادا نەمدیووە، ئایا بە حوكمی ئەوەی جەنابت لە سەردەمێكدا ژیاوی، مەلیك مەموود ماوە، ئەو قسە و باسانە ڕاستن؟**

و: من، كاك ئارارات، بە حوكمی ئەوەی وەكو شیلانە، یا بە حوكمی ئەوەی خاڵێكم[1] بە درێژایی تەمەنی هەر لەگەڵ شێخ مەحموود بووە، تەنانەت پیاوی تفەنگی شێخ مەحموودیش بووە، شێخ مەحموود چۆن ژیاوە، ئەو ئاوا ژیاوە، دیوەخانی تایبەتی خۆی هەبووە، هەر لەگەڵ شێخ مەحموودی بووە، هەتا ئێستا ڕۆژێك لە ڕۆژان باسی ئەوەی بۆ نەكردووم كە شێخ مەحموود سكەی خۆی هەبووبێ، شێخ مەحموود سكەی خۆی نەبووە، ئەگەر سكەی خۆی هەبایە من دەمزانی، چونكە ئەو خاڵەم زوربەی شتەكانی پاراستبوون، زوربەی شتەكانیم لەو بارەوە لەو وەرگرتووە، بەڵام پولی هەبووە، پولی بەریدی هەبووە، بەڵام سكەی نەبووە، پارەی نەبووە، پارەیەك نەبووە بە ناوی مەلیك مەحموودەوە...

---

١ – خاڵێكم: یەكێك لە خاڵۆكانم.

**پ: مامۆستا دیاره جولەکەکانی کوردستان بەتایبەتی هی مەنتیقەکە، لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەجاکاندا ڕۆیشتوون، هیچت بە بیر دێ سەبارەت بە داب و نەریتیان، بە ئیشیان، بە گەورە پیاوەکانیان لە قەلادزێ؟**

و: وەکو بەبیرهاتن، بەبیرم نایە، جولەکە چیە و موسڵمان چیە و یاخود ئەمانە ئیشیان چیە چ نیە، بەڵام بەس ئەوەندە دەزانم لە کاتێکدا من کە چوومە ئیبتیدائی، ئەو کاتە جوولەکە لە بنگردی هەبووە، جولەکەی لێ هەبووە، ئەو جولەکانە، مەسائیلی تەموینییان گرتۆتە ئەستۆ، هاتووە قوماشیان تەوزیع کردووە، کە دابەشکراوە بەسەر خەڵکیدا، شەکریان دروست کردووە، دابەش کردووە، گەنم و جۆ و ئەوانە کە حکومەت ناردوویەتی بۆ خەڵك ئنجا لە تەڕەف ئینگلیزەوە بووبێ، لە تەڕەف حکومەتی عەرەبییەوە بووبێ، ناردویانە، دابەشیان کردووە، ئەو ئیشانەیان کردووە، ئەوانەم تەقریبەن وەکو شتێك بەبیرە، بەڵام بەبیرم نایە فەرقم نەکردووە ئەوە جولەکەیە وە یاخود ئەوە موسڵمانە، بەبیر نایە، بەڵام زۆریشم لە بارەیوە بیستوون کە لە قەلادزێ ژیاون و لە بنگرد ژیاون و لە مەرگە ژیاون و... جولەکە لە هەموو شوێنان هەبوون، لەبەر ئەوە، زۆر ئیقتیسادی بوون، ئیش و کاریان زێڕنگەری و تیجارەت و و بازرگانی و لەبەر ئەوە لە هەر شوێنێك بووبن، دەوڵەمەندی شوێنەکان بوون...

**پ: مامۆستا گیان دووباره دەستت خۆش بێت، هەر تەمەندرێژ بیت، هەر لەشساغ بی، من گەیشتوومەتە کۆتایی پرسیار و باسەکانم، ئەگەر جەنابت خۆت حەز بکەی شتێمان پێ بڵێی...**

و: وەڵا، من سوپاسی هەستتان دەکەم، سوپاسی ئەو بەسەرکردنەوەیەتان دەکەم، پێم خۆشە جارجاریش کە ئاوا یەکێکی وەکو تۆ سەرمان لێ بدا، هەم وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەك وە هەم هاندانێکیشە بۆ من کە بەردەوام بم لێی لە هێندێك مەسائیل و ئیش و کار و ئەو جۆرە شتانەدا هیوادارم خەڵکیش بزانێ کوڕی چ نەتەوەیەکە، نەتەوەکەی لە چ ئاستێکدایە؟ چی پێویستە بۆ بەرز بوونەوەی نەتەوەکەی، بۆ ڕزگار بوونی نەتەوەکەی بۆ ئەوەی جارێکی کە تووشی ئەنفال نەبێتەوە کە کارەساتێکی دڵتەزێنە، تووشی گوند ڕووخان و کوشت و کوشتار نەبێتەوە، چونکە دوژمنەکانمان دوژمنی بێ ویژدانن، ئینسانیش لەگەڵ ئینسانی بێ ویژدان نابێ تەوەقوعی چاکە کە چاکەیەکی بەرامبەر بکرێ، دەبێ بۆ خۆت هەبی، داوام لە زوربەی خەڵکان و گەنجان و هەیە کە دەربەست ئەدەبیاتی خۆیان بن، مەبەستم فۆلکلۆری خۆیانە، دەربەستی نەتەوەی خۆیان بن، خاکی خۆیان خۆش بوێ، چونکە خاك لە هەموو شتێك خۆشەویستترە، تۆ لە خاك دروست بووی و لەو خاکەشدا

ژیاوی، وه لەو خاکەشدا دەمری، نەتەوەی ئەو خاکەی، هەوای ئەو خاکەی هەڵدەمژی. ئاوی ئەو خاکەی دەخۆیەوە، تیشکی ڕۆژ لەسەر ئەو خاکە لێت دەدا، بەسەر ئەو خاکەدا دەڕۆی، پێویستە ڕێزی ئەو شتە بگری کە ئیستیفادەت لێ کردووە، کە ئەویش لەو وڵاتە جوانەدا هەیە.

**پ: مامۆستا سەبارەت بە دراوسێکانمان کە زۆر دراوسێی چڵێس و بەدڕەفتار و خراپن، یەک پەندی کوردی زۆر جوان هەیە دەڵێ: دەگەڵ سەی کەوتووینە دە چاڵا! پێم وابێ ئەوە بۆ کورد دەگونجێ...**

و: فیعلەن جا ئەوە ئاوایە، بەزەییان پێتدا نایەتەوە، حیسابی ئەوە بۆ تۆ ناکا کە تۆ ئینسانی، لەبەرئەوە، ئەو هەوایەی هەڵیدەمژی بە ئی خۆی دەزانێ، غەدری لێدەکەی! ئەو خاکەی بەسەریدا دەڕۆی، بە ئی خۆی دەزانێ و غەدری لێدەکەی، ئەوەی کە دەیخۆی، بە هی خۆی دەزانێ و غەدری لێدەکەی، هەمووی بە هی خۆی دەزانێ، تۆ بە غەددار دەزانێ کە غەدرت لێ کردووە، بەو چاوەوە سەیرت دەکا. من پێم وایە فەلاحێك چەند ڕقی لە مشکێکە، چەند ڕقی لە کوللەیەکە، چەند ڕقی لە سنێکە، دوژمنەکانی ئێمەش ئەوەندە ڕقیان لە ئێمەیە، وە بەزەیی فەلاحێك بۆ سن و کولله کە بەرهەمەکەی دەخوا، بەزەیی ئەوانیش بۆ ئێمە بەو شێوەیەیە...

**پ: زۆر سپاس مامۆستا**

و: من سوپاسی ئێوە دەکەم...

(مامۆستا زیاد، لە ڕێکەوتی ٢٠١٧/٣/٢١ لە شاری ڕانیە کۆچی دوایی کرد.)

ژیاوی، وە لەو خاکەشدا دەمری، نەتەوەی ئەو خاکەی، هەوای ئەو خاکەی هەڵدەمژی، ئاوی ئەو خاکەی دەخۆیەوە، تیشکی ڕۆژ لەسەر ئەو خاکە لێت دەدا، بەسەر ئەو خاکەدا دەڕۆی، پێویستە ڕێزی ئەو شتە بگری کە ئیستیفادەت لێ کردووە، کە ئەویش لەو وڵاتە جوانەدا هەیە.

**پ: مامۆستا سەبارەت بە دراوسێکانمان کە زۆر دراوسێی چڵێس و بەدرەفتار و خراپن، یەك پەندی کوردی زۆر جوان هەیە دەڵێ: دەگەڵ سەی کەوتووینە دە چاڵێ! پێم وایێ ئەوە بۆ کورد دەگونجێ...**

و: فیعلەن جا ئەوە ئاوایە، بەزەییان پێتدا نایەتەوە، حیسابی ئەوە بۆ تۆ ناکا کە تۆ ئینسانی، لەبەرئەوە، ئەو هەوایەی هەڵیدەمژی بە ئی خۆی دەزانێ، غەدری لێدەکەی! ئەو خاکەی بەسەریدا دەڕۆی، بە ئی خۆی دەزانێ و غەدری لێدەکەی، ئەوەی کە دەیخۆی، بە هی خۆی دەزانێ و غەدری لێدەکەی، هەمووی بە هی خۆی دەزانێ، تۆ بە غەددار دەزانێ کە غەدرت لێ کردووە، بەو چاوەوە سەیرت دەکا. من پێم وایە فەلاحێك چەند ڕقی لە مشکێکە، چەند ڕقی لە کوللەیەکە، چەند ڕقی لە سنێکە، دوژمنەکانی ئێمەش ئەوەندە ڕقیان لە ئێمەیە، وە بەزەیی فەلاحێك بۆ سن و کوللە کە بەرهەمەکەی دەخوا، بەزەیی ئەوانیش بۆ ئێمە بەو شێوەیەیە...

**پ: زۆر سپاس مامۆستا**

و: من سوپاسی ئێوە دەکەم...

(مامۆستا زیاد، لە ڕێکەوتی ٢٠١٧/٣/٢١ لە شاری ڕانیە کۆچی دوایی کرد.)

## چاوپێکەوتن لەگەڵ م. زیاد، فۆلکلۆرناس
## سازدانی: سامان عومەر سەیدگوڵ[1]

"٣٠-١٢-٢٠١٠ دوای نیوەڕۆی ڕۆژی پێنجشەممە، لەگەڵ عومەر حاجی[2] لە شاری ڕانیە لەماڵەکەی خۆی سەردانمانکرد، بە مەبەستی وەرگرتنی هەندێ زانیاری و بابەتی بڵاونەکراوەی فۆلکلۆری، بۆ بەکارهێنانی لە توێژینەوەیەکی مەیدانی بەناونیشانی (بابەتە ئەدەبییەکانی فۆلکلۆری دەڤەری بیتوێن-پشدەر) کە وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی پلەی بکالۆریۆس لە قۆناغی چوار، بۆ بەشی زمانی کوردی، کۆلێژی زمان لە زانکۆی کۆیە، ئامادەکرا."

تێبینی: ئەم چاوپێکەوتنە، بە شێوەی ئاخاوتنی پشدەر، کە شێوەی ئاخاوتنی م. زیاد خۆیەتی، نوسراوەتەوە بێ دەستکاریکردن.

* م. زیاد: ئەو داستانانەی لە خودی دەڤەری پشدەرێدا ڕویانداوە، تایبەتن، نەك هی شوێنیکەبن هاتبن، هەر هی خودی پشدەرێن...

* شێخ فەرخ کە داستانێکە، داستانێکی زۆر بەهێزە، هی زەمەنێکی کۆنە، دیارە تاریخەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوای دەرکەوتن و هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، چونکە مۆرکی ئیسلامەتی پێوەیە، وەکو نوێژ و مزگەوت و ڕەمەزان و ڕۆژوو، ئیدی ئەو جۆرە شتانە... دیارە ئەو داستانە تایبەت پشدەرییە، چونکە ئەو شوێنانەی کە باسدەکرێن تەنها لەپشدەرێدان، مەسەلەن باسی (داودێ) دەکات، داودێ ئێستا دێیەکە کە باسیدەکات وەختی خۆی شاربووە. گوندی داودیە، بە ٢٠ بۆ ٣٠ کیلۆمەترێك لە پشتی قەڵادزێوەیە. باسی کانییەکە دەکات کە هەر ماوە، باسی (ئالان) دەکات، باسی (گردی مروان) دەکا ئێستا ئەوە هەر لەجێی خۆیە. باسی کوێستانی هی (سەرگوێن)ی دەکات، باسی (کانییە میری) دەکا، باسی (زینوی چاوڕەشان)ی دەکا، ئەوە شتێکی مەوجودن ئێستا کە ماون... هەموو داستانەکە پشدەرییە، تابعێکی دیانەتی هەیە دەکەوێتە بابی ئەفسانەوە، هەرچەندە هەندێ کەس ناڕەحەتن بەوەی کە دەڵێم دەکەوێتە بابی ئەفسانەوە، چونکە ئەوانە بە قودرەتی شێخ و ئەوانەی دەزانن، بەڵام من ڕەئی خۆم وایە، ئەو داستانە، هەر لە کتێبە دینییەکانەوە هەندێ

---

١ - سامان عومەر سەیدگوڵ، مامۆستا و ڕۆژنامەنووس، لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٩ ناحیەی حاجیاوای سەر بەقەزای ڕانیە.

٢ - عومەر حاجی: عومەر حاجی ئیبراهیم ڕۆستەم، خزم و نزیکی مامۆستا زیاد.

سەرچاوەی لێهەڵهێنجراوە، وەکو مەسەلە قسەکردن لەگەڵ باڵداران یان منداڵ کە لەدایك دەبێ، قسەدەکات، یان (شێخ فەرخ) کە لەدایك بووە، قسە دەکا. من دەزانم ئەو بیرە (فکرە)، لە بیری عیسای کوڕی مەریەمەوە هەڵگیراوە، کە بە منداڵی (تەبهییە)ی بۆ دایکی کردووە، قسەکردن لەگەڵ تەیر و ئەوانە، کە لە حەزرەتی سولەیمانەوە سەرچاوەی گرتووە و وەرگێراوە و هاتووە، بەڵام هەندی کەس کە من بڵێم ئەوە ئەفسانەیە، پێیان ناخۆشە، چونکە من لەو ڕوانگەیەوە دەڵێم ئەفسانەیە وەکو من بیستومە لە پیاوە دینییەکان، ئەگەر بە موعجیزەی حساب بکەین، موعجیزە تەنها موختەس بووە بە پێغەمبەرانەوە، موعجیزە موختەس نەبووە بە خەڵکی غەیری پێغەمبەرانەوە، ئەگەر موعجیزە موختەس بوایە بە خەڵکی تری غەیری پێغەمبەرانەوە، مەسەلە عەلی کوڕی ئەبی تاڵب، ئەبوبەکر عومەر، ئەوانە دەبوون بە ساحێبی موعجیزە، لەبەر ئەوە، ناتوانی ئیعتیماد بکەیە سەریان. بەڵام بیرەکە دیارە لەو شتانەوە وەرگیراوە، ئەوە یەکێکە لە داستانە بەهێزەکانی هی مەنتیقەی پشدەرێ، کە گۆیندەکانیش ئێستا لەم حاڵەتەدا پێم وایە یەك دوانێکیان مابن، ئێستا مردوون، بەڵام پێش ئەوەی بمرن من توانیومە لە هەشتایەکان و هەتا لە شەستەکانەوە ئەو داستانانەیان لێوەربگرم و تەسجیلم کردوون و نوسیومنەوە. لەو ئاخیرەیدا کردومن بە کتێب.

* داستانێکی دیکەیش هەیە، پشدەرییە (برایمۆك)، ئەویش هەر داستانێکی پشدەرێیە، دیارە برایمۆك، بەیتبێژەکان (حاجی مەحموود گەناوی) چاکی دەگوت، ئێستا خدری قادری (خدر بلوێر) کە لەو دیووە[1]، ئیستاش ماوە، ئەو چاکی دەگوت. داستانێکی خۆشە بەڵام لایەنی ئەفسانەیی تێدانییە. برایمۆك، لە دیووی ئێرانی بووە، ئەو کاتەی مەنتیقەی سەردەشتیش لەگەڵ کوردستانی عێراقێ یەك بووە، لەگەڵ برازای (میر زەیندین) و ئەوانە بووە، دەیهێنن دەسەڵاتدارەکان لێیوەردەگرن دەڵێن ئێمەش کوڕێکمان هەیە ناوی برایمە، با بێن پێکەوە بخوێنن، دەیهێنن بۆ لادێی و بۆ ئەو شوێنانە و لەگەڵیان دەبێ و، وەلحاسڵ دوایی وای لێدێ برایم تووشی نەخۆشییە دەبێ و ئەو جۆرە شتانە و، دوایی وەك دەڵێن حەوت ساڵان بەکۆڵی گێڕاویەتی. لەدوایی ئیدی چاك بووەتەوە... داستانەکە لە بازاڕ زۆرە، دەتوانی بیکڕی و گوێی لێبگری، بە کاسییەت هەیە و حەقیقەتەکە دەزانی...

* (قەر و گوڵەزەر)، دیارە بیتوێنییە، بە ڕای من تاریخەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نیزاعی سەفەوی و عوسمانیان، نیزاعی مەزهەبی شیعە و ئەوانە، ئەو داستانەی کە من

---

١ – لەو دیوو: مەبەست لە ئەو دیوو سنوورە، کە بەتایبەت مەبەست لە مەحاڵی سەردەشتە لە خۆرهەڵاتی کوردستان.

پەیوەندیم پێوە هەیە داستانی (سەلیمی بایزی)، سەلیمی بایزی چاکی دەگوت هی قەر و گوڵەزەری، چونکە بۆخۆی بۆی گوتوم ئەو داستانانە... گوڵەزەر، کچی (حەمەدی باشاغا) ی بووە، باپیرە گەورەی (هەباس ئاغا)ی، ئاخر ئێرە کاتی خۆی هەموو خێڵەکی بوون، هەندێك دەڵێن وانییە هەندێ دەڵێن وایە (قەر) دەچێتە ڕاووشکاریێ، خەونی دەبینێ لە خەوێدا تووشی گێرەوکێشەیەکی ئاڵۆز دەبێ، نجومگەر بۆی دەگرنەوە دەڵێن: پاشا، بە بابی دەڵێن، با بچی بۆ ڕاووشکاریێ لەبیری دەچێتەوە و، لەوێ، تووشی دەروێشێکی دەبێ، دەروێشەکە لەبەردەستانی ڕادەوەستێ و ڕەسم، عەکسێکی بۆ دەردێنێ، ڕەسمی خاتوو (گوڵەزەر)ییە، لەوێ بێهۆش دەبێ و... لەدوایە دێتەوەو تووشی سەودابیەکی دەبێ و، کە توشدەبێ، دێ بە پاشایەکەی دەڵێ لەگەڵ شوانەکان ژنەکانیان دەگۆڕنەوەو ئەو دەبێ بە شوانی حەمەدی باشاغای و، شوانەکە جلو پارەی دەبا و دەڕوا... ئەوەنییە ئیدی لەدوایە قەر کە عەشقی دەبێ، سبەینیەکی قەر، بەرخان دەبا بۆ لەوەڕێ، حەوزێك دەبێ، خۆی تێهەڵدەکێشێ، ئاوی دەخوا و مەلەی دەکا، دێتە دەرێ و وەکو غەریبێك بەخۆی هەڵادەڵێ، خاتونیش دەڵێ ئەو سەگبابە منی بە تفەنگی بێتەقە کوشت! وەڵاهی دەبێ بەدوایکەوم، ئەوە چییە، هەر کە دێتەدەرێ، قەر دەستی لەبنا گوێی دەنێ و بەخۆی هەڵدەڵێ و دەڵێ:

"کوڕە خۆ من قەر نەبووم، هەر بەئارەزوویەکێ دڵی خۆ، نێوم لەخۆدەنایەوە قەرە.
ئەمن شازادە عیزەد خانم پێدەڵێن، کوڕەگەورەی شاعەباسی قەجەرە و
بابی خۆم بەزیندی خۆی، تاج و تۆماری دە پاشایەتیەی دەنام لەسەرە
حوکمێ خۆمدەکرد لە ئێرانێ، لە چینێ، لە ماچینێ،
لە بەڵخێ، لە بوخارایە،
هەر لەوان کوێستانی دە بڵند و لەسەرە..."

....،

م. زیاد: ئینجا کە بە خۆیدا هەڵدەڵێ و زەلیلی خۆی دەگێڕیتەوە بە شوانی و... ئینجا دەڵێ:

"هەرچەندی قەڵەمێکی[1] پارم بەلاقیدا دەچوونەوە، دەبوونەوە بە نشتەرە![2]
ئەوجا زەلامێکیش لەوێرا دێ، دەڵێ فلانکەس ئەوی مەبەگی[3] وێوە بەرە[4]

١ – قەڵەم: درك، چقڵ، یان هەر دار و چیلکەیەکی سەرتیژ یان تیژکراو... لە موکریان و پشدەر و بیتوێن و هێندێك جێگەی دیکە، بە درك دەڵێن قەڵەم.

٢ – نشتەر: نەشتەر، چەقۆی قەبارە نێوەنجیی زۆر تیژ.

٣ – مەبەگی: ساغ نەبۆوە کە مەبەست لە چییە. (ئامادەکاران)

٤ – وێوە: ئەولا، ئەولاوە، بۆ ئەولا.

بەرە: ببە.

وێوە بەرە: ببە ئەولای.

بەڵام ئێشتاشم ئەو حاڵە پێخۆشترە لە پاشایەتییەکەی قەجەرە،
چونکە هەموو نیوەڕۆیان ئەگە دێمەوە،
خاتوون دێ دەستم لەملی دەکا
سێ جارم بەدڵ ماچدەکا،
دەڵی ڕەبی بەخێرێیەوە شوانۆکەی غەریبۆکەی بێکەس و بێدەرە...[1]"
خاتون گوێی لەو لاوانەوەیە دەبێ و لێك ئاشکرا دەبن، تەگبیردەکەن...

م. زیاد: وەختێك، خێڵەکی چوون بۆ کوێستانێ بەدەربەندیدا، لەودیووی دەربەندی، ماوەیەکی ماونەوە، کە بەهار ساردبووە و ماوەیەتی پێهەڵگەڕێن، کوڕێك خەڵکی مەنتیقەی سەنگەسەری دەبێ حەز لە کچێکی لەو ڕەوەندانە دەکا، دەیەوێ خۆی بڕازێنێتەوە کە شایی و شتی وادەکەن خێڵەکی. لەوێ ئەو کوڕە دەیەوێ خۆی بڕازێنێتەوەو پێویستی بە شەدەیەکی دەبێ خۆی جوانکا، هیچی نابێ فەقیر دەبێ، کابرایەك شەدەی دەبێ، دەڵێ ئەو شەدەم پێبفرۆشە، ئەویش دەزانێ مەسەلەکەی چییە، داوای سعرێکی گرانی لێدەکا، کوڕەکەش ئەو پارەی نابێ دوو سێ ڕۆژان دەچی فایدەی نییە، سێ چوار ڕۆژان شایی دەگەڕێ، ئاخیری کوڕەکە دەچی بەبێ شەدە لەگەڵ خێڵەکیان هەڵدەپەڕێ، تا ماڵ باردەکرێن و پێهەڵدەگەڕین بۆ کوێستانێ. کوڕەکە، بە بەرماڵی کابرای شەدەیدا دەڕوا، کابرا بانگیدەکا دەڵی وەرە کاکە، ئەو شەدەیەی کە داواتکرد، بەو پارەیەی داتمێ، پێت دەفرۆشم، ئەویش دەڵێ: "شەدەم بۆ دەربەندی دەویست! تازە پێویستم بە شەدەی نییە!" ئینجا ئەوە دەتوانی تەفسیراتی زۆری بۆ بکەی بۆ هەندێ مەوزوع.
بۆیە پەندی کوردی کەمی هەیە لەخۆوە گوترابێ، یان پەندەکە گوتراوە داستانەکەی بەدواوە بووە یاخود داستانەکە کورتکراوەتەوە لەپەندەکەدا.

م. زیاد: کەر لەکوێ کەوتووە و کوندە لەکوێ دڕاوە!
کابرایەك، سەپانیان دەبن، لە دەشتێ دەغڵی دەدورنەوە. جاران ئاویان کە بۆ دەچوو، کوندە بوو، لە کەرێیان باردەکرد و دەڕۆیشتن. کوڕێك حەزی لە کچێکی دەکا، کوڕەکە ئاوی دەبا بۆ سەپانان، کوندەیەکی ئاو دەبا بۆ سەپانان و، لەپێش خۆی دادەنێ، ئینجا دەڵێ ئەمن مادام بەکن ماڵی کچەکەیدا دەڕۆم، دەڵێ بەڵکو ئێ... چاوێکم پێبکەوێ، یا دانیشتنێکی بکەم و ئەوانە... بەوێدا دەڕوا و کچەکە لەکن ڕەزی دەبێ، کوڕە دادەبەزی و

[1]- ئەو بەیتەی قەرو گوڵەزەر، کە بەیتبێژ (سەلیمی بایزی) خوێندوویەتی، م. زیاد بەدەنگی خۆی و بە ئاوازەوە، چەند کۆپلەیەکی بۆ گوتین. لە هەندێ شوێن چەند وشەیەك بۆم ڕوون نەبوون. - (ئامادەکاری چاوپێکەوتن).

لەگەڵ کچەکەی دەخافڵێن بەقسان، کە دەخافڵێن بە قسان، کەرەکە بە کوندە ئاوەکەیەوە دەڕوا، کە دەڕوا، جۆگەیەك دەبێ کەرەکە دەیـەوێ بپەڕێتەوە و، کوندە ئاوەکەی لێبەردەبێتەوە. کەرەکە دەچەقی لە قوڕێدا و، کوندە ئاوەکەی لێبەردەبێتەوەو ئاو دەیبا و دەدڕێ. کوڕەکە کاتێ بەخەبەردێ، نە کەر ماوە و نە کوندە! دەچی دەگەڕێ و کەرەکەی دەبینێتەوە و کوندەش ئاو بردوویەتی. ئاوا دەچی بۆ کن سەپانەکان، سەپان دەڵێن کوا ئاو؟ دەڵێ وەڵا کەرەکەم چەقیووە و کوندە ئاوەکەش دیارنییە و نازانم چی لێهاتووە! سەپانەکە دێن دەگەڕێن، کە دێن دەگەڕێن، تەماشا دەکەن کەرەکە لەوێ کەوتووە، بەڵام کوندە، نییە! پێدادەگەڕین لەئاوێدا لە خوارێ، کوندەکە دەبیننەوە، ئامۆۆۆووو، کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە! ئینجا دەزانن ئەو کوڕە لەکوێ و بۆچی خافڵاوە و لەوێ ئاوای لێهاتووە!

م. زیاد: کابرایەك باراشی دەبا بۆ ئاشی. جاران لە ئاشی ئاوی لێدەکرا. کابرایەکی دیکەش، هەر باراشی دەبا بۆ ئاشی، لە ڕێیە پێکەوە دەڕۆن، ئەو دەڵێ ئەگەر گەیشتینە ئاشی، نۆبەی من دەبێ ئەویش دەڵێ نۆبەی من دەبێ. لەوێ لێیان دەبێ بە هەرا، هێشتاش نەگەیشتوونە ئاشی. دەوەنێکی لێدەبی، (دەوەن یەعنی کۆمەڵە دارێکی بچووك بەیەکەوە)، لێیان دەبێ بەهەرا. لەوێ دەڵێن باشە پێش ئەوەی بگەینە ئاشی، با لەیەکی دەرکەین، لەو هەرایەدا، یەکیان یەکی دەکوژێ، ئینجا مەسەلەی (دەوەنەئاش)ی، لەوەوە هاتووە، بۆیە دەڵێن هێندە لەسەر شتی مەڕۆ! مەیکە بە دەوەنەئاش!

بەسەرهاتی هاوڕێیەکی مامۆستای بۆ گێڕاینەوە، بەڵام ناوەکەی بەیان نەکرد:

م. زیاد: لە قەڵادزێ، وەختی خۆی کە لە ئێرانێ هاتینەوە ساڵی ١٩٧٥، ڕۆیشتین بۆ جنووب، لە جنووب لە دیوانییەی، ڕۆیبوو، ئینجا گوتی ئاودەست و ماودەستی لێنەبوو لەو شوێنەی، گوتی منیش ڕۆژێکی زۆر تەنگاوبووم نەمدەزانی عەرەب لەکوێ گووی دەکەن، گوتی زۆرم فکرکردەوە تەماشامکرد عەرەبێکم دیت، تۆزێك دوورکەوتەوەو عەبایەکەی بەخۆیداداو دەستی بە گووکردنێ کرد. گوتم ئێهێێێی!... ئەوە دیمەوە، بەڵام بەڕاستی من عەبام نەبوو، گوتی منیش عەبام لە یەکی وەرگرت، ڕۆیشتم بۆ ئەو دەشتەی، گوتی چونکە فێرنەبووم، عەبایەکە وەبن خۆم کەوتەوە، گوتی ئەگەر هەستام، سەرسێڵێکم گوو لەسەر عەبای کردبوو! گوتی وەڵا تا تۆزێ پاکم کردەوە، هاتن گوتیان ئەوە چتکردووە!؟ گوتم وەڵا ئەوە شتێکی ئاوا بووە، نەعلەت لە بابی ئەوەی هێنامیە ئێرە!

م. زیاد: کەوای بەری کەسکە

دەڵێ لە کۆیە، ماڵێك زاوایەکیان دەمرێ. لە شین و گریانێدا ژنێکیان پێیهەڵدەڵێ و دەڵێ:
"کەوای بەری تەسکە، پڕی بەرییەی میسکە! (واتە پڕی بەرۆکی میسکە، پڕی بەرۆکی عەترە) لاڵبم چاوی ڕسکە![1]"... ژنێکیکەیان بانگیکردە ئەو ژنەی کە ئەو پێداگوتنەی دەڵێ و نۆری پێخۆشدەبێ و پێیدەڵێ: "ئەوەی هەڵگرە تا ژنی حاجی بەکری دێن، ئەگەر ژنی حاجی بەکری هاتن، ئەوکاتەی ئەوەی بڵێ![2]"

م. زیاد: کچ و کوڕ کە دەچن بۆ گیاو کنگر و کاردو و ئەوانە پێکهەڵادەڵێن، جار هەیە شەڕەجنێوی دەکەن و جار هەیە شتی حەزلێکردە بەیەکتری دەڵێن و ئاوازێکی تایبەتی هەیە وەك گۆرانی، ئینجا یەکێك لە بالۆرەکان دەڵێ:

شاخۆلکەم چاولێیە شاخۆلکەم چاولێیە

لانکەی ساوام پێیە دورم ناگەمێیە

هێڕۆۆۆۆۆ هێڕۆۆۆۆۆ

یەکێکی دیکەیان دەڵێ:

بالۆرێ نازانم، دەرێژم چاوانم، خوشکی حەوت برایانم،

ئەمبەروبەر چۆمە، کەوم لێبوون کۆمە، تێکرا دەمکەن لۆمە

م. زیاد: داکێ کوڕان پەڵەیان بڕان[3]، داکی کچان کەوتوون لە خڕان!

لێرەدا ئەو پەندە لایەنی پیاوسالاری زاڵە و قیمەتێك بۆ ڕەگەزی مێ، دانانێت. یانی داکی کچان ئەوەی کچی هەبن، بێدەسەڵاتە، چونکە جاران مەمنوع بووە بچن کاسبی بکەن و دەرو دەشتێ بکەن، ئەوەی کە کوڕیشی هەبووە جیاواز بووە.

---

١ – ڕسك: ساغ نەبۆوە مانای چییە، بەڵام دیارە کە وەسفێکە بە خراپی. (ئامادەکاران)

٢ – نێوەرۆکی ئەو پێداهەڵگوتنە نۆر ڕوون نییە، بەداخەوە ئامادەکاری دیدارەکەش، لەوکاتەدا بیری نەبووە کە مانا و مەغزاکەی لێپرسێت. بەڵام لەوانەیە (ژنەکانی ماڵێ حاجی بەکری) کۆستێکی لەو شێوەیەیان کەوتبێت و حەزیان لێبووبێت گوێیان لە چەشنە لاواندنەوەیەکی وا بێت و، ئازیزەکەی خۆیان بێتەوە پێش چاوان. (ئامادەکاران)

٣ – پەڵەیان بڕان: عەیب و عاریان نەمان، مەبەست لەو ژنەیە کە کوڕی بووە، مادام کوڕی بووە، ئیدی هیچ پەڵەی تێدا نەمان!. (ئامادەکاران)

**پرسیار: مامۆستا ئەو گۆرانیانەی لەم مەنتیقەیە گوتراون، زیاتر چ جۆرێك بوون كە بۆ دروونە و ئەو شتانە گوتراون؟**

م. زیاد: ئەگەر دیوانی عەلی بەردەشانیت دەستكەوی تێیدان، پێشەكییەكەی، بەكرەیی تێدان. بەكرەیی، ئەو گۆرانیانەن كە بۆ دروێنەن گوتراون، لەو ئاواز و بەسەرهاتەشدا (زێرنۆكێ) گوتراوە بە گۆرانی دروێنەی.

م. زیاد: گەنمی چلەی، چ لە هۆڕ و چ لە گۆڕ!

ئەوە بۆ فەلاحێكی تەمبەڵ دەگوترێ كە بێخەمبێ، تا دەگاتە چلەی زستانێ، گەنمیش كە لە چلەی زستانێ كرا، دەبێتە قڕ و هیچی لێپەیدا نابێت، ئەگەر شتێكیش بكاتەوە، هەر ئەوەندەی دەكاتەوە كە لە هۆڕیدا بووە، (هۆڕ یەعنی ئەو شوێنەی كە گەنمی تێدا هەڵدەگری، وەك مەخزەن و ئەو شتانە)، دەڵی بە چلەی كە گەنمت كرد، هەر وەك ئەوە وایە كە لە ماڵێ بووە، هەر ئەوەندەی دەكا، بەهەوپای زیاتر مەبە، ئەوە پەندێكی ئەو مەنتیقەیە.

م. زیاد: پێروو ئاوابوو، نیسك ساوابوو!

پێروو، كۆمەڵێك ئەستێرەی كزن بەیەكەوە، وەك گەلاوێژی، نیشانەی بەهار و پایز و شتی وایە. ئەوكاتەی كە پێروو ئاوادەبێ، ئەگەر نیسكی بكەی، ساوادەبێ، چونكە نیسك دەبێ لەگەڵ گەنمی بچێنرێ[1]، چونكە ڕەقە و ناڕوێ وا زوو و زۆری پێدەچی تا لەبن عەرزی دێتەدەرێ، تۆوەكەی ڕەقە، بە عەكسی نۆكێوەیە، نۆك دەبێ دەوروبەری بەهارێ، نەورۆزێ، بكرێ و زووش دێتەدەرێ. ئەوە ئەو پەندەیە، سەیری عاسمانێ بكە: ئەگەر پێروو ئاوابوو، ئەوە بەكەڵك نایە تازە نیسكی بچێنی، لێیگەڕێ!

م. زیاد: پایزان بە باوەشێنی برۆ ژوورێ، بەهاران بە مەقلی وەرە دەرێ!

هاوینان خەڵك لەسەربانی دەنوێ، بەڵام كە هاوین بڕایەوە و پایز داهات، هەر گەرمابێ بچۆ لە ژوورێ بنوو، با سەرمای پایزێت لێنەدا. پایزان بە باوەشێنی برۆ ژوورێ بەڵام بەهاران بە مەقلی وەرە دەرێ، ئێستا هەر سەرمابێ بەهاران وەرە دەرێ.

كەوایە ئەوە مانای ئەوەیە سەرمای بەهارێ قانزانجت پێدەگەیەنێ، بەڵام هی پایزێ، زەرەرت پێدەگەیەنێ!

---

١ – مەبەست لەوەیە كە نیسكیش هەر لە وەرزی داچاندنی گەنمدا (واتا پاییزان) بچێنرێت، مەبەستی لەوە نییە كە نیسك لەگەڵ گەنم تێكەڵ بكرێت (ئامادەكاران).

م. زیاد: كۆلكی پاش كێوان، هەڵگرن بۆ هەرمێ پشكێوان.

كۆلك، كۆلكەدار كە لەو پاش كێوانە كەوتوون، بە بێئەهمییەتیان تەماشا مەكەن. هەڵیانگرن بۆ وەختی (هەرمێ پشكێوان)، واتە هەڵیانگرن بۆ بەهارێ. واتە بەهاران. هەندێجار سەرما دەگەڕێتەوەو موحتاجی ئەو كۆلكانە دەبی بیانسووتێنی. (هەرمێ پوشكێو)، هەرمێ زوو دەپوشكوێ، هەندێ درەخت هەیە زوو دەپوشكوێ وەك چوالەبادام، قەیسی، كە هێشتا سەرما و بەفر هەر هەیە كە ئەوانە دەپوشكوێن، بەڵام هەندێ درەخت درەنگ دەپوشكوێن.

م. زیاد: چوالە درۆزن، بەلاڵووك عەیار
هەتا نەپوشكوێ هەنجیر و هەنار
قەت نایە بەهار.

بەلاڵووك و چوالە، زوو دەپوشكوێن، هێشتا زستانی ماوە دەپوشكوێن و گوڵ دەگرن. هەنجیر و هەنار درەنگ دەپوشكوێن و، نیشانەی هاتنی بەهارن.

**پرسیار: مامۆستا زیاد، ئەم شتانەت نوسیوونەتەوە و بڵاوتكردونەتەوە؟**

م. زیاد: نا، هێشتا بڵاونەكراونەوە، ئەوە تۆ هاتووی لەگەڵ ئەو دۆستە (كاك عومەر حاجی) دەنا ئەوە زۆركەس داوای كردووە، بەڵام نەمداوەتێ، چونكە قەرارە ئەوەی نەیكەم بە كتێب نایدەم بەكەس...

## زیاد محەممەد ئەمین ( ١٩٣٨-٢٠١٧ )
## سازدانی: مۆفەق میراودەلی

باپیرم خەڵکی قەڵاچوالانەو پاشان هاتۆتە شاری سلێمانی، چەند کوڕێکی هەیە، یەکێك لەوانە بۆتە ئەفسەری عوسمانی، ناوی ئەحمەدە باپیری منە، کێشەیەکی لەدەست قەوماوە، هاتۆتە ناوچەی مەرگە، نازانم ئەفسەر بووە یاخود گەورەتر یان بچووکتر، بەڵام هێزی چەکداری عوسمانی بووە، ئەو سوتفەیەی لەدەستی قەوماوە، پیاوێکی لەدەست کوژراوە، نازانم بە سوتفە یان بە ئەنقەست کوژراوە، هەندێ ڕیشسپی و پیاوماقوڵی شیلانە سوڵحیان بۆ کردووە، دیارە لەدەستی حکومەت هەڵاتووە، شیلانەیی سوڵحیان بۆ کردووە، لەوکاتەدا هەروەکو ئەحمەد ئاغای میراودەلی[1] دەگێڕێتەوە، خۆم دراسەم کردووە، لە ساڵی (١٨٨٢) حوکمەتی عوسمانی، بەری مەرگەی چۆڵکردووە، هاتۆتە پشدەرێ و بابم لە مەرگە لەنێو (شیلانەیی)یەکان ماوەتەوە، وەکو وەفاداری بۆ ئەو سوڵحەی بۆیان کردووە، لەلای شیلانەییەکان ماوەتەوە، ئەوانیش وەکو شتێك بە کەسێکی باشیان زانیوە، بۆ کاروباری عەشایەری و نەیانهێشتووە، بۆ ئەملاو ئەولا بڕوات، کچێکیان هەبووە بەناوی (خانزاد)، داویانەتێ، لەو ژنە، باوکی من بووە. باوکم هیچکات ژیانی شاری پێ خۆش نەبووە، باپیرم بەتەنها یەك کوڕی هەیە، ئەویش باوکی من بووە، منیش بە تەنیا کوڕی باوکمم، وەکو ئەوان ژیانی شاریان لا خۆش نەبووە، ژیانی لادێ و عەشایەریان پێ خۆش بووە، نەچوونەتەوە بۆ ناو کەسوکاریان لە سلێمانی، چونکە باپیری من کە ئەحمەد بووە، برای (ساڵحی ڕەشە) بووە، کە ئێستا لە سلێمانی خێزانێکی قەرەباڵغ و بەناوبانگ و دیارن لە سلێمانی، لە بواری ڕۆشنبیری و زۆر بواری تر، بەتایبەتی کاك (ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە)، کتێبێکی هەیە بەناوی (شاری سلێمانی) چەند بەرگێکە، ئەوە یەکێکە لە بنئامۆزای من، باوکم لێرە نەڕۆیشتۆتەوە، منیش کاتێك گەورەبووم، بەمنداڵی باوکم کۆچی دوایی کردووە، لەبیرم نییەو وەکو خەوێك وایە، وام لە بیرنییە کە مردووەو جێگەی داخە، من تاقانەم و تەنها خوشکێکم

[1]- مەبەستی ئەحمەدی حەمەئاغای پشدەرییە، کە بیرەوەرییەکانی چاپکراوە بەناوی: بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، تۆمار و ئامادەکردنی، عبدالرقیب یوسف و سدیق ساڵح، سلێمانی، ٢٠٠١. (مۆفەق میراودەلی)

هەیە، ئەویش شووی کردووەو کۆچی دوایی کردووە، بەڵام کوڕو وەچەی ماوە. پووری دایکم هەن بەڵام پووری باوکم نین، باوکم تاقانە بووە، بەبێ خوشك و بەبێ برا، من لە بنگرد مامەوەو باوکی خۆم ئاوا نەدیوە، کاتێك باوکمیان بردە سەرقەبران، گوتیان دەچێتە شاری نوقڵت بۆ دێنێت، ئاوا بەو شێوەیە بیرم دێت، وەبیرم دێت و وەبیرم نایە، ئاوا بەو شێوەیە، بەڵام دایکم زۆر ئازابوو، تەنها یەك خوشکم هەبوو، ناوی (پیرۆز) بوو، شیلانەییە، ناسراو بە (پیرۆزی حەمە مەرجان)، ناوی سیانی پیرۆز محەمەد ئەحمەد، ئێستاش کەسوکارمان لە بنگرد لەناوچەکان ماوە.

من ساڵی (١٩٣٨) لە بنگرد لە دایك بووم، مێژووەکەی ڕێکو پێك و تەواوە، قەناعەتی تەواوم پێی هەیە، چونکە لەدایکی خۆم بیستووە، ئەو ساڵەی حکومەتی عەرەبی هاتۆتە بنگرد، تۆ ئەو ساڵەی لەدایك بوویت، ئەو ساڵەش ساڵی (١٩٣٨)ـە، لە تۆماری باری کەسیەتی هەر (١٩٣٨) تۆمارکراوە[١]، مێژوویەو قەناعەتم پێی هەیە، لەسەرەتایی، کاتێ چوومە قوتابخانە، چەند کەسێك هەبوون، بەهەویابوون بمنێرنە حوجرە بخوێنم، چەند ساڵێك لە بنگرد لای مەلا خوێندم، ناوی مەلاکە نازانم، بەهەرحاڵ (مەلا سووره)یان پێدەگووت، دایکم هەمیشە نارازی بوو، دەیگووت دەبێ بچێتە مەکتەبێ بخوێنێت. خزمەکانی سلێمانی، مسیربوون لەسەر ئەوەی دەبێ لە سلێمانی بخوێنم. لەبنگرد مەکتەب هەبوو، بەڵام خەڵك زۆر تابعی مەکتەب نەبوون، لەبەرئەوە لەوێ خوێندم، خوێندنی مەلایەتییان پێ باشتربوو، وە دووبارە ئیش و کاری زراعەت، شوانی و سەپانی و ئەو جۆرە شتانەیان پێ باشتر بوو، زۆر ڕەغبەتی خوێندن نەبوو، لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی، بەتەواوی نازانم ساڵەکە چەندبووە، کە چووم بۆ مەکتەب، بەڵام لەدەوری (١٩٤٥) بوو چوومە قوتابخانە، بەناوی قوتابخانەی بنگردی سەرەتایی، لە دەڤەری مەرگەی، تەنها ئەو قوتابخانەیە کرابۆوە، بنگرد ناحیەبوو، هەتا زۆر تەلەبەی دێهاتەکان زۆریان دەهاتن، بەیانیان زوو دەهاتن، یەکێك لە تەلەبەکان ئاغای قەرەنی ئاغای واتێ[٢]، هەموو بەیانیان بەسواری وڵاغ دەهات، پیاوێکی لەگەڵدابوو، مەکتەب تەواو دەبوو دەیبردەوە، ئێستا ماوەو زۆرجار دەیبینم، لە مەرگەوە نزیك بوو، زۆریان بەپێ دەهاتن،

---

١- حکومەتی عێراقی لەسەردەمی پاشایەتی بەڕێکەوتن لەگەڵ پشدەرییەکان تەشکیلاتی ئیداری لەپشدەرو مەرگە دەکات، بۆ زانیاری زیاتر لەوبارەیە بڕوانە: بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حەماغای پشدەری، سەرچاوەی پێشوو. (مۆفەق میراودەلی)

٢- ئاغای قەرەنی ئاغا ساڵی (١٩٤٠) لە گوندی واتێ لەدایك بووە، سەرەتا لای محمد فیدا خوێندویەتی، لەلای مەمەند ئاغای فانی گوڵستان و بوستانی خوێندووە، پاشان چۆتە مەکتەب، لە شارۆچکەی حاجیاوا لە گەڕەکی ماکۆك نیشتەجێیە. (مۆفەق میراودەلی)

ئەحمەدی مەلا مەحموود دەهات، محەمەدی مەلا صەمەدی دەهات، کوڕێکی دیکە مستەفا دەهات، عەلی میرزا دەهات، کە عەلی میرزا هەتا پۆلی شەشەمی تەواوکرد، ئنجا چوو بۆ سلێمانی، دواتر مامۆستا بوو لەگەڵ خۆمدا. لەو ساڵانە کۆچی دوایی کرد، لێرە لە شاری ڕانیە. کاتێ بنگرد کراوەتە ناحیە، هەوڵی حکومەت وابووە شتێکی لێبکرێتەوە، خەڵکێك هەبووە هەوڵیداوە مەکتەب بکرێتەوە، حکومەت توانای هەبوو مەکتەبێکی کردۆتەوە، لە سنووری ناحیەکە، کە (٥٢) گوندبوو، هەموو کەس نەیدەتوانی بێت و بخوێنێت. ساڵی (١٩٥٢) لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی لەوێ دەرچووم، هەموو ساڵەکانی خوێندن یەکەم بووم، لە پۆلی یەکەمی سەرەتایی هەتا پۆلی شەش، هەموو ساڵەکان یەکەم بووم، لە پۆلی شەش ساڵێك نەمخوێند، دایکم دڵی نەدەهات، دەیگوت نابێت لێم دووربکەوێتەوە، بۆ خۆشم هەر هۆگری دایکم بووم، ئیش و کاری زراعەتم دەکرد، لەبەرئەوەی لە منداڵییەوە بابم نەمابوو، خۆم و دایکم چالاك بووین، لە ئیش و کاری زراعەتدا، لە ئەرزو جووت و ئەو شتانەدا، هەموو ئیش و کارەکانی خۆمان دەکرد، هەندێ ماڵات و حەیواناتن هەبوو[1]، هەمیشە دەربەستی کەس نەبووم، هەربۆیە لە منداڵییەوە چاو لەدەستی خەڵك نەبووم، تا خەڵك یارمەتیم بدات، بەڵکو لە ناحیەی ئەو شتانەوە خەڵك موحتاجی من بووە، من موحتاجی خەڵك نەبووم، خەڵکێك هەبووە، بۆ ئیشکردن داوای یارمەتی کردووە، من درێغیم لەوە نەکردووە، لەبەرئەوە لەنێو شیلانەکانی بنگرد خۆشەویست بووم، منیش هەرچی کارێکم هەبووبێت، کەس صاحێب ماڵ نەبووە.

بۆ تاقیکردنەوەی وەزاری پۆلی شەشەمی سەرەتایی هاتینە قەڵادزێ، لێرە ئیمتحانی وەزاری نەدەدرا، ئەو خانووی (شێخ حەسەن) کە (ئاغاژنە ئایش[2]) مابوو، من لەو خانووەدا ئیمتحانی وەزاریم داوە، دوای ئەوەی لەوێ دەرچووم، ساڵێك نەمخوێند، دواتر خزمەکانی سلێمانی بەدوایاندا ناردم، گوتیان دەبێت بخوێنێت، ناوەندیی لە بنگردو لە قەڵادزێ و ڕانیە نەبوو، وابزانم لە کۆیەو سلێمانی و هەولێر هەبوو، ساڵی (١٩٥٣) بۆ خوێندنی ناوەندیی چوومە سلێمانی، یەك ئامادەیی هەبوو، پۆلی سێ هەتا پێنج، دیارە شەش نەبوو، پێنج، ئاخر قۆناغی ئامادەیی بوو، لەدوای ئەوە پلەیەك زیادکرا، پۆلی شەش بوو، ناوەندییەکی کچان لەناوچەی شێخان هەبوو، لە هەموو ئامادەیی سلێمانی، ئێستا سلێمانی پالاس لەکوێیە، کە پێیاندەگووت حەسیب صالح، لەودیوو حەسیب

---

١ – حەیوانن هەبوو: حەیواناتمان هەبوو. ئەو (ن)ـە، لە ئاخاوتنی بنزاری هێندێك سنووری وەك پشدەر و موکریان و هەولێر، ڕۆڵی (مان)ی جێناوی لکێندراوی کەسی سێیەمی کۆ دەبینێت. (ئامادەکاران)

٢– ئاغاژنە ئایش: عائشە بایز خدر، دایکی خدری سەلیماغا، لە ساڵی ١٩٩١ لە هەولێر لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

ساڵح، ئێستاش شوێنی ماوە، ناویان نابوو قوتابخانەی سیروان، تازە یەك نووجار ەوێدا چووم، یادگارەکانم دێتەوە بیر، لە سلێمانی چووم لەو مەکتەبە خوێندم، بەشی ێوخۆیی برادەرانی بەری مەرگەو پشدەرو ڕانیە و هەموو قەزاکانی دیکە، هەچکەسێك کە هاتبۆ سلێمانی دەیخوێند، قسمی داخلیان بۆ کرابۆوە، ئەو کاتە هەر دەبوو بڵێی قسمی داخلی، چونکە خوێندن ئەو کاتە هەر بەعەرەبی بوو، ئەوەی لەبارەی مەکتەب بیرمە، مامۆستا (کەماڵە سووسە) خەڵکی سلێمانی بوو، مدیری پەیمانگابوو، مامۆستای ئینگلیزی بوو، (کەمال محەمەد ئەمین)یان پێدەگووت. کۆمەڵێك مامۆستای میسری هەبوون، لە ناوەندی، مامۆستایەکی تەواو ئینگلیز هەبوو، ناوی جۆزیف بوو، لە لەندەنەوە هاتبوو، ئینگلیزی دەگوتەوە، تەنها ئینگلیزی دەزانی، ئینگلیزی هەمووومان باش بوو، کە ئەو دوو سێ ساڵە ئەو پیاوە پێی گوتین، بەڵام لە ئەنجامدا لەبیرمان چۆوە، زۆرمان گوێ پێ نەدا. چووینە خانەی مامۆستایانی سلێمانی، لە ساڵی (١٩٥٨) چوومە خانەی مامۆستایانی سلێمانی، هەر سێ ساڵی ناوەندیم لە سلێمانی تەواوکرد، لەوێ تووشی هەندێ ئەفکاری چەپ بووم، یەکێتی قوتابیانی عێراق، ڕێکخراوێکی سەر بە حیزبی شیوعی بوو. بۆ ساڵی دووەم کە چوومە سلێمانی بوومە ئەندام، تاوەکو ساڵی (١٩٥٨) کە شۆڕشەکەی (عبدالکریم قاسم) سەریهەڵدا، من چوومە خانەی مامۆستایانی سلێمانی، لەوێ لەو فکرە گەڕامەوە، سەبارەت بە چی گەڕامەوە؟ دیارە کە ناوەندیم لە سلێمانی تەواوکرد، خانەی مامۆستایانی سلێمانیم هەر لەوێ تەواوکرد، وابزانم لە مەرسوومی عبدالکریم قاسمدا، ماددەیەکی تێدابوو، دەڵێ: «العراق جزء من الامة العربية» برادەرانی شیوعی هەموو تائیدی ئەم بەیانەیان کرد، هەرچەند دەیگوت «ان العرب و الاكراد شركتان في هذا الوطن» ئێمە کەوتینە سەر باوەڕێك، ئێمە دەبێ عەرەب بین، چونکە کە ئێمە شەریك بین لە عێراق و عێراقیش عەرەبی بێت، کەوابوو عەرەبین، ئەوەمان بۆ هەزم نەکرا، گووتمان دەبێ بۆ کوردیش شتێکی ئاوا هەبێت، سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی کوردیش بوو، لە ساڵی (١٩٦١) و ئەوانە، لە کۆتاییدا ئێمە کۆمەڵێك لەو ڕێکخراوەو حیزبە هاتینە دەرێ، ئەوەی لەبیرم بێت کە لەگەڵم بوو، عەلی میرزا، کاکەسوار، ئەوانەی قەڵادزێ ساڵح حەمە عەلی و کۆمەڵێك لەو برادەرانەبووین، زۆر کەسی تریش کشایەوە، تەئیدی ئەو هەنگاوەی عبدالکریم قاسم نەکرا، لەوێ مامەوە ئەوکاتەی نزاعێکی قورس لە بەینی پارتی و شیوعیدا هەبوو، لە قوتابخانەکاندا دائیم گێرەو کێشە هەبوو، ئەو مامۆستایەی زۆر منی هاندا، لە دیوانی عەلی بەردەشانیدا ئیشارەتم پێداوە، مامۆستا (عەبدوڵا زێباری) مامۆستای ئەدەبی عەرەبی بوو، دەرچووی زانکۆی ئەزهەر بوو، لە

خانەی مامۆستایان، کاریگەریی زۆری لەسەر من دانا، لەلایەن زۆرکەس ئەو مامۆستایە ئیهانە دەکرا، چونکە هەمیشە دیفاعی لە کورد دەکرد، هەتا زۆرجار مناقەشەن لەسەر شیعری کوردی و عەرەبی دەکرد، ڕۆژێك گوتی زیاد تۆ ئەو هەموو شیعرە کوردیانە لە کوێ فێربوویت؟ منیش پێم گوت: مامۆستا پێم بڵێ تۆش ئەو هەموو شیعرە عەرەبیانە لەکوێ فێربوویت؟ گوتی ئاخر ڕۆڵە من دەرچووی زانکۆی ئەزهەرم، ئیش و پسپۆڕیم ئەوەیە، منیش گوتم مامۆستا منیش دەرچووی ئەو کۆڵانانەی سلێمانیم، هەمیشە لەگەڵ شیعرەکانی شاعیرانی پیرەمێردو ئەوانەم، ئەو کاتە زۆر لەژێر کاریگەریی شیعرەکانی حەمدی دابووم، منیش گوتم لەم کۆڵانانەی سلێمانی فێری ئەو شیعرانە بووم، زۆری پێخۆش بوو، هەتا پێشبینی ئەوەی بۆ کردم، گوتی چیت لەبەرە زۆرت پێ خۆش بێت، گوتم (ئەحمەدی موختار جاف)، گوتی چی هەیە، گوتم:

دێتە گوێم بەگوێ لە جێی سۆزو شیوەن و گریانەوە
ناڵەی دڵە لە حەزو خاکی کوردستانەوە

ئەحمەد موختار، زۆر باس لە پێشبینی دەکات، هەتا ڕۆژێك دێت لەئاخردا بۆ کورد، لەپێشەوە نەگبەتی میللەتی کورد دەست پێدەکات، کورد چەند زەلیلە، لە ئاخریدا هەڵدەستێ دەڵێ:

ئەمرۆ باوابێ بەڵام ڕۆژێ دێ ئەولادی کورد بە عیلم و صەنعەت و عیرفانەوە
نەوجەوانانی وەتەن تەوحید دەکەن عەقرەو زاخۆ دەبەستن بە قەد بۆتانەوە
پاش قڕانی دوژمنان دەست پێدەکەن تەعبیری منقعی ئاسن دەچێتە شاخی هەورامانەوە

من پێم وایە ئێستا وردە وردە ئەو شتە دێتەدی، زۆری پێ خۆش بوو، ئەوەش لەسەر ئەوە هات، شیعرێکی عەرەبی هەیە بە غەزەلی ناخۆشی دەست پێدەکات، لەدوایە هەستانەوە دەست پێدەکات، منیش گوتم مامۆستا کوردیش لەوبارەی یەکجار زۆری هەیە، خۆ هەر عەرەب گوتی هەتە؟ ئەوەی ئەحمەد موختار جافم بۆ گوت زۆری پێخۆش بوو، بۆیە تەقریبەن وەکو مامۆستاو تەلەبایەتی لێنەهاتبوو، ئێمە بووین بە رەفیق.

مامۆستایەکی دیکەم ناوی (جەمال غەفور) بوو، پێیان دەگووت جەمالی غەفوورە کۆڵی، ڕۆژێك ئاوا بەر هەتاو بوو کتێبێکم بەدەستەوەبوو دەمخوێندەوە، گوتی: زیاد،

گوتم: بەڵێ مامۆستا، گوتی: با یەك شتت پێ بڵێم: لە زهنی خۆت لێکی بدەوە. گوتم: بەڵێ مامۆستا، گوتی: «ان القومیة اسمی مشاعر البشر» واتا «نەتەوایەتی بەرزترین هەستی مرۆڤە»، بە عەرەبی گوتی، منیش زۆرم لێکدایەوەو زۆر کاری تێکردم. من پێم وایە ئەوە ڕێرەوی منی هەر یەکجاری گۆڕی، لە ئینسانێکی ئەوپەڕی جۆرێکەوە بۆ ئەوپەڕی جۆرێکی کەی هێنام، ئەوەش بوو بووم بە ئەندامی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بەخەستیش!

ماوەی سێ ساڵ لە سلێمانی بۆ خانەی مامۆستایان مامەوە، بەسەرکەوتووی بڕوانامەم وەرگرت. لە بەرواری (٢٥/١٠/١٩٦١) یەکەمجار چوومە (کانی توو) موباشەرەم کرد، ئەو کاتەی لە سلێمانی بووم، لەگەڵ زۆربەی برادەرەکان سەروکارم هەبوو، پیاوێك هەبوو کۆچی دوایی کرد، (ئەمینی حاجی عارف)، ئێستاش برادەرم هەن، (جەلالی مینە) ماوەیەکە نەمبینیوە، کاك (ئەنوەری حاجی ساڵح)، (مەحموودی زێوەرە فەندی)، مەحموود زێوەر ئەوانەی لە سیاسەتدا من زۆر نزیکیان بووم، پیاوێك هەبوو سمکۆیان پێدەگووت، وابزانم دوایە بوو بە محامی، (عەلی بۆسکانی) بەڕەحمەت بێت، شەهید کرا، هەم وەکو خزمایەتی لەگەڵ خزمانی سلێمانی دۆستایەتیم لەگەڵ هەبوو، ڕێنمایی دەکرد، وە کاك ئەکرەم، (ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە)، زۆر ئاگاداری ژیانی من بوو، وە دەربەستی نوقسانیەکانم بوو، ئەگەر نوقسانیەکم هەبێت، ئەو بۆمی جێبەجێ بکات، لەوێ لەگەڵ ئەوانەدا دۆستایەتیم هەبوو، جاربەجار سەردانی ڕۆژنامەی (ژین)م دەکرد، خۆم ڕۆژنامەی ژینم هەبوو، هەفتانە دەردەچوو دەمخوێندەوە، ڕۆژنامەکانی دیکەی لە عێراق دەردەچوون وەکو (صوت العرب، صوت الاهالی، الاستقلال)، کۆمەڵێك لەو شتانە هەبوون، ئیدی کەسێك بووم زەوقم بە خوێندنەوە دەهات، ئەوەندەی لە قسمی داخلی نەبووم، ڕۆژانە دەچووم کوڕەکانی ئەوان مەسەلەن ڕۆژانە دەچوومە لای کوڕەکانی خزمان، کاکە عەزیزو فوئادو ئەوانی دیکە، هەر شەش ساڵەکەی ناوەندیی و خانەی مامۆستایان لە بەشی ناوخۆیی بووم، ساڵێك لەوێ نەمخوێند، تووشی ئەفکارێ بووم، ئیمتحانم بەلاوە شتێکی ئەوتۆ نەبوو، لە قۆناغی دووەمی ناوەندیی بوو.

ساڵی (١٩٦١) بۆ تطبیقات هاتمەوە بنکرد، لەوێ بیکەم، بۆ ماوەی یەك مانگ دەرست دەگوتەوە، دەبوو مدیری مەکتەبەکە ڕاپۆرتێکت لەسەر بنووسێت، کە موئەهەلە، ببێت بە مامۆستاو نمرەت بۆ دابنێت، کە هاتمە ئەوێ، کاك عەبدولقادر هەیە، ئێستا لە قەڵادزێ لە (بەردبەرد)و (وەستا سێمان)، ماڵەکەی لە پشتی قەڵادزێ یە، ئەو پێی گوتم ئەگەر تەعین بووی دەبێ نەچیتە ئەولاو ئەولا، بێیت بۆ (کانی توو) بۆ لای من، ئەو موزەمیدی

خەستەخانەکەی کانی توو بوو، دەبێ بێیت و کۆمەڵێ برادەری خۆشمان لەوێیە، منیش یەکسەر داوای کانی تووم کرد، بۆیان کردم بۆ کانی توو، نەقڵی کانی توو بووم، کا عەبدولقادر نەیهێشت بچم بۆ هیچ شوێنێك، لە (١٩٦١/١٠/٢٥) لەوێ بووم هەتا مانگی (٥)ی (١٩٦٢)، مامۆستاکان، ئەو کاتەی چووم، مامۆستاکانی کانی توو، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە خوالێخۆشبوو محەمەدی حەمە ساڵح خزم و برادەرم بوو، دوو ساڵ پێش من لەوێ بوو، (مەلا حەسەنی مەرگەی) ئەوکاتە عومەر عەلی[1] خولی بۆ کۆمەڵێك مەلا کردەوەو دایمەزراندن، بابەکری سەلیمی حاجی ئاغای گەرمکان، ئەویش لە دار المعلمین بەیەکەوە تەلەبە بووین، ئەویش داوای کانی تووی کرد، هات.

شۆڕش دەستی پێکرد، حکومەت لەوێ دەسەڵاتی نەما پاش ساڵێك گەڕامەوە بۆ قەڵادزێ، لە قوتابخانەی پشدەر دەست بەکاربوومەوە، ساڵی (١٩٦٢-١٩٦٣) لە خانووی (حەمەی حاجی برایم باوزی)دابوو، پاش یەك ساڵ لەوێوە گوازرامەوە، بۆ قوتابخانەیەکی دیکە لە قەڵادزێ ناوی (قەندیل) بوو، لە خانووی ڕەسوڵی حەسەن ئاغادا بوو[2]، ساڵی دواتر گوازرامەوە بۆ (قوتابخانەی ئاسۆس)، تاوەکو ساڵی (١٩٦٤)، قوتابخانە تەواو نەببوو کاتی تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ گیرام، حکومەت کۆمەڵێکی گرتن و گواستنیەوە بۆ خوارووی عێراق، بیانووی حکومەت ئەوەبوو ئەوانە مەرغوب نین و نابێت لە کوردستان بن، ئەوانەش من و مامۆستا عەلی میرزا، مامۆستا عەباس تۆفیق گورجی، شێخ مەجید کاتب ناحیە بوو، تەهای حەمە سەعید موزەمید، عەبدوڵڵای سۆفی حەمیدی لە بەداله بوو، ئەحەی لالە مین هەبوو لە ئینحسار خەڵکی سلێمانی بوو، بەفێڵ بانگ کرام، ڕۆژی هەینی بوو گوتیان قائمقام لە سەرا کاری پێتە.

بە وەزیفەوە گوازرامەوە بۆ جنووب، تەها بۆ خەستەخانە کەوتە ناسریە شوێنەکە ناوی (سوق الشیوخ) بوو، من و مامۆستا عەلی میرزا بەر عەممارە کەوتین لەوێش نەیانهێشت لە داخل بین، بۆ لادێکانیان ناردین، ساڵمان تەواو نەکرد، ئەو ساڵە ئەوەندە نەفی کورد زۆر بوو، ئەحەی لالە مین بۆ بەغدا نەفی کرا، شوێنەکەی زۆر باش بوو، کە

---

١ - عومەر عەلی: مەبەستی لە پارێزگاری ئەو کاتەی سلێمانییە.

٢- ڕەسوڵ حەسەن سێمان ئاغا، لە بەرواری (١٩٢٢/٧/١) لە دێ ی کەڵەکان لەبناری چیای ئاسۆس لە پشدەر لەدایك بووە، یەکێکە لەکەسایەتییەکانی عەشیرەتی میراودەلی، ڕەسوڵ ئاغا لەخولی پازدەهەمی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بە نوێنەرایەتی لیوای سلێمانی بۆتە ئەندامی ئەنجومەن (١٦ی ئەیلوولی ١٩٥٤ تا ٢٧ی ئازاری ١٩٥٨)، لەبەرواری (٢٠١٧/٢/٢٢) کۆچی دوایی کردووە.

بڕوانە: مۆفەق میراودەلی، نوێنەرانی پشدەر لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق دا سەردەمی پاشایەتی (١٩٤٣-١٩٥٨)، (دەستنووس).

چووم فەوزی ڕەشید نامیق خەڵکی سلێمانی بوو، ئەویش بۆ پارێزگای عەممارە نەفی کرابوو، چووین پەیوەندین بە ئەوەوە کرد، مامۆستا عەلی میرزا لە (قەزای نیمونە) لە ڕێگای بەسرە، من دەبوو بە ماتۆڕی ئاوی بڕۆم بۆ ناحیەیەکە ناوە ڕەسمیەکەی سلام بوو، بەڵام پێیان دەگوت (توێڵ)، لەوێ دژایەتی دەکرام، بەڵام بێ دەربەست و بێ دەسەڵات بووم، مەسەلەن کە چوومە قوتابخانەکە، عەلی میرزام لەگەڵ بوو، سەلامیمان کرد زۆر بەساردی قسەیان لەگەڵ کردین، شتێکیان نەگوت پیاو دڵت خۆش بێت، گوتم عەلی من لێرە تووشی گێچەڵێك دەبم، ناوی مودیرەکە (راوی شڵتاخ) بوو بە چاوێکی حاقید سەیری دەکردم، کاتێ ئەمرەکەم دایە، سەری هەڵبڕی گوتی ئوستاز لەسەرچی گەیشتوویتە ئێرە، ئەوکاتە زۆر بەتوندی وەڵامم دایەوە، عەرەبیم باش دەزانی، بە ئەنقەست ئێستا لە بیر خۆم بردۆتەوە، گوتم: مامۆستا جەنابت مدیر مەکتەبی یان لە ئەمن ئیش دەکەیت؟ ئەگەر لە ئەمن ئیش دەکەیت، ڕۆژانە دەچمە عەممارە لە ئەمن ئیمزا دەکەم! چەند جار شتی لەسەر نووسیم بەڵام کاك فەوزی یاریدەی دەدام. لە تەربیە لە بەشی خۆیەتی کوڕێکی لێبوو، ناوی محەمەد بوو، کوردی نەدەزانی گوتی: من ئەسڵم کوردە خەڵکی سلێمانیم، بابم بە پۆلیسی هاتۆتە ئێرە، لێرە ژنی هێناوە من لێرە لە دایك بووم، گوتی من لە تایفەی ئەمینی لاوەم، زۆر باش بوو نهێنیەکانی کە هەفتانە لەسەرن دەنوسرا هەمووی پێدەگووتم، ڕۆژێ گوتم لەسەر چی ئێمە گوازراوینەوە، گوتی زۆر نهێنییە بەڵام پێتان دەڵێم، سەیری مەلەفەکی کرد، گووتی دەڵێن ئەمانە مەرغووب نین لە شیمالی حەبیب بمێننەوە، دەبێت بۆ خواروی عێراق بگوازرێنەوە، ئێوە لەسەر ئەوە لێرەن، (١٩٦٤-١٩٦٥)، پاییزێ چووم و بەهارێ گەڕامەوە، هەردوو حیزبی کوردی جەلالی و مەلالی بۆ مفاوەزات لەوێ بوون، حکومەت هەریەکەی لە ئوتێل دانابوون و مفاوەزەی لەگەڵ دەکردن، کوڕێکی سلێمانی ناوی (زیادی حاجی مەجیدی میسری) بوو، هات بۆ لام پێشتر پەیوەندیمان هەبوو، گوتی ئێوە دەگەڕێنەوەو دەبێت لەسەر حیسابی ئێمە کە پێیان دەگوت جەلالیەت، دەبێت لەسەر ئەو حیسابە بگەڕێنەوە، کاتی ئەمر گەڕانەوەم دەرچوو، چوومە پەروەردەی سلێمانی ئەو کاتە بەڕێوەبەری پەروەردە پیاوێکی ڕێکو پێك و نیشتمانپەروەرو بە ویژدان موسا سەمەد هەولێری بوو، داوای کرد بچمە ناحیەی سیروان، ڕەزامەند نەبووم، سوور بووم لەسەر هاتنەوەم بۆ پشدەر، بانگی پیاوێکی کرد، ناوی مەحموود تۆفیق بوو ئەو ناردمیەوە بۆ قوتابخانەی ئاسۆس، تازە ژنم هێنابوو[1] کە نەفی جنووب کرام، ئەوم ناردەوە بۆ ماڵی باوکی و خۆشم چوومە

---

١- مامۆستا زیاد لەبەرواری (١٩٦٥/٣/٢٠) لەگەڵ خاتوو (ناسکە حەسەن جەلال) ژیانی هاوسەرێتی

جنووب، که هاتمەوە بەتەواوی ژیانم بە پشدەر پەیوەند بوو، یەك بینا بوو دوو مەکتەبی تیدا بوو، پشدەرو ئاسۆس، ژیانی مامۆستایەتیم لە (١٩٦٢-١٩٨٩) هەر لە پشدەر بوو، تا ئەو کاتەی پشدەر ڕاگوێزرا.

ساڵی (١٩٦٣) لە سلێمانی ئەو کاتە مامۆستا بووم، لە مەکتەبی پیرەمەگروونی ئێواران بووم، لەگەڵ کۆمەڵێك برادەری خۆمان فەرمانی گرتنم بۆ دەرچوو، بە تۆمەتی ئەوەی لەگەڵ پێشمەرگەو کوردایەتی تێکەڵاوین، دادوەر ناوی بەکر و خەڵکی کۆیە بوو، پیاوێکی بە ویژدان بوو، بەدزییەوە هاوکاری خەڵکی دەکرد، هەواڵی ناردبوو کە پێی بڵێن دەگیرێت، یا بڕوات یان خۆی کەنار بکات، من و (کاکە سوار) و (ساڵح حەمە عەلی) و (سەید عەلی) و (سەلیمی حاجی ڕەسوی) و کۆمەڵێك لە سلێمانی دەرچووین، هەر چوار دەوری سلێمانی گیرابوو، بەڵام یەکی دینارێك بەرتیلمان بە ئەفسەری سەیتەرەکەدا.

بەکورتی لە بواری پەروەردە، مامۆستایەتی من لەم شوێنانە بووە: (کانی توو، قەڵادزێ، سلێمانی، عەممارە، هەولێر، دواجار پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی ڕانیە). تێکەڵاوبوونم لەگەڵ دنیای سیاسەت، ساڵی (١٩٦٢) ئەو کاتە عبدالله ی مام ئەحمەد بەپرسی ناوچە بوو، ئەو ساڵە بوومە ئەندامێکی پارتی چالاك، ئەو کاتە حیزب پارتی و شیوعی هەبوون، ساڵی (١٩٦٥) لەسەر کێشەیەك کە لەگەڵ کەسێکم هەبوو، لەنێو پارتی وازم لە پارتی هێناو ڕووم لە جەلالیەت کرد، تا ئێستاش خۆم لەو بەرەیە بینیوەتەوە.

بواری خوێندنەوەو ڕۆشنبیری و نووسین، لە بنچینەدا بنەمایەکی خوێندنەوەو ڕۆشنبیریم هەبوو، بەتایبەت لە سلێمانی زۆر گەشەی کرد، کە شیعری شاعیرانم دەخوێندەوە، لە حەفتاکان بە نووسینی شیعر دەستم پێکرد، بابەتێکم لەسەر ژنێکی کورد نووسی بەناوی (ئایشە گوڵێ[1]، کە داستانی ژنێکی کوردە باسی قارەمانیەتی پیاوەکەی دەکات، لە بەیتبێژ (سەلیمی بایزی)یم بیستیبوو لەسەر ئەوەم نووسی، غەریب پشدەری بۆ ڕۆژنامەی هاوکاری ناردبوو، ڕۆژنامەکە گرنگی پێدابوو بڵاوکرایەوە، دواتر بەردەوام بووم و لە بواری فۆلکلۆر خۆم بینییەوە، لە ساڵی (١٩٨٣)ـەوە بەردەوام زانیاری لە دەفتەری ڕۆژانەدا تۆمار دەکەم، چەند کەشکۆڵێکم هەیە یەکەمیان (چوزە بیزا)یە.

لە شۆڕشی ئەیلوول، حەزم لە چوونی ئێران نەبوو، من لە قەڵادزێ مامەوە، بەڵام

---

پێکهێناوە، خاوەنی دوو کوڕو چوار کچە، بەناوەکانی (تاریق، هێمن، ئەرخەوان، نیشتیمان، سروە، ژوان).

١- دوای سۆراغ و بەدواداچوون، دەرکەوت ئەم وتارە لە هاوکاری بڵاونەکراوەتەوە، بەڵکو لە پاشکۆی عێراق، ژ٥٣، کانوونی یەکەمی ١٩٨٤، ل١٤، دایە. (مۆفەق میراودەلی).

پایزی ئەو ساڵە حکومەت بۆردومانی قەڵادزێ ی کردو خانووم بەسەردا ڕووخاو بەرکەوتم. لە کونەتەیارەدا بووم منداڵەکانیش بە زەحمەت ڕزگاریان بوو، هاتینە دەرەوەو ڕۆیشتین بۆ ئێران، هێمنی کوڕم[1] بریندار بوو، چووینە (کانییە ڕەش) نزیك گوندی (بێوران) ماوەیەك ماینەوە، پاشان گوازراینەوە بۆ ناوچەی کرماشان، کۆمەڵێك برادەر داوایان کرد بمێنمەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئێران ئەوەی لە ئێمە کرد، بە جێمهێشت، ساڵێك زستانەکەی لەوێ بووین پاشان هاتمەوە سلێمانی، ماوەی چەند مانگێك مامەوە پاشان گەڕاندیانمەوە سەر وەزیفە، پاشان گەڕامەوە بۆ قەڵادزێ لەوێ مامەوە.

ساڵی (١٩٧٦) بوومە ئەندامی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)، لە سەردەمی شاخ تاکە ڕۆژێك پەیوەندیم لە گەڵیان نەپچراوە، بە نهێنی بۆ گوندەکانی (چنارنە)و (ئاوەژێ) و (ناوزەنگ) و (سێروان) و (کانی توو) دەچووم، زۆرجار بەشەو مامەوە. کاتی خۆپیشاندانەکانی (١٩٨٢) من نزیکی (محەمەد سوڵتان) بووم، گوتی زۆر مەیە نێو کۆڕو خۆت ئاشکرا مەکە، ئەو ڕۆژە قوتابیەکانم ناردنەوەو بەتەنها لە قوتابخانە مامەوە، تا ئێستاش چەکی ئەو کاتەی شۆڕشم ماوە.

کاتی ڕاگواستنی قەڵادزێ و پشدەر لە حوزەیرانی (١٩٨٩)، لە سلێمانی گیرسامەوە، بەڵام لە سلێمانی زۆر نارەحەت بووم، ماوەی دوو مانگ لە سلێمانی بووم، لەسەر بڕیاری حیزبی ویستمماڵم بۆ هەولێر بگوازمەوە، چەند جار هەوڵم دا نەیانکرد، ڕۆژی بەڕێوەبەری پەروەردە بانگی کردین و قسەی کرد، گوتی ئەو مامۆستایانەی بەر ڕاگواستن کەوتوون، ئارەزووی خۆیانە لە کوێ دەوام دەکەن، ناوی خۆم بۆ هەولێر نووسی، پاشی ٣-٤ ڕۆژی ناوم دەرچوو، ماڵەکەم بارکرد، کرێی بارکردن و گواستنەوەی ماڵ ڕێکخستن دابینی کرد (٢٠٠) دینار بوو، لە ئۆردوگای دارەتوو[2] بوومە مامۆستا، تاوەکو ساڵی (١٩٩١)، ماوەیەك لە مەڵبەندی شەقڵاوە[3] بووم، لە ٣١ی ئابی (١٩٩٦) لە ئاسایشی هەولێر گیرام، کاتێك هەولێر گیرا، ڕێگەی دەرچوونم لێگیرا، هەفتەیەك مامەوەو دواتر ئازادکرام، ئاسایش زۆر مەترسیداربوو، ئەندامی مەڵبەند بووم، دواتر هاتمە مەڵبەندی ڕانیە، تا (٢٠٠٦) ئەندامی مەڵبەند بووم، لەگەڵ کرانەوەی پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایان، لەوێ وانەم دەگوتەوە، تا ئەو کاتەی لە ساڵی (٢٠٠٦) خانەنشین بووم، دوای ئەوە زیاتر دەستم بە

١- هێمن زیاد محمد ئەمین لەبەرواری (١٩٧٣/١٠/١) لەدایك بووە.

٢- ئۆردوگای دارەتوو، یەکێك بوو لە ئۆردوگا زۆرەملێکان ڕژێمی بەعس ژمارەیەکی زۆری خەڵکی پشدەری لە ساڵی (١٩٨٩) بۆ ڕاگواست، تا ئێستاش بەشێك لەو هاوڵاتیانە لەو ئۆردوگایە نیشتەجێن.

٣ - مەبەستی لە مەڵبەندی ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستانە، کە لە هەموو شار و شارۆچکەکان مەڵبەند هەبوو. (ئامادەکاران)

کاری نووسینی کتێب کرد، پەیوەندیم بە ئەنستیتیوتی کوردەوە کرد.

کتێبخانەم هەیە، دوو سێ جار نەگبەتی ڕاگواستن و هەڵاتن و ماڵ بەجێهێشتن نەگبەتیان زۆر بەسەردا هاتووە، فەوتاون و نوێم کردوونەوە، زمانی کوردی و عەرەبی دەزانم، کەمێك ئینگلیزیش، بەڵام لە بیر خۆمم بردەوە. لە بواری ئەدەبیات حەمدی ساحێبقران کاریگەریی زۆری لەسەرم داناوە، هەروەها شاعیرانی کورد پیرەمێردو مەحوی و سالم. یەکەم شت کاریگەری زۆری تێکردم کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی – عەلادین سوجادی) بوو. لە بواری نووسینی ڕۆژنامەوانی، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی (هاوکاری، بەیان، کاروان، ڕۆژی کوردستان، شتیکی کوردو عەرەبی دەردەچوو، ڕوانین، پشدەر[1] بابەتم بڵاکردۆتەوە[2].

---

١– جگە لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە مامۆستا زیاد باسی کردوون، مامۆستا لە گۆڤاری ڕانیەش بابەتی بڵاوکردۆتەوە، کە لەبەشی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەووردی ئاماژەم پێداوە. (ئامادەکاران).

٢ – چاوپێکەوتنی دەنگی و ڕەنگی مامۆستا زیاد محەمەد ئەمین، ڕانیە، گەڕەکی ئازادی دوو (کاروخ)، ماڵی مامۆستا زیاد، دووشەممە، پێش نیوەڕۆ، (٢٠١٤/١٢/١).

## مامۆستا زیاد[1]
## دیداری: محەممەد مەردان

**پرسیار/ کورتەیەك لە ژیانی خۆت باس بکەیت؟**

وەڵام/ ناوم (زیاد محەممەد ئەمین)ـە. لە ناحیەی بنگرد لە ١٩٣٨/٧/١ هاتوومەتە دنیاوە. هەر شەشساڵی خوێندنی قۆناغی سەرەتایی بە یەکەم دەرچووم... خزمانی ماڵی باوکم کە لە سلێمانی بوون، داوایان کرد کە بچم لە شار خوێندن تەواوبکەم، ئەوە بوو دایکم ناردمی و قۆناغی ناوەندی و پەیمانگای مامۆستایانم تەواوکرد و ساڵی ١٩٦٠ ـ ١٩٦١ لە گوندی (کانی توو) بوومە مامۆستا...

**پرسیار/ مامۆستا ئێوە لە بنگرد بوون، چی گواستنیەوە بۆ ڕانیە و قەڵادزێ؟**

وەڵام/ لە بنگرد بە وەزیفە نەقڵی قەڵادزێ بووم، کە قەڵادزێش لە حوزەیرانی ١٩٨٩ ڕاگواسترا بۆ ئۆردوگاکانی باینجانە و خەبات و تۆبزاوا، چووینە سلێمانی...

**پرسیار/ ژیان لە کانی توو چۆن بوو؟**

وەڵام/ کانی توو، دێیەکی فێنك و ناوچەیەکی کوێستانیی خۆشە، باخێکی زۆری تێدایە، ئاوەکەی بە ڕادەیەك ساردە کە ناتوانی سەردانی نەکەی... خەڵکی ئەو ناوچەیە، بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە ژیانی خۆیان و خێزانیان بەڕێوە بردووە...

**پرسیار/ مامۆستا خۆتان لە بنەڕەتدا خەڵکی سلێمانین، بۆ چوونەتە ناوچەی پشدەر؟**

وەڵام/ ئەوە باسی زۆر لەسەرە، بەکورتی بۆت باس دەکەم: باپیرم لە بنەڕەتدا خەڵکی سلێمانییە و (قەڵاچوالانی)ین و لە دیاربەکرەوە هاتوین بۆ قەڵاچوالان... باوکم برای ساڵحی ڕەشەی سلێمانی بووە و ناوی ئەحمەد بووە، کاك ئەکرەمی خاوەنی کتێبی شاری سلێمانی، کوڕی کاك مەحموودی کوڕی ساڵحی کوڕی ڕەشەیە. باپیری من بە کارێکی میری سەردەمی عوسمانی چووە بۆ مەرگە و بنگرد، بەڕێکەوت فیشەکێکی لەدەست دەردەچێت پیاوێك بریندار دەکات، ئینجا سوڵحییان بۆ کردووە و ئیتر هەر لەوێ ماوەتەوە نەهاتووەتەوە بۆ سلێمانی و باوکیشم هەر لەوێ ژنی هێناوە...

---

١ ئەم چاوپێکەوتنە، ڕۆژی یەکشەممە ٢٠١٥/٢/٨ لە تەلاری ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد لە شاری سلێمانی، لەلایەن (محەممەد مەردان)ـەوە ئەنجامدراوە. دواتر ساڵی ٢٠١٧ لەگەڵ ٢٤ دیداری دیکەدا، کە هەموویان دیداری کەسایەتی فۆلکلۆرین و بە ناوی (٢٥ فۆلکلۆریست) و وەك پرۆژەی ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد، بەچاپ گەیشت.

**پرسیار/ ئاماژەت بەوە کرد کە لە دیاریەکرەوە هاتوون؟**

وەڵام/ کاتی خۆی کە کوردستان هەمووی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا بووە و بە کەیفی خۆیان خەڵکیان نەفی کردووە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر...

**پرسیار/ لە ساڵی چەندەوە دەستت بە نووسین کردووە؟**

وەڵام/ من هەر لە گەنجیەوە خەریکی کۆکردنەوەی شیعرەکانی (عەلی بەردەشانی) بووم. هەر لە گوندەکەی خۆم شەوانە گەنج و پیرەکان کۆدەبوونەوە و چیرۆکی سەیر سەیریان دەگێڕایەوە، منیش حەزم دەکرد کە بەدوای ئەو چیرۆکخوانانە بگەڕێم و پیاوە بەتەمەنەکانی ئەو گوندە وەك (سۆفی بابەکر، سۆفی خدر و مام بابەکر) ئەمانە چیرۆکی ئەفسانەیی وایان دەگێڕایەوە کە لێی بێزار نەدەبووی... حەزم بەو شتانە بوو کە کۆیان بکەمەوە وەك حەزێکی خۆم دەستم کرد بە نووسینەوەیان، کە ڕێکیان بخەم و لە هەر جێگە و شوێنێك قسەیەك پەندێك بوترایە دەچووم دەمنووسینەوە، ئەگەر بەکەموکوڕیش بوایە هەر وەرمدەگرت.

**پرسیار/ کارەکانتان بناسێنیت؟**

وەڵام/ لە ساڵی ١٩٦٢ ـ ١٩٦٣بیرم لەوە کردەوە کە ئەو پەڕانەی نووسیومن بیانخەمە سەر دەفتەرێك و ڕێکیان بخەمەوە، ئەوە بوو لە قەڵادزێ زۆربەی حەیرانبێژ و لاوکبێژان لە چایخانەکان کاسێتەکانیان لێدەدرا، ئیتر من پەیوەندیم لەگەڵ یەك بەیەکیاندا کرد. ئەوکاتەش من زگورتی بووم و تاقەتم هەبوو، شەوانە هەرجارەی یەکێ لەو حەیرانبێژانەم دەعوەت دەکردە لای خۆم، بۆ نموونە مام یونسێك هەبوو سەرۆکی چاوەشەکانی پشدەر بوو کە لاوکبێژ بوو، دواتر تەسجیل پەیدا بوو منیش بەکارم دەهێنا... لاپەڕەی نووسینەوەکانم بوون بە دەفتەرێکی چوارسەد لاپەڕەیی، ئێستاش چوار دەفتەر لەو دەستنووسانەم ماوە...

**پرسیار/ زۆر کەس لەسەر عەلی بەردەشانییان نووسیوە، تۆ لێیان ڕازیت؟**

وەڵام/ دەزانم زۆر کەس لەسەری نووسیووە، بەڵام ئەوانەی نووسراون لە دەمی خەڵك وەرگیراون، زۆرتر لە گەنجان و کەسی ئەو ناوچەیەن، بەڵام ئەو کۆکراوەی من لە دەمی گەورەپیاوانی ئەو ناوچەیەوەیە و لە کەسە بەتەمەنەکانەوە وەرگیراون.

**پرسیار/ مامۆستا تۆ لە ٢٠٠٦ دیوانی عەلی بەردەشانیت بڵاوکردەوە، کەچی لە دیوانی دووەم شتی زۆرت بۆ زیادکردووە؟**

وەڵام/ بەڵێ، بڵاوبوونەوەی ئەو دیوانە کاری کردە سەر خەڵکانێك و گەڕانەکەی من هەر لە بنگرد و پشدەر و بیتوێن و مەرگە و ئەو کاسێتانەی وەرمگرتون تا ئێستا هەر ماون و ئەو زیادانەش لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەم بوو کە بۆم هاتوون؟ چونکە من نووسیبووم هەر کەسێك شتێکی هەبێت با بۆم بنێرێت تا لە بەرگی دووەمدا (مەبەستی نووسەر لە چاپی دوومە) بڵاویانکەمەوە کە بەم زووانە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەری ئازیز.

**پرسیار/ ئایا عەلی بەردەشانی پیاوێکی کوێر بووە؟**

وەڵام/ نەخێر، بەڵام چاوی کزبووە، وەك زۆر کەس و زۆر کەس بە عەلیەکوێر یان بە کوێرە بانگیان کردووە. لەو سەردەمەدا هەرکەس گۆرانی بوتایە یان شیعر، خەڵکی بە چاوی سووکەوە سەیری دەکردن، بەڵام عەلی شمشاڵی لێداوە و شایی هەڵپەڕاندووە و گۆرانی وتووە...

**پرسیار/ باس لەوە دەکرێت کە عەلی بەردەشانی جنۆکە بردویەتی، تۆ تا چەند بڕوات پێیەتی؟**

وەڵام/ من خۆم هەرگیز بڕوام بە جنۆکە نییە، دەزانم لە قورئاندا باسی لێوە کراوە...

**پرسیار/ ئایا عەلی بەردەشانی خوێندەوار بووە؟**

وەڵام/ خوێندەوارێکی وا نەبووە، بەڵام لەگەڵ پیاوی بەدەستەڵات دانیشتووە. عەلی بەردەشانی لە بنەماڵەی (شیلانە) بووە و لە سەردەشت زۆر ژیاوە؟ چونکە کاتی خۆی لە سەردەمی ئیبراهیم پاشای بابان، کە حوکمی کردووە، سەردەشت لەسەر کوردستانی ئێرە بووە.

**پرسیار/ مامۆستا تا ئێستا چەند کتێبی چاپکراوت هەیە؟**

وەڵام/ تەنها هەشت کتێبی چاپکراوم هەیە.

**سەرنجێك**

هەركەسێك، دوور و نزیك مامۆستای ناسیبێت یان ئاشنایەتی و تێكەڵیی لەگەڵدا هەبووبێت، دەزانێت كە چەندە خۆشمەجلیس، پاكو ڕاستگۆ، نیشتیمانپەروەر، قسەخۆش، خانەدان و دەستو دڵ واڵا، قەت ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیزانیووە ڕووگرژی و تووڕەبوون چییە، نەیزانیووە، ڕق و كینە لەدڵی، چییە. یانی، دەوڵەمەند بە كۆمەڵێك سیما و خەسڵەتی بەرزی كوردەواریی وا، كە بە دەگمەن ڕوودەدا ئەو هەموو خەسڵەتە جوانانە، لە یەك كاتدا، لە خەڵكی دیكەدا كۆببێتەوە. ئینجا، لایەنی ئەدەبی و زمانزانی و مامۆستایەتی و هەستی شاعیرانە و فۆلكلۆریەكەیشی، ئەوە سەرباری هەموو باران!...

دیارە مامۆستا، لە ژیانی خۆیدا و بەتایبەتیش لە ژیانی پەروەردەیی و لایەنی كۆمەڵایەتیدا، كۆمەڵێك دۆست و برادەری زۆر نزیك و گیانی بە گیانیی هەبووە، كە تا ئەو ڕۆژەش بەجێیهێشتن، ئەو پەیوەندییە ڕووحی و سەمیمییە، هەر بەردەوام بووە. لەو بەینەدا، لەگەڵ ئەو برادەرانە و نزیكانی دیكەیشیدا، كۆمەڵێك ڕووداو و بەسەرهاتی خۆش كەوتۆتە بەینیانەوە.

هەوڵماندا، هەموو ئەوانە، دانە بەدانە بدوێنین و قۆشمە و بەسەرهاتە خۆشەكان، لە زاری خۆیانەوە، ببیستین و دواتر بیاننووسینەوە. بەڵام بەداخەوە، ئەوەی كە بۆمانكرا، تەنیا ئەو چەند مامۆستا و كەسایەتییە بەڕێزە بوون، كە لێرەدا، كۆمەڵێك باس و بەسەرهاتی خۆش، لە زاری خۆیانەوە دەبیستین و، دیارە كەسانی بەڕێزی دیكەش هەبوون، كە زۆر لە مامۆستای ڕەحمەتییەوە نزیك بوون، بەڵام، بە هەرهۆیەك بووبێت، ئامادە نەبوون، بە ئومێدی ئەوەی كە لە داهاتوودا، چیدیكە و لەگەڵ كێدا بابەتی هەبووبێت، وەگیرمان بكەوێت و یاداشتیان بكەین.

دیارە بەدەر لەوانە و بەر لە هەركەسێك، كچ و كوڕەكانی خۆی، نزیكترین هاوڕێی مامۆستا بوون، ئەوانەی كە زۆر تێكەڵی خانەوادەگییان هەبووە لەگەڵ مامۆستا، ئەو ڕاستییە لە هەموان چاتر دەزانن. بۆیە، بەشێك لەو نوكتە خۆشتانە، ئی زاری دوو لە كچ و كوڕەكانیەتی.

حەزدەكەین ئەو ڕاستییەش بخەینەڕوو كە، یەكێك لە ئامادەكارانی ئەم كتێبە، بەهۆی ئەوەی كە لە ساڵانی هەشتاكانی سەدەی بیستەوە، لەڕێگەی ئەدەبیات و نووسینەوە، ئاشنایەتیمان لەگەڵیدا هەبووە و دواتریش لە ساڵانی دوای ڕاپەڕین لە مەڵبەندی ڕانیەی ڕێكخستنی یەكێتیی نیشتیمانی كوردستان، مامۆستا لە بەشی مافی مرۆڤ و ئێمەش لە ڕاگەیاندن، پێكەوە كارمان كردووە و زۆربەی كات پێكەوە بووین و باسوخواسی ئەدەبی

و فۆلکلۆریمان لەنێواندا هەبووە، تەواوی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتە خۆشانەی نێوان خۆی و برادەرەکانی، بەپەردە و بێپەردە، بۆ گێڕاوینەتەوە. بەڵام بە ڕەچاوکردنی داب و ڕەسمی کۆمەڵایەتی، ئەوانەی کە تا ڕادەیەك جارێ گونجاونین، لە ئەرشیفدا گلمان دانەوە بۆ ڕۆژگارێك کە بتوانین بێسڵەمینەوە، ئەوانیش بڵاوبکەینەوە.

شێوازی نووسینەوەی بیرەوەری و بەسەرهاتەکانیش، بە هەمان ئەو شێوازی ئاخاوتن و گێڕانەوەیە نووسیوەتەوە، کە کەسایەتییەکان خۆیان بۆیان گێڕاوینەتەوە و بە پێویستمان نەزانیووە دەستکارییان تێدا بکەین.

## مامۆستا کاکە[1]

* لە بنگردی،ماڵمان لەسەر گردەکەی بوو، ماڵی ئێمە بەسەر ماڵێ وانیدا دەڕوانی. بەیانیان داکم کە لەبەردەرگای بوایە، زیاد خۆی پێشان دەدا و دەچوو بۆ مزگەوتێ. داکیشم هەڵیدەستاندم: هەستە بە قوربانی زیادی بی، ئێستا ئەو چوار نوێژی کردوون! دەمگووت دایە وا نیە، وەڵڵاهی وانیە!... دواتر دەمگوت زیاد ئەتۆ نوێژت کردوون؟ دەیگوت ناوەڵاهی، ئەدی چۆنت بە جنێودان بدەم!؟

* جارێکی دیکە، ١٩٦٣ و ئەو دەورە بوو، زەمانی دەربەدەری و ئەوانە بوو، ئەمن و ئەو و مامۆستا ڕەشید[2]، دەچووینە سلێمانیە و دەهاتینەوەو... هەرسێکمان بە حیساب پێشمەرگە بووین، وازمان لە وەزیفەی هێنابوو، شەوێکی لە سلێمانیە دەهاتینەوە، گەیشتینە (سەرگەڵوو)ێ، ئەو کاتەش دێهات زەغتی زۆر لەسەر بوو، هەموو ماڵێك، هەموو شەوێك کۆمەڵێك پێشمەرگەی میوان بوون، شەو بوو[3] گەیشتینە وێ، بەفر دەباری، باران دەباری، دەرگایان لێ نەکردینەوە، ناهەقیشیان نەبوو، چونکە بە ڕاستی خانووی ئەو کاتی دوو ژوور بوو، ژوورێك بۆ خۆی و ژن و ماڵ و منداڵی و پێنج پێشمەرگەش لەگەڵی بوون. چ بکەین چ نەکەین؟ کوتم بە کۆنەئاشێکی دەزانم لە (بەرگەڵوێ)یە، لە خوار سەرگەڵوێ، با بچین. زیاد شقارتەی پێ بوو، چووین دەستمانکرد بە هەڵوەشاندنەوەی گوێسەبانەکانی و، ئاگرێکمان کردەوەو، ئەوەندەش برسیمان بوو، تووتنی جگەرەکەم خوارد!... بەیانی هەڵمستاندن، کوتم هەستن با بڕۆین بگەینە (هەنجیرە)ی، هیچ نەبێ نان و ماستێکی بخۆین، هەنجیرەش زۆر دوورە لەوێ، بەڵام گەنج بووین، گوێمان نەدەدایە. ڕۆیشتین، زیاد شتێکی وەپێش خۆی دابوو، هەر شەقی تێهەڵدەدان و دەیهێنا لەگەڵ خۆی، کوتم دە سەگی سەگباب وەرە مردین، وەرە با بڕۆین، ئەوە چیە لە پێشتەوە؟ کوتی وەڵا کەللەسەرە!

---

١- کاکە سوارە ئیبراهیم (مامۆستا کاکە)، لەدایکبووی ١٩٤٠، ناحیەی بنگرد- قەزای دوکان، دەرچووی خانەی مامۆستایانی سلێمانی، کۆچی دوایی ٢٠١٩ ڕانیە.

مامۆستا کاکە، جگە لەوەی کە خزمیشیەتی، یەکێکە لە برادەرە هەرە کۆنەکانی مامۆستا زیاد، لە بنگرد لە دوو خانووی لە یەك نزیك لەدایك بوون، پێکەوە خوێندوویانە و خانەی مامۆستایانی سلێمانییان تەواو کردووە، بە یەك فەرمانی کارگێڕی دامەزراون و بە یەك فەرمانی کارگێڕیش خانەنشین کراون. (ئامادەکاران)

٢- مامۆستا ڕەشید: یەکێك لە برادەرەکانی مامۆستا زیاد و مامۆستا کاکە بووە، خەڵکی سلێمانییە، لەوان بچووکتر بووە، بەڵام پێکەوە خوێندوویانە و خانەی مامۆستایانیان تەواوکردووە و زۆربەی ژیانیان پێکەوە بەسەربردووە. (ئامادەکاران)

٣- عەبدولقادر: یەکێکە لە خزمەکانی خۆیان.

تومەزا باران زۆر باریبوو، کەللەسەری زەمانی کۆنی هێنابۆ وێ، ئەمنیش کوتم: ئەگەر مردوو مرد شەیتان خۆی لـێ لا دەدا! سەگی سەگباب، بۆ وازی لێناهێنی؟ کوتی موستەحەقە! کوتم بۆ؟ کوتی باپیری ئەوانەیە، ئێستا ئەگەر مابایە ئەویش ڕای نەدەگرتین!

* جارێکی کە، دەچووین بۆ قەلادزێ، هەموو جارێکی ئەگەر سەفەرمان دەبوو، ئەو وەختە سەیارە نەبوو، جا بۆ مەعاشی چووباینایە، بۆ هەر شتێك چووباینایە، گەنج بووین، دەمانگووت لەو سەریەوە[1]، یانی بەیانی زوو، بڕۆین. من بووم، ئەو بوو، کاك عەبدولقادر بوو، کاك عومەری سۆفی پیرەی ئامۆزامان بوو، ئەو بوو. ئەمە، تویێکمان هەبوو لە بنگردی، هەموو عائیلەکەمان لەسەری دەنووستین[2]. بەیانی هەستاین، زیاد دەستی کرد بە ئاخ و ئۆفان. هەزار ڕەحمەتی لـێ بن برایمی برام کوتی ئەوە چیە زیادە؟ کوتی نەخۆشم، کوڕە کوتم وەڵڵاهی درۆ دەکا برایم! کوتی کاکە ئێسترێکی دێنم لەگەڵ خۆم هەتا سەری (چەکواوێ) با زیاد سوار بێ‌و، لەوێشەوە کەیفی خۆتانە!... وەڵا وای خۆ هێنایە حاڵی جاوی، کە دەمرێ و نامرێ! ئەمن دەمگوت درۆ دەکا، عەبدولقادر دەیگوت درۆ دەکا، عومەر دەیگوت درۆ دەکا، ئەویش لە جیاتی ئەوەی بە ئێسترەکەی بڵێ هەچە! ئەو دەیگوت وەحە! کاکم، ئەوەندە فەقیر بوو، قەناعەتی پێ کردبوو، دەیکوت بە قورعان دەمرێ زیادە... وەڵا سواری کرد، ملی بە ئێسترەکەیدا هێنابۆوە خوارێ، هەتاوەکو گەیشتینە سەری چەکواوێ، لەوێ ڕەزی لێن، شوێنێکی لێیە (خێرات)، وەقفی باپیرم بوو، گەیشتینە وێ و زیاد لەسەر ئێستری خۆی فڕێ دا و ڕایکردە نێو ڕەزەکان، وەڵا برایمی برام دوو سێ جنێوی تەڕی ڕێوەشاندن. کوتم ئاخر ئەمن پێت دەڵێم درۆ ئاوایە، کوتی دە من چوزانم ماکەرێ خۆی لێکردم بە مردوو!

* جارێکی، هەزار ڕەحمەتی لـێ بێ، (حەمەی کانەبی ئاغا)ی، میوانم بوو لە سلێمانی لەگەڵ سمایلی سەلیماغا و مەجموعەیەك پشدەری، شەوێ و سبەینێ ئێوارێش لەوێ بووین. ئەو کاتەش یاری و قومار و ئەوانە باوی بوو، قومارمان دەکرد، بۆ سبەینێ عەسرەکەی حەماغا کوتی هەستە سواریە دەچین بۆ قەلادزێ، کوتم نایەم، کوتی دێی... فایدەی نەبوو، سوار بووم لەگەڵی، گەیشتینە وێ، لەوێ دەستی کرد بە تەلەفۆن کردنێ،

---

[1] - لەوسەریەوە: مەبەست لە ئەوسەری شەوە، کۆتایی شەو، بەری بەیانی.

[2]- جاران لە گوندەکان، ئەگەر ماڵێك مەبەستی بوایە، یا ئیشی پێ بوایە، دار تووێکیان لە تەمەنی سێ چوار ساڵیدا، دار و تەختە و شتی پانیان لەسەر دادەنان و وەك شێوە کەپرێکی لێدەهات، ئیدی لق و خەڵفە ناسکەکانی بە تەنیشەکانیدا گەشەیان دەکرد و ئەوانەی ژێریشی وردە وردە پتە و قایم دەبوون و بۆ ئەوە دەبوو بە هار و هاوینان، خێزان لەسەری بخەوێت. (ئامادەکاران)

بۆ برادەری، بۆ مامۆستا ڕەحیمی، بۆ کێ و بۆ کێ، کە بێن بۆ ماڵێ حەماغای و. دیوەخانێ حەماغاش مەشهوور بوو. کە سەیرمکرد، ئەگەر بێ و من لەوێ بم، ئەو شەوەش نابێ بنووم. ماڵێ حەماغای و ماڵێ مامۆستا زیادیش دیواریان بەین بوو، فرسەتێکم هێنا، بە دەرگای پشتەوەدا ڕامکرد لە دەرگای ماڵێ زیادیم دا، کوتم زیاد مەیکە بە هەرا، چوومە ژوورێ. ناسکە لەوێ نەبوو، نازانم بۆ تازیە بۆ چی، چووبووە کۆیە. دانیشتم و کوتی گوێم لەو قرە قرەی بوو، ئەوە چییە؟ کوتم وەڵا ئەوە حەماغا ئیزنی نەدەدام، ئەمنیش هاتمە ئێرە. کوتی جا ناسکە لێرە نیە، چتدەمێ؟ کوتم هیچم مەدەیە، نان و ماستێك دەست ناکەوێ؟ کوتی بەرێ وەڵا، ماستەکەی دانا و چۆ بەر بەلوعەکەی نانەکەی تەڕکا، کوتی جا کاکە بە وشکیت پێ خۆشە یان بە تەڕی؟! ئەمنیش عادەتەن کە ماستی دەخۆم، حەز دەکەم بە نانی ڕەق بیخۆم، گوتم وەڵا زیاد بە وشکی! دەستیکرد بە پێکەنینێ و ئیدی بۆی تێکەوتم!

* قوتابخانەی (پشدەر) دەکرایەوە، مامۆستا (سەمەد) هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، مودیر تەربیەی سلێمانی بوو، هاتە قەڵادزێ. ئەو کاتە من مامۆستا بووم لە قوتابخانەی (قەڵادزێ)، گوتی مەکتەبێکی دەکەینەوە لێرە، تۆ دەبی بە مودیری، پێشت خۆشە ناوی چ بێ؟ گوتم وەڵا ئەگەر بە دڵی من بێ ناوی دەنێم پشدەر، گوتی زۆر زۆرم پێ خۆشە. لە ١٩٦٧/١٠/١٧ مەکتەبی پشدەرم کردەوە. لەگەڵ مەکتەبی (ئاسۆس) مزدەوج بووین، ئێمە بەیانیان بووین، ئەوان پاش نیوەڕۆیان بوون. گوتی میلاکاتیش، من مامۆستاکانت بۆ پەیدا دەکەم، بە ئارەزووی خۆشت کێت دەوێ بۆت دێنمە ئێرە. مامۆستا زیادم هەڵبژارد بۆ علووم، ئەو کاتە زانستەکانیان پێ دەگوت، ئەمینی حاجی فەتاحی، بۆ ئینگلیزی و مەلا بابەکر بۆ ئایین و... ئاخیری گوتم حەز دەکەم (غەریب)م بۆ بێنیەوە، لە دەشتی کۆیە لە گوندی (بۆگدێ) بوو، گوتی باشە... بە کورتی، وەك عائیلەیەکی زۆر مونسەجیم بووین، مەکتەبێکی زۆر چاك بوو... ڕۆژێکیان، بەرقیەکم بۆ هات، لە تەربیەی سلێمانییەوە، بەرقیەی ئەو کاتەی بە لاسلکی بوو، لە تەربیەوە دەیاننارد بۆ شورتەی سلێمانی، لە شورتەی سلێمانییەوە بۆ شورتەی قەڵادزێ و لە شورتەی قەڵادزێش دەیاننارد بۆ من. نەسسی بەرقیەکە دەڵێ فەورەن ناو و موالیدی مامۆستاکانتم دەوێ. منیش، هەموو لە پۆلێ بوون، ئەو کاتەی مەکتەب چل مامۆستای لێ نەبوو، حەوت پۆل بوو، حەوت مامۆستای هەبوو، وەڵا بوو بە ئیسراحەت و مامۆستاکان هاتنەوە، ناو و موالیدم لێ پرسین و گەیشتمە سەر غەریبی، کوتم مامۆستا غەریب موالید چەندی؟ ئەویش کوتی ئەو ساڵەی ئەگەر (کەریم باشچاوەش) کوژراوە، ئەمن عومرم سێزدە ڕۆژ بووە، ئێ کوتم کەنگێ کوژراوە؟ ئەمن موالیدەکەم دەوێ، کوتی ئەمن داکم وا دەڵێ، هەر ئەوەندەش دەزانم! زۆر خەریکی بووم، فایدەی

نەبوو، بەرقیەکەم لەتوپەت کرد و بە دم و چاوی غەریبییمدا دا و، هەزار ڕەحمەتی لـێ بێ، ئەو شەیتانەش، ئاگام لـێبوو دنەی دەدا دەیگوت پێی مەڵێ. پاش نیوەڕۆیە، زیاد هاتە دەرێ و عادەتەن لە قەڵادزێ، دەگەڵ دەبوو بە ئێوارە، خەڵك دەچوو بۆ پیاسەی، بۆ لای گردەسپیان[1] و سەرێ. زیاد هات و ڕۆیشتینە دەرێ، تومەزا تەگبیر بوو! غەریبیش هات، نەمدواند، کوتی کوڕە دەمدوێنی نامدوێنی کەیفی خۆتە! ئەمن داکم وا دەڵێ! ماڵێ داکیشی لە کن ماڵی پوور شەمامێ بوو، بەوێدا ڕۆیشتینە خوارێ، غەریب بانگی داکی کرد: دایە! حەمدیە! وەڵا حەمدیە هات و چۆنی و چاکیمان کرد و کوتی لێی بپرسە! گوتم پووری غەریب چ ساڵێکی لە دایك بووە؟ کوتی جا بە خوای ڕۆڵە نازانم، ئەگەر (کەریم باشچاوەش) کوژرا ئەو سێزدە ڕۆژ بوو!... غەریب گوتی: ئێ ئەوە وا دەڵێ! گوتم غەریب عەیبە ئێستا ئەمن حەیام دەچێ... گوتی جا خۆ چارەی هەیە! گوتم چۆن؟ گوتی: لێرە سجلات نەماوە، کتابێکی بکە بەرقیە بچێ بۆ سلێمانیە، لە مودیریەتی شورتەی سلێمانیە بگەڕێن ناوی هەیە دەوێدا!... هەتا سبەینێ پێی نەکوتم، زۆریشی خەتای زیادی بوو!

* جارێکی دیکە، ئەمن و مامۆستا زیاد و یەك دوێکی کەش بووین، دەچووینە تازیەیەکی، کە گەیشتین یەکسەر بانگی عەسری دا، ئەوانەی لەوێ بوون هەموو خەریکی دەستنوێژ و جەماعەت و ئەوانە بوون. ئەمەش هیچمان نوێژمان نەدەکرد، ئێ خوایە چبکەین چ نەکەین، ئاوا ڕادەوەستین، نابێت! بابەتی نوێژکردنێش نەبووین هەتا بچین دەگەڵ خەڵکەکەی نوێژێ دابەستین، هەر وا لەوەیدا بووین کە چبکەین و چ نەکەین!. لەوکاتەیدا مامۆستا زیاد کوتی: «ئەو دوودڵیەی ناوێ، دەچین لەگەڵ جەماعەتێ نوێژەکەی دادەبەستین، قابیلە پێی کافر بین!![2]»

---

١ – گردەسپیان: گوندێکە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی قەڵادزێ بە ٣ تا ٤ کلم

٢ – ئەوەندەی ئێمە لە نزیکەوە ئاگاداربووین، مامۆستا زیاد، لە ڕووی باوەڕبوون بە خوداوە، بێباوەڕ نەبوو، بەڵام لەگەڵ بەجێهێنانی هێندێك ئەرکی ئایینیی وەك نوێژدا، کۆك نەبوو. (ئامادەکاران)

## مامۆستا غەریب پشدەری[1]

* ڕۆژێکی بەهاریێ، مامۆستا زیاد و مامۆستا بابەکر سەلیم و مامۆستا کاکە سوار لە لای مامۆستا مەلا حەسەنی مەرگێ دەبن. مامۆستا مەلا حەسەن پێیان دەڵێ: هەواکەی خۆشە، سارد نیە، بۆ نایەن بوگێڕم[2] بەبێ (ڕێ)؟ ئەوانیش دەڵێن وەڵا پێمان خۆشە. وە دوی دەکەون[3]. زیاد تەك دەبێتەوە[4]. دەڵێن ئەوە چیە؟ زیاد دەڵێ وەڵا ئەمن نایەم! دەڵێن ئێ باشە بۆ نایەی؟ ئەوە هەموومان دەچین لەگەڵ مەلا حەسەنی بزانین چۆنمان دەگێڕێ

---

١ – غەریب پشدەری: غەریب محەمەد ئەمین، ساڵی ١٩٤١ لە قەڵادزێ لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی لە قەڵادزێ، قۆناغی ناوەندی و خانەی مامۆستایانی لە سلێمانی تەواوکردووە. لە ١٩٥٦ باوکی کۆچی دوایی کردووە و خۆی بووەتە گەورە و سەرداری ماڵێ و ئەرکی بەخێوکردنی خێزانەکەی کەوتۆتە ئەستۆ. لە ١٩٦٢/١١/١٩ لە هەولێر بە پیشەی مامۆستایەتی دامەزراوە. ماوەی ٤٤ ساڵ لە هەولێر، ڕانیە، قەڵادزێ، کۆیە و زۆر شوێنی دیکە و بۆ دواجار لە ١٩٩٠/١٠/١ لە (دارەتوو)ی سەر بە هەولێر، خزمەتی مامۆستایەتیی کردووە. ساڵی ٢٠٠٦ خانەنشین کراوە.

مامۆستا غەریب، یەکێك بووە لە دۆست و برادەرە هەرە نزیك و خۆشەویستەکانی مامۆستا زیاد، هەر لەو ڕۆژگارەوە کە لە خانەی مامۆستایانی سلێمانی، پێکەوە بوون، تا کۆتایی، بەردەوام پێکەوە بوون، نێوانیان زۆر خۆش بووە، وەك برا وابوون، هیچ ڕاز و نیازێکیان لە یەکتری نەشاردۆتەوە، وەك مامۆستا غەریب باسی کرد، قەت لە دەرگای یەکترییان نەداوە و بێ تەقیە وە ژوور ماڵی یەکتری کەوتوون.
مامۆستا غەریب لەو بارەوە گوتی: «ئەوە لەگەڵ مامۆستا زیادی ڕەحمەتی، لە دار معەلمین پێکەوە لە بەشی نێوخۆیی بووین لە گەراجی ئەسحابە سپی. زیاد و مامۆستا عەلی میرزای ڕەحمەتی و مامۆستا کاکەسوار، بە دوو ساڵان لە پێش من بوون. ئەمن لە یەکی دار معەلمین بووم، ئەوان لە سێ بوون، ئەمن هاتمە دوو، ئەوان تەخەڕوجیان کرد. جا لەو کاتیەوە هەتا ئەو ڕۆژەی کە چۆ بەرڕەحمەتی خوای، ئێمە لێك نەپچڕاوینەوە، دوورو نزیك هەر دۆست و برادەر و ئەحبابی یەکتر بووین. لە ساڵی ١٩٦٨یش کاتێکی کە ئەمن لە کۆیەوە هاتمەوە بۆ قەڵادزێ، جا ئەو کاتەی کەوتینە کن یەك، لە (قوتابخانەی پشدەر) کە مامۆستا کاکە سوار مدیرمان بوو، ئەمن و مامۆستا زیاد وێك کەوتینەوە، وەکو جاران دەستمان کردەوە بە دۆستایەتی و کەسایەتی یەکتری و ئەوکاتەش ژنی هێنا بوو، ناسکەخانی کچی حەسەنی مام جەلالی هێنابوو، دوورو نزیك لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە خزمایەتی و کەسایەتیمان هەبووە. ئیدی شتی خۆشیشمان کەوتە بەینێ. بۆ هاتوچوونێ لە دەرکەی یەکتریمان نەدەدا. وەکو کەسوکار و برا و ئەوانە هاتوچۆی یەکتریمان دەکرد. خەڵکیش لە زۆر جێگای، وایاندەزانی ئەمن و زیاد براین، چونکە ئەمن غەریب محەمەد ئەمین بووم، ئەویش زیاد محەمەد ئەمین بوو. زۆر ڕووداوو سەرگوزەشتەو بەسەرهاتی خۆش و ناخۆشمان پێکەوە هەیە...»
لە دوو گفتوگۆی تەلەفۆنیدا لە ١٥ و ١٦ ی ٢٠١٨/١٠، ئەو بابەتانە لە بەڕێزیان وەرگیران. (ئامادەکاران)

٢ – بوگێڕم: بتانگێڕم.

٣ – وە دوی دەکەون: وە دوای دەکەون، دەکەونەدوای.

٤ – تەك دەبێتەوە: تاك دەبێتەوە، تاق دەبێتەوە، جیادەبێتەوە.

بەبێ ڕێ!. ئەوان وا دەزانن لە (لاڕێ)یاندا دەگەڕێ. ئەویش دەڵێ وەڵا کاکە ئەمن نایەم، ئەو گەڕانە (بێ ڕێ)یە، هەر موبارەکی خۆتان بێ دیارە زۆرتان حەز لێیە! ئەوانیش دەڵێن باشە بۆ لە هەموو شتێکی ئەتۆ هەروا ئینکار دەبی؟ وەڵاهی هەر دەبێ بێی! کوڕە دەڵێ بەخوای تفەنگم پێوەنێن نایەم! ئەویش دەڵێن بۆ؟ ئەویش دەڵێ کوڕە چۆن دێم بۆ گانێ! دەڵێن چی؟! دەڵێ کوڕە ئەوە هەموان دەگێ بەبێ ڕێ! ئەوە (ڕێ)یەکەی لێکەنەوە! لە (بتانگێڕم). دەڵێن مەلا حەسەن ئەوە چیە؟ ئەویش دەڵێ چتان لێکەم؟ هەر ئەوەندەتان پێڕا دەگەم!

* ئەمن لە خانووی حاجی ساڵحی مامەڵڵایدا بووم، لە زیادی نزیك بووم، ئەویش لەولای، لە تەنیشت ماڵێ حەمەی کانەبیاغای، لەو دیوی وان، لە خانوێکیدا بوو. ئێوارێکی لەسەر نانخواردنێ بووم، دوو سێ پارچەڵە منداڵی هەبوون، وە ژوور کەوتن. پارووم لە زاریدا بوو، هەر هاتنە ژوورێ کوتیان بابم دەڵێ هەر ئێستا بێ. زۆرم گوت وەرە ڕۆڵە نانی بخۆن، بە گوێیان نەکردم گوتیان گوتویەتی ئەگەر پارووی لە زاریدا بوو مەیەڵن قووتیدا بیهێنن. ئەمیش[1] تەماشای دەم و چاوی منداڵەکانم کرد، گوتم بزانم داخوا بانگکردنی خەمێیە یا بانگکردنی خۆشیەیە! تەماشمکرد زەردەیان[2] بە لێویەوە بوو، ئەوانیش قسەیان نەدەکرد، گوتم باشە، وەڵا بەدویان کەوتم.

جا، زیاد، تەبیعەتێکی هەبوو، ساڵانە لە بەرەبەری بەهارێ، شەکەمێیەکی ڕادەگرت، دەگەڵ مەڕی دەکرد[3]، پایزێ کە ئاوس دەبوو دەیهێنایەوە ماڵێ. ئەگەر چووم، لەولاو لەولا پیاسەی دەکرد لە ڕۆخی هەیوانێ، گوتی وەرە، هەر لە دەرکێڕا گوتی وەرە، گوتم ئەوە چیە؟ کوڕە کوتی وەرە بگەیە[4]! ئێ گوتم چیە؟ کوتی وەڵڵاهی ئەوە لە دو پووڕایشێ، ئایشە قیلوان[5]، کوتی لە دو پووڕایشێشم ناردووە بگاتێ[6]، کوتویانە وەڵاهی لە ماڵێ نیە، ژنێك لە سەردەستانە[7]، بە هاواری ویەوە چووە! ئەمنیش ئەوە مەڕەکەم لەسەر زان بوو،

---

١ – ئەمیش: ئەمنیش.

٢ – زەردە: زەردەخەنە، نەرمە کەنینی بێدەنگی سەر لێوان.

٣ – دەگەڵ مەڕی دەکرد: دەیخستە نێو ڕانەمەڕێکەوە. ڕانەمەڕی ئەو ماڵەمەڕدارانەی کە بەهاران دەچوونە کوێستانان و پایزانیش دەگەڕانەوە. بە مەبەستی قەڵەوبوون و ئاوسبوون.

٤ – وەرە بگەیە: وەرە فریاکەوە، وەرە پێڕا بگە.

٥ – ئایشە قیلوان: ئافرەتێکی دانیشتووی قەڵادزێ بوو، لە ئیشی مامانی و منداڵبووندا شارەزاییەکی زۆری هەبووە.

٦ – بگاتێ: فریاکەوێ.

٧ – ژنێك لە سەردەستانە: ژنێك بە زانێوەیە، ژنێك بە منداڵبوونێوەیە. ژنی دووگیان کە دێتە سەروەختی منداڵبوون، زۆر جار بەرەو ڕوو دادەنیشێ و سینگی دەخاتە سەر دەستەکانی، بۆیە ئەو حاڵەتە ئەو

کەسم وە دەست نەکەوت، بۆیە لە دو تۆم ناردبوو! جا گوتم بۆ مامانیەت لە دو ناربووم؟! گوتی ئەدی خۆ بۆ شاییەم لە دو نەناردووی؟!

* ئەوە جارێکیش، لە دارەتوویم[1]، تازە چوومەتە دارەتوێ، ئەو دەمێکە لەوێیە، ساڵێك و ئەوەندەیە لەوێیە، ئەمن لە نەوەت[2] چووم، ئەو دامەزرابوو[3]، ئەمن خانووم بەکرێ گرت، ئاخر ئەمن لەگەڵ تەرحیل و شتی وا خۆم ڕەگەڵ نەدا، کارت و مارتم[4] وەرنەگرت. ئەمنیش، کە کەس نەما و دۆست و برادەرەکانم هەموو ڕۆیشتن، ئەمنیش ملم لێنا. کە چوومە دارەتووێ، خوایە! نە جێیەك هەیە بچم، نە جێ هەیە ڕووی تێکەم، هەر لە ماڵا! هەر لە ماڵا! ڕۆژێکی منداڵە وردیلەکانی خۆم ناردە کن زیادی، گوتم پێی بڵێ بە زیادی، بابم دەڵێ ئەمن چ بکەم لە ماڵا؟! وەڵا جوابی ناردبۆوە، بڵێ چی باشە؟: "پێی بڵێ تەنیشتان بگۆڕێ!" یەعنی بگەوزێ! گوتم ئەوە بۆ خۆی هێندەی تەنیشت گۆڕیوون! جا چا نیە فێری ئەوەی بووە ئەمنیشی فێرکردووە!. جا ئەوە دوایەش لە بێتاقەتیان ئەگە لەبەرخۆمە دەمگوت باشە ئەمن چبکەم؟! ئەوە منداڵەکان: بابە! کەلەکان بگۆڕە![5] منداڵەکان نەیاندەزانی مەعنای چیە، وەڵا ئەمنیش لەبەر قسێ وان کەلەکەم بۆ دەگۆڕین!

---

ناوەی لێنراوە.

١ – دارەتوو: ئۆردوگای دارەتوو، گەڕەکێکە سەر بە شاری هەولێر. حوزەیرانی ١٩٨٩ کاتێك حکومەتی حیزبی بەعسی ئەو کاتەی عێراق، تەواوی قەڵادزێ و ناحیەکان و گوندەکانی سنووری پشدەری ڕاگواست بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکانی هەولێر و سلێمانی، بەشێکیان لەو ئۆردوگایە نیشتەجێ بوون، جا مامۆستا زیاد و مامۆستا غەریبیش هەر لەو ئۆردوگایە بوون.

سەرنج: مامۆستا غەریب لە ساڵی ١٩٨٥ـەوە لە قەڵادزێوە باری کردبوو بۆ شاری ڕانیە، ئەو، ساڵی ١٩٩٠ ماڵی بارکرد بۆ دارەتوو و وەك یەکێك لەو خێزانانە نەبووە کە لە قەڵادزێوە تەرحیل کرابوون، چوونی بۆ ئەوێ، تەنها بەو بۆنەیەوە بووە کە زۆربەی دۆست و ناسیاو و هاوشاریەکانی لەو ئۆردوگای دارەتوودا گرد ببونەوە. هەر بەو هۆیەشەوە بووە کە هیچ ئیمتیازێکی وەك عەرزە و پارەی قەرەبووی موڵك و خانوو، پێ نەدرا. (ئامادەکاران)

٢ – نەوەت: مەبەستی لە ساڵی ١٩٩٠ـە، ساڵێك پاش تەڕحیل.

٣ – دامەزرابوو: جێ و ڕێی خۆی پێك هینابوو، کێشەی نیشتەجێبوونی نەمابوو.

٤ – مەبەستی لە پسولەی ڕاگواستنە، کە هەموو سەرۆك خێزانێکی ڕاگوێزراوی پشدەر، وەك بەڵگەی ڕاگوێزراو، پێی درابوو.

٥ – هەڵبەتا منداڵەکان ورد بوون و نەیانزانیووە کە، کەلەکە و تەنیشت گۆڕین، بە مانای (گەوزین) دێت و بەس کەر وا دەکات، پێیان وا بووە کە ئیشێك یان شتێکی لەو جۆرەیە. (ئامادەکاران)

* ئەوە ڕۆژێکی بەهارە، گیاڕەشی بەهارێیە[1]! ئەمن و مامۆستا زیاد و مامۆستا خدر[2] چووینە پیاسەی، لە دارەتویٚ وەدەرکەوتین، ڕوون دە دەشتیٚ کرد، خوا عەلیمە، کەرێکیان بەستبۆوە بە گوریسێکی، باوەڕت بیٚ دوو سەت مەتر دەبوو گوریسەکە، کەرە بە چواردەوری خۆیدا لەوەڕابوو، هێندەی خواردبوو، هەڵامسابوو! ئەگە چاوی بەمە کەوت[3]، سیٚ کەس دەچین، دوو سیٚ جاری گویٚ ڕاست و چەپ کردن و دوایە بە گویٚ و بە چاوان کەوتە تەماشاکردنیٚ مە، هەر هێندەی پیٚ نەچوو ئەگە دەستی بە زەڕینیٚ نەکرد! هەر زەڕی و کلکی بادا، نەیدەبڕیەوە، ئەوە زیادیش: غەریب! گوتم بەڵیٚ! کوتی ئەریٚ زۆر بە غەریبی نازەڕیٚ[4]؟! گوتم بەریٚ وەڵڵاهی بەڵام عەیبێکی هەیەو لەعنەتی لێدا! کوتی عەیبەکەی چیە؟ گوتم زیاد دەزەڕیٚ[5]! گوتی وەڵڵاهی ئەنگوام[6]! گوتم جا لە خۆ دەگەڕێی[7]؟!

* شەستەکان بوو[8]، ڕۆژێکی لەگەڵ زیادی، بە بازاڕیدا دەهاتین، بە بەردەمی جامخانەی ئەوانەی قۆندەرەی دەفرۆشن. جا ئەو وەختەی، دیجلە هەبوو، باتا هەبوو، زەبەلوق هەبوو، زۆر لەو نەوعە شەریکانە هەبوو. ئەویش لە تەنیشتم بوو زیاد، دەڕۆیشتین، ئەمن ئەوە هەر وا دەڕۆم و قسەی بۆ دەکەم، ئەگەر ئاوڕمدایەوە، زیاد فرسەخێك لە من دوورە، لەبەر جامخانێکی ڕاوەستاوە، لە دووڕرا دەستی ڕادەوەشێنی دەڵیٚ وەرە بگەڕێوە، وەڵا ئەمنیش ڕاست گەڕامەوە کوتم ئەوە چیە؟ کوڕە گوتی وەرە تەماشای ئەو جووتە پێڵاوەی کە، ئەها چەندی لە بن نووسراوە؟ ئەها بیخوێنەوە. نووسرابوو پەنجا دینار! پەنجا دینار مەعاشی دوو موەزەفان بوو! جا ئەوە لەگەڵ پێڵاوەکان قسەی دەکرد، بڵیٚ چی باشە؟ بەقوربان! ئەگەر خوانەخواستە، گوێی شەیتانی کەڕبیٚ، بتانکڕم، دەبیٚ لەپێتان کەم؟ یان

---

١ – گیاڕەشی بەهاریٚ: گیای زۆر تێراو و چڕوپڕو سەوزی تۆخ.

٢ – مامۆستا خدر عومەر عەبدوڕەحمان ناسراو بە خدری ئەمەری ئاوڕەحمان کۆدەی، یەکێك بووە لە هاوشاریانی مامۆستا و خەڵکی قەڵادزیٚ بووە.

٣ – ئەگە چاوی بە مە کەوت: ئەگەر چاوی بە ئێمە کەوت.

٤ – بە غەریبی نازەڕیٚ؟: بە حەزینی نازەڕیٚ؟ بە سەیری نازەڕیٚ؟. مامۆستا زیا ویستوویەتی بە بەکارهێنانی وشەی (غەریب) کە ناوی مامۆستا غەریبە، بەکینایە بۆ دەنگی کەرەکە، یارییەك لەگەڵ مامۆستا غەریبدا بکات و قۆشمەیەك دروست بکات. (ئامادەکاران)

٥ – زیاد دەزەڕیٚ: زۆر دەزەڕیٚ، زەڕینی لە پێویست بەدەر. مامۆستا غەریبیش بە وەڵامێکی حازر و موستەحەق و بە بەکارهێنانی وشەی (زیاد) کە ناوی مامۆستا زیادە، بە کینایە، وەڵامی دەداتەوە و قۆشمەکە دەوڵەمەند دەکات. (ئامادەکاران)

٦ – ئەنگوام: پێکرام.

٧ – لە خۆ دەگەڕێی؟!: واز لە خۆ دێنی؟!، واز لە خۆت دەهێنی؟!

٨ – شەستەکانی سەدەی بیست، ئەو کاتەی کە مامۆستا زیاد و مامۆستا غەریب، تازە دامەزرابوون و ببونە مامۆستا.

لەسەر سەریتان دانێم! ؟ گوتم وەڵا زیاد، ئەوە ئی سەر سەریە، ئەوە ئی لەپێکردنێ نیە!

* دوای ئەوەی کە لە حوزەیرانی ١٩٨٩ ڕژێمی بەعس، تێکڕای شار و شارۆچکە و گوندەکانی ناوچەی پشدەری گواستەوە بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەکانی سەر بە سلێمانی و هەولێر، مامۆستا غەریب پشدەری بە دڵێکی پڕ لە خەم و حەسرەتەوە، ئەو کۆپلە شیعرە غەمئامێزە بۆ جوانیەکانی پشدەر و، کوێستان و گەرمێنی ماڵە ڕەوەندییەکان دەڵێت، پاشان، دوای ئەوەی کە مامۆستا زیادی هاوڕێی گیانی بە گیانیی، شیعرەکە دەبینێ، بە ئەوپەڕی گەشبینیەوە بە کۆپلە شیعرێکی پڕ لە هیواوە وەڵامی دەداتەوە[1].

١ - * بەدەر لەو چەند ڕووداو و بەسەرهاتە خۆشانە، زۆر بابەتی دیکەی لەو چەشنە لەنێوان مامۆستا زیاد و مامۆستا غەریبدا ڕوویانداوە، بەڵام وەك مامۆستا غەریب گوتی: لەبەرئەوەی خاوەنیان هەیە و تا ڕادەیەك، بەهۆی کلتوور و ئەقڵیەتی هێندێك خەڵکەوە، جارێ بۆ ئەوەی نابن بخرێنە نێو کتێبان و بڵاوبکرێنەوە، بۆیە ئەوانمان بۆ ڕۆژگارێکی دیکە هەڵگرت، کە بەڵکو خوایە بتوانین ئەوانیش ڕووناکاییە ببینن. (ئامادەکاران)

* ڕووداوێکی دیکە هەیە، کە تا ئەو ڕۆژەش کە قسەمان لەگەڵ مامۆستا غەریبدا کرد و ڕاستییەکەمان لێوەرگرت، هەم ئێمە و هەم خەڵکیش بەگشتی، وایاندەزانی کە ڕووداوەکە ئی نێوان مامۆستا غەریب و مامۆستا زیادیە، ڕووداوەکە بەوجۆرەیە: «مامۆستا زیاد و مامۆستا غەریب تووشی یەکتر دەبن و لە چاکوچۆنیدا مامۆستا زیاد بە مامۆستا غەریبی دەڵێ: «غەریب! (پشت دەری)یەکەت چۆنە؟» کە بە ئیما و ئاماژە، دیارە مەبەستی لە پاشەوەی، یاخود دواوەی بووە. مامۆستا غەریبیش هەر دەمودەست وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: «وەڵا وەك (پاش دەری)یەکەی تۆ وایە!» بەڵام وەك مامۆستا غەریب خۆی بۆی گێڕاینەوە، گوتی وانییە، ئەو بابەتە لەگەڵ مامۆستا زیاددا نەبووە، دروستەکەی بەوشێوەیە بووە: «مامۆستا زەکی هەناری هەبوو لە کۆیە، مودیری مەکتەبێ بوو، پیاوێکی پیر بوو، تەبعەن لە تەمەنی من نەبوو، بەڵام قسەی بە هەموو کەسێگی دەگوت. ڕۆژێکی لە نادی کۆیە دانیشتبوو، بەوێدا هاتم، یەك دووێکی لێبوون چاکوچۆنیم لەگەڵکردن، گوتم مامۆستا زەکی چۆنی؟ گوتی ها! وەرە! لەگەڵ پاشدانەکەی کوی؟! گوتم وەڵا مامۆستا وەکو تو! گوتی هەی ڕۆڵە ڕووت ڕەشبێ ئەرێوەڵا خۆ جنێوەکەت پێدامەوە، جا گوتم وەڵا زاری خۆت جنێوەکەی پێدایەوە، ئەمن یەخەم پێگرتووی؟ قسێ وام پێ بڵێی؟ ئەتۆ نازانی ئەمن ڕاناوەستم لەسەر قسان؟...»
مامۆستا غەریب لەسەر ئەو بابەتە، لە گفتوگۆیەکەماندا ڕوونیکردەوە کە ڕووداوەکە بەو شێوەیە بووە، بەڵام ئەمن و زیاد هەموو شتێکمان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە، ئەو نەقڵەشم بۆ گێڕایەوە، جا لەوانەیە ماۆستا زیادیش بۆ خەڵکی گێڕابێتەوە و ئیدی خەڵکیش کە گێڕاویانەتەوە لەوەیە تەحویلیان تێداکردبێ. (ئامادەکاران)

**مامۆستا غەریب:**

سالآن بەهاران خێڵ بەرەو ژوور بوو
جێگە هەواریان کوێستانی دوور بوو
نە کۆچ ما، نە خێڵ، نە کوێستانکردن
ڕەوەند بە ئاوی گەرمەسێر مردن

**مامۆستا زیاد:**

بەهارێك دادێ خێڵ بەرەو ژوور بێ
کام کوێستان خۆشە، نزیك یا دوور بێ،
بێتە هەواری ناز و نازداران
بڕازێتەوە وەك جاری جاران

## مامۆستا ئەحمەد قادر سەعید

مامۆستا زیاد، ئەو پیاوە بەڕێزەی هەموو ژیانی ئازایەتی و دڵنەرمی و خۆڕاگری بوو. پیاوێك بوو لە تەنگانان پەنا بوو، لە خۆشیاندا خەندەو پێکەنین بوو. مامۆستا بوو بە مانای بەرزی مامۆستا، کوردپەروەر بوو بە هەموو مانا جوانەکانی کوردایەتی، مرۆڤدۆست بوو بە هەموو مانا مەزنەکانی مرۆڤایەتی.

ناسینی و تێکەڵاویی من لەگەڵ ئەو پیاوە مەزنە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتانەی لە قەڵادزێ پێکەوە مامۆستا بووین و بە تایبەتیش بۆ ئەو سەردەمانەی کە شۆڕشی ئەیلوول هەرەسی هێنا و قۆناغێکی دیکەی خەبات و کوردایەتی هاتبۆ پێشەوەو، شۆڕشی نوێ دەستی پێکردبوو، ئەویش زیاتر بەهۆی ئەوەی کە لە بیرو لێکدانەوەو هەستی کوردایەتی، لە یەکتری نزیك بووین و ماوەیەکیش لە هەندێك کاری سیاسی و ڕێکخراوەییدا، هاوکار بووین.

مامۆستا زیاد، لە پاڵ کاری مامۆستایەتی و ژیان و گوزەران و خۆسەرقاڵکردن بە کلتوور و کۆکردنەوەی بابەتە فۆلکلۆرییەکان، خاوەنی هەڵوێستی جوامێرانەش بووە، بەتایبەتیش دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول و گەڕانەوەی ڕژێمی بەعس بۆ کوردستان و، ئەزیەت و نارەحەتکردنی خەڵك و، بە تایبەتیش توێژی مامۆستایان. من لێرە، بۆ مێژوو، ئاماژە بە هەڵوێستێکی مەردانەی ئەو پیاوە دەکەم، ئەویش ڕاوەستانی بوو وەك جەنگاوەرێکی بەجەرگ، کاتێك کە ویستیان ناچاری بکەن بیکەن بە بەعسی، یان هەر نەبێ لە هەستی کوردایەتی پەشیمانی بکەنەوە، ئەوەبوو بۆ هەموو ئەو پیلانانەی بۆیان داڕشتبوو، شکستی پێهێنان و نەیانتوانی تۆسقاڵێك لە ورە و ئازایەتیی دابەزێنن.

مامۆستا زیاد، لە هەمان کاتدا، کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتی، قۆشمە و قسەخۆش و خۆشمەجلیس بوو، خاوەنی گەلێك نوکتە و بەسەرهاتی خۆش و پێکەنیناویە، بەتایبەتیش لەگەڵ هێندێك لەو برادەرانەی کە زۆر لێیەوە نزیك بوون، وەك مامۆستا غەریب پشدەری، مامۆستا کاکە سوارە و کەسانی دیکەیش.

زۆر جار ئەو قسەیەی بۆ دەگێڕاینەوە: کوڕەکەچەڵێك لە دەرکەو بانی پیرێژنێکی نزیك دەبێتەوە و دەڵێت:

پـــــــووری! هـــــۆی پـــــــووری!
بـــارگـیـــنـــی بـێـنـمـــە ژووری؟

پیرێژنیش وەڵام دەداتەوە و دەڵێت:

قیتکەی پـوورێـت دە زاریـدا بێ
جێی بارگینینت لـێرە نابێ[1]!

مامۆستا زیاد، وەك نووسەرێکی کلتووردۆست و هەروەها نزیك لە ماڵی مام خالیدی کارگوزاری ئەو ڕۆژگارەی قەڵادزێ[2]، بەشێکی زۆر زۆری ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی مام خالیدی قسەخۆش بۆی گێڕاوەتەوە، ئەو، لەلای خۆی لە کەشکۆڵێکی گەورەدا، کە ناوی لێنابوو (چووزەبیزا)، تۆماریکردوون[3].

خەسڵەتێکی دیکەی بەرزی مامۆستا زیاد، کە خۆی هەمیشە شانازیی پێوە دەکرد و دۆست و هاوەڵانیشی بۆ هاندەدا، پشتبەخۆبەستن بوو لە هەموو مەیدانەکانی ژیاندا و بە تایبەتیش ژیان و گوزەران. هەر ئەوەش بوو وای لێکرد کە ساڵێك لە ساڵەکانی هەشتاکان، خۆی و خێزانی و منداڵەکانی بچنە گوندی (سندۆڵان) و ئەو هاوینە لەگەڵ یەك لە ماڵە خزمانی، ببنە توتنەوان و هەتا پاییز لە دەم زێ بمێننەوە و توتنەوانی بکەن.

بە کورتی: مامۆستا زیاد، پیاوێکی بەوەفا، هەست ناسك، بە ئەمەك، دڵسۆزی هەژاران و ئامادە بۆ بەتەنەگەوەهاتن، نیشتیمانپەروەر، میللەتدۆست، هەرئەوەش بوو وای لە مامۆستا زیاد کردبوو کە دڵی نەیەت وڵات و خەڵکی خۆی بەجێ بهێڵێت و بیر لە تاراوگە نەکاتەوە.

مامۆستا زیاد، لە وەسف و تاریف نایەت!

---

١- هەڵبەتا، جەنابی مامۆستا ئەحمەد، چەند قۆشمەیەکی دیکەیشی بۆ گێڕاینەوە، بەڵام لەبەرئەوەی پێشتر لەزاری مامۆستا غەریب و کەسانی دیکەوە وەرمانگرتبوون و یاداشتمان کردبوون، بە پێویستمان نەزانی لێرە دووبارەیان بکەینەوە. (ئامادەکاران)

٢- مەبەست لە حەفتاکان و هەشتاکانی سەدەی بیستە.

٣ - پاشتر، دوای دروستبوونی (ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد) لە ساڵی ٢٠٠٣ لە سلێمانی، مامۆستا زیاد هەموو ئەو بابەتانەی کە لە کەشکۆڵەکانیدا یاداشتی کردبوون، بەرەبەرە دەریهێنان و نۆ کتێبی لێدروستکردن، کە یەکێك لەو کتێبانە (هەتا نەمری نازانی چت بەسەردێ) بوو، کە ڕووداو و بەسەرهات و گێڕانەوەکانی مام خالید خۆینی. هەموو ئەو کتێبانەی لە ئینستیتیووت بە چاپ گەیاندن. (ئامادەکاران)

## مامۆستا سەلیم[1]

* جارێك چوومەماڵیان، لە دەرگام دا، سروەی کچی دەرگای لێکردمەوە. گوتم: "بابت گەماڵە؟!!" سروە، ئەو دەمە منداڵ بوو، لە قسەکەم حاڵی نەبوو، وا تێگەیی دەڵێم بابت لە ماڵە؟ گوتی: بەڵێ... کە چوومە ژوورێ، پێدەکەنیم، پێدەکەنیم، مامۆستا زیاد گوتی: "بەچی پێدەکەنی؟" ئەمنیش شتەکەم بۆ گێڕایەوە. مامۆستا زیادیش ڕووی لە کچەکەی کردو گوتی: "ڕۆڵە ئەوجار ئەگەر وایگوت، بڵێ برۆ بن پردێ و...!" سروەش گوتی باشە بابە ئەوجار وا دەڵێم!

* تازە گوندەکانی ئەو بنارانە تەرحیلکرابوون بۆ ئۆردوگاکانی پشدەرێ. ئیحساییەك هەبوو، مامۆستایان دەیانکرد. مامۆستا زیاد و چەند مامۆستایەك، ڕۆیشتبوون، ڕێیان هەڵەکردبوو، کەوتبوونە شوێنی قەدەغەوە، عەسکەر دەورەیان گرتبوون و گرتبوویانن. ئەوە بوو کەوتینە هەوڵ و تەقەلا بۆ ئەوەی مەسەلەکەی لە حکومەتی بگەیەنین کە ئەوانە مامۆستان و بە ئیشی سەرژمێری ڕۆیشتوون و ڕێیان ونکردووە. وابوو کێشەکە حەل بوو. دوایە ئێوارەکەی، لەگەڵ برادەران کۆبووینەوەو باسی ئەو ڕووداوەمان دەکرد کە چۆن ئەمن فریایانکەوتووم! گوتم: "وەڵا ئەگەر ئەمن نەدەبووم و فریایان نەدەکەوتم، زیادیان دە...ا!" مامۆستا زیادیش، نەیهێنا و نەیبرد گوتی: "جا دۆستایەتی بۆ شتێکی وا نەبێ بۆچی چاکە؟! ئەرێ وەڵا سەلیم بووە بەلاگێڕی من و ئەویان...ا لەباتی من!"

* جارێك، ئەمن و مامۆستا غەریب و مامۆستا زیاد لە ڕانیەوە دەگەڕاینەوە قەڵادزێ، کە گەیشتینە پردی تووەسووران، دیتمان لەمسەر و ئەوسەری پردەکەی، خێوەتی

---

١ – سەلیم ڕەسووڵ سەلیم: لە ساڵی ١٩٤١ لە شاری قەڵادزێ لەدایك بووە، دەرچووی خانەی مامۆستانی سلێمانی، دانیشتووی شاری سلێمانییە، یەکێك بووە لە هاوپیشە و هاوڕێ نزیکەکانی مامۆستا زیاد.
ڕێکەوتی ٢٠٢١/٣/١٨ لە سێ پەیوەندیی تەلەفۆنیدا کۆمەڵێك قسەمان کرد و بەڕێزیان باسی لە پەیوەندیی نێوان خۆی و مامۆستا زیادی کرد و ئەو سێ ڕووداوەی بۆ گێڕاینەوەو گوتیشی کە کاتی خۆی زۆر بەزم و ڕووداوی خۆش لە بەینماندا هەبووە، زۆر بەداخەوە شتم زۆر لەبیر نەماوە. (ئامادەکاران)
هەر ئەو ڕووداوە خۆشانە، کاتی خۆی مامۆستا زیاد و هەروەها دواتر مامۆستا غەریب پشدەریش، بۆیان گێڕاوویننەتەوە.

عەسکەرانی لێهەڵدراوە. مامۆستا غەریب ویستی قۆشمەیەکی لەگەڵ زیادی دروست بکات و بەزمی پێبکا، ڕووی تێکرد و گوتی: "زیاد! بەخۆڕایی ئەو پردەت بەکرێگرت!!"[1] مامۆستا زیادیش تێگەیی مەبەستی لە چییە، بەزمەکەی خستەسەر من و گوتی: "دانیشە بێئەقڵ! جا خۆ ئەمن هەر دەمزانێ عەسکەری دێتێ، حەفتێك لەوەی پێش دابوومەوە سەلیمی، ئەو لێی کڕیمەوە!"

١ – زۆر جار لەنێو گفتوگۆی بە قۆشمە و گاڵتەوگەپدا، بنپرد یا ژێر پرد، بە ماناو تەوسەوە بۆ کاری خراپ بەکاردەهێنرێت. لێرەشدا بە قۆنتەراتگرتنی پردەکە، هەر بەو مانایە و بۆ گاڵتە و پێڕابواردن بەکارهاتووە. (ئامادەکاران)

## سروەی کچی[1]

جارێك بابم، تاقیکردنەوەی زارەکی تەلەبەکانی دەکا. تەلەبەیەك دێتە ژووریّ و دەڵێ مامۆستا ئەمن شیعرێکی خۆمت بۆ دەڵێم. ئەویش کە بۆ خۆی ئەهلی ئەدەب بووە و زۆری حەز لە شیعر کردووە، زۆر پێی خۆش دەبێ کە دەبینێ یەك لە تەلەبەکانی حەزی لە شیعرە و لە ئێستاوە خەریکی شیعر نووسینە، دەڵێ: دەی، وەڵا زۆرم پێ خۆشە. تەلەبەکەش دەست پێدەکات:

گوارەم خۆش ناوێ کە دێت و دەچێ

شێوەی لە پەتی سێدارە دەچێ

و... تاد

دیارە ئەو شیعرە هی بابم خۆیەتی و بەنێو خەڵکیدا بڵاوبۆتەوە، لەبەرخۆیەوە دەست دەکا بە پێکەنین و بە تەلەبەکەی دەڵێ: بابە گیان ها ئەوە ٢٠ دەرەجەکەی خۆت و، شیعرەکەی خۆم وێدەوە!

## هێمنی کوڕی[2]

* دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥، لەسەر سیاسەت و کوردایەتی، لەگەڵ مامۆستا عەلی میرزای هاوڕێی، بۆ یەکێك لە ناحیەکانی پارێزگای عەمارە نەفی کرابوو. ڕۆژێك، یەکێك لە پیاوە ناسراو و سەرۆك هۆزەکانی ئەو سنوورە، کە دەزانێ ئەوانە لەسەر سیاسەت لە وڵاتی خۆیان دوورخراونەتەوە، دەچێتە لایان و زۆر ڕێزیان لێ دەگرێت و ئێوارەیەك بە خۆشی ئەوان، خەڵکی ناسراو و کاربەدەستانی ناحیەکە خڕدەکاتەوە و داوەتێك سازدەکات. پاش نانخواردن، کابرای سەرەکهۆز، ڕوو لە بابم دەکات و دەڵێت: لە وڵاتێك کە نەتەوەی جیاوازی تێدا بژیەت، هەمیشە نوکتە و قسەی خۆشیان لەسەر یەك هەیە، ئەگەر ئیجازە بفەرمووی، ئەو برادەرە هێندێك قسەی خۆشی لەسەر کورد هەیە، دەیەوێت بیگێڕێتەوە.

بابیشم دەڵێت، ئاساییە، با بڵێت!

کابرا دەست پێدەکات و نوکتەی زۆر لەسەر کورد دەگێڕێتەوە و مەجلیس هەموو زۆر پێدەکەنن. پاشان کابرا ڕوو لە بابم دەکات و دەڵێت: ئێمە جیاواز لە هەموو خەڵکی، دەتوانین سێ شووتی هەڵبگرین: شووتیەك لە بن ئەو باڵەمان و شووتیەك لەبن ئەو باڵەمان دەنێین و یەکێکیش دەخەمە سەر چەفتە و عەگالەکەم، ئەدی ئێوەی کورد دەتوانن چەند

١ – سەرچاوە: سروە زیاد، کچی مامۆستا زیاد.

٢ – سەرچاوە: هێمن، کوڕی مامۆستا زیاد

شووتی هەڵبگرن؟

بابیشم لە وەڵامدا گوتبووی: ئێمە پێنج شووتی!

مەجلیس هەموو بێدەنگ دەبن و وەڵامەکەیان زۆر پێ سەیردەبێ، سەرۆك عەشیرەت بە سەرسوڕمانەوە دەڵێـت: چۆن؟؟!

بابم دەڵێ: کاکە، یەکێك دەخەمە بن ئەو باڵەم و یەکێك لە بن باڵەکەی دیکەم و ئەو برادەرە عەرەبەش بە سێ شووتیەکەیەوە دەخەمە سەر کێرم، ئەوە دەبێتە پێنج شوتی!

* هەر لەو ماوەیەی کە لە عەمارە بووە، شەوێك لەگەڵ چەند عەرەبێکدا دەبێـتە شەڕەقسەیان، لەسەر ئەوەی کە ئایا کورد لە کەر کەرترە یان عەرەب؟ عەرەبەکان دەڵێن: کورد زۆر کەرە، کاتێك پێیان دەڵێی گوێی ڕاستت لە کوێیە؟ دەستی چەپی بە پشت سەریدا دەبات و گوێی ڕاستی دەگرێت و دەڵێت ئەوەتا[1]!

مامۆستا زیادیش دەڵێت: ڕاست دەکەن، کورد زۆر کەرە، هەتا خودا خۆی لە قورئاندا دەفەرموێت: "انا انزلنا قرانا کردیا لعلکم تعقلون".

عەرەبەکان دەڵێن: مامۆستا تۆ غەڵەتی، وانیە، دەفەرموێت قرانا عربیا!

مامۆستا زیادیش دەڵێت: ئێ، کە وایە خوا بە گەورەیی و زانایی خۆی دەزانێت ئێوە کەرترین میللەتن لەسەر زەوی، ئیدی بۆ دەتانەوێ ئینکاری بکەن!

---

١ – ئەو دوو نوکتەیە، لەو نوکتانەن کە عەرەب و کورد، لە ڕووی نەتەوەپەرستییەوە و لەمێژووی دوژمنایەتیی خۆیاندا، لەسەر یەکترییان دروستکردوون، یانی نوکتەکە پێشتر هەبووە و هی خودی مامۆستا زیاد نییە، بەڵکو ئەو، بەس گێڕاویەتەوە. (ئامادەکاران)

## دڵشادی مەلا عەولاّ[1]

* دۆستێکمان، لە کاتی هەڵواسینی لافیتەدا لە ڕانیە، لەسەر عامودی کەوتبووە خوارێ، حاڵی زۆر خراپ بوو، بەپەلە بەڕێیان کردبوو بۆ سلێمانی، بەمنیان گوت سەربەست دەمرێ، ئەمنیش ئهمالم کرد و سەردانم نەکرد، لەپڕ ڕۆژێك لەلای مەکتەبەی گشتی ڕانیە (ئەوکات مەکتەبەی گشتی، لەنێو بازاڕ بوو) تووشی بووم، چاك ببۆوە، چۆنی چاکیم لەگەڵ کردو، گوتم: یاخوا، ئیزرائیل خەجاڵەت بێت، وەکو لەکن تۆ خەجاڵەتی کردم! ئەویش گوتی: بۆ مامۆستا؟ بمردمایە[2]!

* لەکاتی گرانیەکەیدا، دوای ڕاپەڕین، ماڵم لە قەلاّدزێ بوو، شەوێ منداڵ لە ماڵێ نەبوون، کارەباش نەبوو، چراشم کوژاندبۆوە، شەوێ درەنگ وەختێك بەخەبەر هاتم، دەنگی قاپ و کەوچکان دەهات، کە یەکێك شەقیان تێهەڵدەدات. حاڵی بووم کە دزەو هاتووە لە شتی دەگەڕێ، هیچ خۆم، تێك نەدا هەر لەنێو جێیرا، گوتم: هۆ کاکە، ئەوەی ئەتۆ بە شەوێ تاریك لێیدەگەڕێی، ئەمن بە ڕۆژی ڕووناك نایبینمەوە! کابرا کە گوێی لێم بوو، بەتوندی دەرگاکەی پێوەدایەوەو ڕۆیشت... بۆ بەیانی چوومە نێو بازاڕی قەلاّدزێ، تەماشای ئەملاولام دەکرد، داخۆ بزانم کەسێك بەرەو ڕووم نایە پێبکەنێ، بڵێم: ئەوە کاکی دزەی شەوێیە.

* دەچووم بۆ هەولێرێ، چوومە گەراجی، تەکسیەکی لێبوو، هیچ نەفەری نەبوون، سایەق تەکسی گوتی: مامۆستا با بڕۆین، گوتم: تۆ هەر یەك نەفەرت هەیە، کوا بۆ نەفەرێکی دەچیە هەولێرێ! سایەقەکە گوتی: لە حاجیاوایە ژن و مێردێك تەلەفۆنیان بۆ کردووم، کە ئەوانیش بۆ هەولێرێ دێن، کە سەرەم هات، شوێنیان بۆ بهێڵمەوە و، لەگەڵ خۆم بیانبەم. گوتم: باشە با بڕۆین. چوینە حاجیاوایە، بەردەمی ماڵێ کابرای، ژن و پیاوێك هاتنەدەرێ، گوتمان با بڕۆین، لەو کاتەیدا، منداڵێکی ئەو ماڵەی، ڕایکردە ئەوبەر جادەکەی، کابرا بانگی

---

[1] - دڵشادی مەلا عەولاّ: دڵشاد عەبدوڵلاّ عومەر، ناسراو بە دڵشادی مەلا عەولاّ، لە دایکبووی ١٩٧٦ گوندی مەرگە - ناحیەی بنگرد، دانیشتووی قەزای ڕانیە.

[2] - ئەو نوکتەیە، لە بنەڕەتدا نەزیلەیەکی کۆنی کوردەوارییە، دروستکراوی مامۆستا زیاد خۆی نییە، بەڵکو ئەو، هەر وەك نەزیلە هێناویەتیەوە و گێڕاویەتیەوە. پێشتریش، ئەسڵی ئەو نەزیلەیە، لە کتێبی (قوتووی عەتار - قوتووی یەکەم)دا بڵاوکراوەتەوە. قوتووی عەتار، قوتووی یەکەم، ئارارات ئەحمەد، لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، ٢٠٠٤ سلێمانی. (ئامادەکاران)

کردەوە، گوتی: وەرە ئوسامە، وەرەوە ماڵێ، ئێمە دەڕۆین، ئەمنیش گوتم: ئەوە ناوی چیە؟ گوتی: ناوی ئوسامەیە! گوتم: دەك عەمری درێژ نەبێت، بۆ خۆی و ناوی! ئوسامە ناوە!؟ لەو هەموو ناوە کوردیە ناوت ناوە چی! کابرا تووڕەبوو، پێکداچووین... سایەق تەکسیەکە گوتی: مامۆستا با بڕۆین، شەرتبێ مادام هێندە ناپیاوە، ئەمنیش لەگەڵ خۆمی نابەم، بەتەنێ لەگەڵ سایەقی ملمان لێنا بۆ هەولێرێ.

* بۆ عەمەلیاتی چاوم، چوومە ئێرانێ، وەختی سەرەهاتنێ، دکتۆر گوتی: ئێرە ئیمزاکە، گوتم: بۆ؟ گوتی: کوێربوونێکە، سەرنەکەوتنێکە، لەو بابەتە! ئەمنیش گوتم: جا ئەگەر کوێر بووم باشتریش، ئیسراحەت دەکەم، خۆ هیچکە ئەو دزو حیزانەی وڵاتی خۆمانی پێنابیم کە لەو خەڵکە ڕەشو ڕووتەی هاڵاون! دکتۆر زۆری پێ سەیر بوو، کەوتینە پێکەنین.

* ڕۆژێك مامۆستا زیاد لە ماڵی خۆیانەوە دەیویست بێتە بازاڕی، ئەمنیش تووشی بووم، سەیارەکەم بۆ ڕاگرت، لەدواوە سەرکەوت، توزێك سەریع بووم، لە تاسەیەکم دا، مامۆستا سەری بە سەقفی سەیارەکەی کەوت، زۆر تەریق بوومەوە، گوتم: مامۆستا خەجاڵەتم، گوتی: وەڵڵا خەجاڵەتیی ناوێ، ئەمن تاوێکی کە دادەبەزم، بەڵام لەبەر سایەرەکەی وا مەڕۆ!

## ڕێزلێنانی ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد
۲۰۰۸/۱۱/۲

دوای شەش ساڵ لە دروستبونی پەیوەندیی لەنێوان مامۆستا زیاد و ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد و بە چاپگەیاندنی چوار تا پێنج کتێبی تایبەت و دەگمەن لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆر، ئنستیتووت و بەتایبەتیش مامۆستا مەزهەری خالقی، لە مانگی ۱۰ ی ۲۰۰۸ بڕیاری دا کە ڕێوڕەسمێکی ڕێزلێنانی بۆ ئەنجام بدات و ڕێزلێنانەکەش هەر لەو شارە بێت کە مامۆستا زیاد ساڵانێکی زۆر خزمەتی ئەدەبی و مامۆستایەتی و سیاسیی تێدا کردووە و ژیانی کۆمەڵایەتیی لێبەسەربردووە، ئەویش کە شاری قەڵادزێیە. پاش تاوتوێکردنی بابەتەکە، بڕیاردرا کە مەراسیمەکە لە ۲۰۰۸/۱۱/۲ ئەنجام بدەن و خشتەی کارەکەش بەوشێوەیە بێت:

سەر لە بەیانییەکەی، لە هۆڵی دارەشمانە دوو چالاکی بەڕێوە چوو:

یەک/ نمایشی جلوبەرگی کوردانی خۆراوا – (ساڵح حەیدۆ) کە هاوکارێکی چالاکی ئینستیتیووت و نوسەر و فۆلکلۆریستێکی بەتوانای خۆراوای کوردستانە، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کە بەهۆی دۆخی نالەباری سیاسیی ئەوێ، پەڕاگەندەی باشوور ببوو و لە سلێمانی گیرسابۆوە، بەردەوام سەردانی ئینستیتیووتی دەکرد و پێی لێنەدەبڕی، کۆمەڵێک کتێبی فۆلکلۆریی ئامادەکرد و بەچاپی گەیاندن.

هاوکات لەگەڵ ئەو ڕێزلێنانەی مامۆستا زیاددا، ئەویش کۆمەڵێک شێوازی جۆراوجۆری جلوبەرگی ژنانە و پیاوانەی ئامادەکرد و ئەو ڕۆژە لەوێ نمایشکران و جێگەی سەرنج و تێڕامانی بینەران بوون.

دوو/ هەر ئەو سەرلەبەیانییە و لەلایەکی هەمان ئەو هۆڵەوە، کۆمەڵێک لەو کتێب و بەرهەم و ئەلبوومانەی کە ئینستیتیووت لە تەمەنی پێنج ساڵەی خۆیدا چاپیکردبون، نمایشکران و ئەوانیش سەری ڕەزامەندی و ئافەرینیان بە ئامادەبوان لەقاند و سەرسامییان دەربڕی بەوەی کە ئێستا دەزگایەکی ئاوا خەمخۆر لە کوردستانی باشوور بوونی هەیە، کە پێشتر دەزگای لەو شێوەیە و بەو بەهرە و چالاکییەوە نەبووە!

دوانیوەڕۆکەی، لە هۆڵی تیپی نواندی قەڵادزێ:

یەک/ دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژیش، لە هۆڵی تیپی نواندنی قەڵادزێ، ڕێوڕەسمی

ڕێزلێنانی ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد بۆ مامۆستا زیاد، بەڕێوەچوو، خشتەی مەراسیمەکە بەمجۆرە بوو:

* سەرەتا وتەی پێشکەشکاری کۆڕی ڕێزلێنان و نرخاندنی کارە فۆلکلۆرییەکانی مامۆستا زیاد و ئینستیتیوت.

* دواتر وتەی مامۆستا مەزهەری خالقی، کە بەگشتی لەسەر کەلتووری کورد و خەمخواردن لە کۆکردنەوە و پاراستنی ئەو سامانە نەتەوەییەی میللەتەکەمان و، پەیوەندیی مامۆستا زیاد و بەرهەمەکانی بە ئینستیتیووتەوە بوو. هەروەها گرنگی و پێگەی دەزگای ئینستیتیووتی ڕوونکردەوە، وە ئەوەی خستەڕوو کە ئەرکی هەر تاکێکی ڕۆشنبیر و نوسەرە کە بە هەرشێوەیەك کە لە دەستی دێت، ئەو کەلتوورە لە فەوتان ڕزگاربکات...

* دوای ئەوە، مامۆستا غەریب پشدەری، کە لەگەڵ مامۆستا زیاددا، مێژوویەکی دوور و درێژ هاوڕێی گیانی بە گیانیی یەکتری بوون، لایەکی دیکەی مەراسیمەکەی ڕۆشنکردەوە و بە گێڕانەوەی کۆمەڵێك قسە و ڕووداوی خۆش و گەپئامێزی بەینی خۆی و مامۆستا زیاد، خۆشیی خستە دڵی ئامادەبوانەوە.

* لە دوابەشی مەراسیمی ڕێزلێنانەکە، مامۆستا زیاد وتە و سوپاسگوزاریی خۆی بۆ مامۆستا خالقی و دەزگای ئینستیتیووت و ئەو هاوڕێ و هاوشاریانەی کە لەوێ ئامادەببون، دەربڕی و کورتەباسێکی لەمەڕ کاری ئەدەبی و کۆکردنەوەی ئەو فۆلکلۆر، پێشکەشکرد و دوای ئەوەش کۆمەڵێك لە دۆستا و ئاشنا و هاوشاریانی مامۆستا زیاد، دیاریی ڕێزلێنانی تایبەت بە خۆیان پێشکەشی مامۆستا زیاد کرد.

ئەو کۆڕی ڕێزلێنانە، لەلایەن مامۆستا عەبدوڵڵا ئەحمەد بەڕێوەچوو.

دوو/ لە بەشی دووەمی بەرنامەی دوانیوەڕۆی ڕێزلێنانەکە، فیلمی دیکۆمینتاری (ماشە)، کە بەرهەمی ئینستیتیووت بوو و م. ڕێبوار جەمال، کە نوێنەری ئینستیتیووت بوو لە پشدەر، ئامادەی کردبوو، پێشکەشی ئامادەبوان و بینەرانی مەراسیمەکە کرا.

ماشە، شێوازێکی کلاسیکیی ڕاوکردنی ماسییە، بە چەپەر و کەرەستەی لە شوڵچنراو، کە کاتی خۆی لە هێندێك شوێنی کوردستان و، لە نێوانیشیاندا پشدەر، باو بووە.



مەزڵوم دۆغان، کارمەندی ئەوکاتەی ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد، خەڵکی باکور، م. زیاد



عەبدوڵڵای محامی (بەڕێوەبەری کۆڕی مەراسیمەکە)، ئارارات،
م. مەزهەری خالقی، م. ڕێبوار بەکرەجۆیی

# ڕێزلێنانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ - لقی ڕانیە
## ٢٠١٣/٥/٢

بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ – لقی ڕانیە، وەك بەشێك لە چالاکییە ئەدەبییەکانی خۆی، ڕێکەوتی ٢ی ئایاری ٢٠١٣ مەراسیمێکی ڕێزلێنانی بۆ مامۆستا زیاد، وەك نوسەرێکی دیار و کەسایەتییەکی خەمخۆری بواری کەلەپوور و فۆلکلۆر، لە شاری ڕانیە و لە هۆڵی پێنجی ئازار، سازکرد.

خشتەی ڕێوڕەسمی ڕێزلێنانەکە، ئەمانەی لەخۆگرتبوو:

- سەرەتا عومەر حاجی، بەرپرسی بنکەی گەلاوێژ لە ڕانیە، وتەیەکی بۆ ڕێوڕەسمەکە و کەسایەتیی مامۆستا زیاد، پێشەکەشی ئامادەبووان کرد.
- هونەرمەند و ئەکتەر ئاسۆ عومەر سوارە، وەك نمایندەی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ – سلێمانی، وتەی بنکەی گشتیی خوێندەوە.
- مامۆستا غەریب پشدەری، هاوڕێ و نزیکی مامۆستا زیاد، لە قسەیەکی تایبەتدا، وێڕای تاریفێکی جوانی کەسایەتیی مامۆستا زیاد، باسی لە نێوان و هاوڕێیەتیی خۆی و مامۆستا کرد و لەگەڵیشیدا کۆمەڵێك بەسەرهاتی گاڵتەوگەپئامێزی گێڕایەوە و مەراسیمەکەی تەڕوپاراوکرد.
- بوار نورەدین سابیر، بە بابەتێك بەناوی (قەڵەمێکی سەوزی پاییزی) کە قسەوباسێکی شیکاری بوو لەسەر چەند کتێب و بەرهەمێکی مامۆستا زیاد و بەتایبەتییش (دیوانی عەلی بەردەشانی) پێشکەشکرد.
- ئارارات ئەحمەد، وەك نوێنەری ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد لە نێوچەی بیتوێن، وتارێکی بەناوی ئینستیتیووتەوە خوێندەوەو تێیدا ئاماژەی جوانی بە کەسایەتیی و خزمەتی گەورە و لە نرخ نەهاتووی مامۆستا زیاد دابوو.
- پاشان هەریەك لە بەڕێزان: ئاسۆ عومەر سوارە، خەڵاتێکی ئاڵتوونیی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیریی گەلاوێژ – سلێمانیی و، هەروەها شاعیر و نووسەر ئیسماعیل ڕاجی، شاعیر و وەرگێڕ خالیدی فاتیحی، سەرپەرشتیاری بواری پەروەردە مامۆستا شۆڕش عەزیز نەجیب، شاعیر و نوسەر سروە ئەحمەد (سروە مەرگەیی)، مامۆستا ئاشتی حەمە عەلی، مامۆستا غەریب پشدەری، خەڵاتی خۆیان وەك ڕێز و ستایشی خزمەتە گەورەکانی، پێشکەشی مامۆستا زیاد کرد.

- له کۆتایی مەراسیمەکە، مامۆستا زیاد خۆی وتەیەکی پڕ لە سوپاسگوزاری و خۆشەویستی بۆ ئامادەکارانی ڕێزلێنانەکە و ئامادەبووان و هەموو ئەوانەی کە خەڵاتیان پێشکەشکرد، پێشکەشکرد و کۆمەڵێك قسەی خۆش و گاڵتەوگەپی گێڕایەوە.



بوار نورەدین



م. زیاد، ئاسۆ عومەر سوارە



م. زیاد، خالید فاتحی



م. زیاد، سروه ئەحمەد مەرگەیی

## کۆڕیاد
**٢٠١٧/٤/٢٧**

**وتەیەک:**

ڕۆژی ٢١ ی ٣ ی ٢٠١٧ مامۆستا زیاد کۆچی دوایی کرد و بەیەکجاری بەجێیهێشتین.
لە چلەمینرۆژی ماڵاواییدا، بۆ شادکردنی ڕەوانی ئەو پیاوە شیرین و هەمیشە حازرەی نێو دڵودەروون و زەینمان، خانەوادەکەی، ڕۆژی ٤/٢٧ لە هۆڵی پێنجی ئازار لە ڕانیە، کۆڕیادێکی شکۆدار و شایستەیان بۆ ئامادەکرد. بۆ ئەو کۆڕیادە، جگە لە دۆستان و هاوڕێ و کەسانی نزیک بە مامۆستا، کۆمەڵێك کەسایەتیی ئەدەبی، هونەری سیاسی بانگهێشت کرابوون و تێیدا ئامادەبوون و وتەی تایبەتی خۆیان پێشکەشکرد، لەو کەسایەتییانەش: مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەنزادە، مامۆستا مەزهەری خالقی، مامۆستا غەریب پشدەریی شاعیر، دکتۆر جەعفەر عەلی و خاتوو ڕووناك فەرەج.

لە کۆڕیادەکەدا چەند پارچە میوزیکێك پێشکەشکران و لە کۆتاییشدا ٦٩ مۆم بۆ ڕەوان و تەمەنی خاوێن و بێگەردی مامۆستا زیاد، داگیرسان و کۆمەڵێك لەو کەسایەتییانەی کە لە ژیانی هاوڕێیەتیدا لێیەوە نزیك بوون، مۆمەکانیان خامۆشکردن.

هەر لە کۆڕیادەکەدا، ئینستیتیوتی کەلەپووری کورد، ژمارەیەکی زۆر لە هەموو کتێبە چاپکراوەکانی مامۆستای لەوێ نمایشکرد و ئامادەبوان و بەشداربووان، بە دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی پەرۆشییەوە، وەریانگرتن.

## مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەنزادە
## (هاوڕێی مامۆستا زیاد)

ڕەنگە، دۆستانی مامۆستا زیاد زۆرین لێرە، کە لە بارەی مامۆستاوە قسەی بە کەڵکتر و بەپێزتر بکەن، بەڵام ئەمن کە ئێستا هاتومە ئێرە، پێم خۆشە شتێك بڵێم کە ڕەنگە بۆ ئێوە مەترەح نەبێت، زیاتر بۆ من و ڕەفیقەکانی من مەترەحە. ئێمە لە وڵاتی خۆمانین، بەڵام لە عەینەن حاڵدا کوردی غەریب و دوور وڵاتین، چونکە بمانەوێت و نەمانەوێت ئێستا وڵاتەکەمان دابەشکراوە. مامۆستا زیاد، پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵ ئێمە هەبوو، بیرەوەری زۆر شیرینی لای ئێمە هەیە، لەگەڵ زۆربەمان دۆست بوو، ئەوە قیمەتی خۆی هەیە، چونکە دۆستایەتی، گەورەترین دیارییە کە ئینسان دەیدا بە ئینسان، بەڵام لەلای من ئەو دۆستایەتییە، قیمەتێکی لەوە بەرزتری هەبوو. مامۆستا زیاد، دۆستایەتی ئێمەی دەکرد لەبەرئەوەی کوردی بەشێکی دیکەی کوردستانین، یەعنی ئەوە لەو کاتەدا کە دۆستایەتی و هەستی عاتیفەی ئینسانی بوو، شتێکی لەوە بەماناتری تێدابوو کە ئەویش هەستێکی نەتەوایەتی قوڵی تێدابوو کە دەبێت هەموو بەشەکانی دیکەی کوردستان بۆ یەکتریان هەبێت. بەخۆشحاڵیەوە مامۆستا زیاد لەنێو ئەوانەی کە کۆچیان کردووەو، ئەوانەش سوپاس بۆ خوا لە ژیاندا ماون، تەنیا نەبوو، بەڵام لەعەینەن حاڵدا ئەوانە ڕەنگە بەداخەوە بڵێم کەسانێکی دەستبژێرن، هەر لەنێو کوردانی باشووردا وانیە، لەنێو بەشەکانی دیکەی کوردستاندا ڕەنگە ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە لە ئەقەلیەتن.

باسێکی دیکە کەپێم خۆشە لێرەوە عەرزی بکەم، زۆر پەیوەندی بە مامۆستا زیادەوە نییە، بەڵام لە عەینەن کاتدا لەو پەیوەندەدا هەندێ کار کراوە، ئەمن یەکەمجارە کە لێرەدا کۆدەبینەوە لە مەجلیسێکی ئاوادا گوێم لە ماتەمگێڕانی خۆشەویست نابێت ناڵێن کۆڕی ماتەمی کۆچکردوو، کارێکی یەکجار باشە، هەر پێم ناخۆشبوو گوێم لە چلەبوو، چلە، نە هی کوردە و نە هی سونیە. کە ئێمە هەم کوردین هەم سونیین، چلەمان بە دیاری بۆ هاتووە، نەشهاتووین ماتەم بگێڕین، هاتووین ڕوحی لە دەستچوەکەمان شاد بکەین وە یادەکانی لە دڵی خۆماندا زیندوو بکەینەوە، هێمنی شاعیر دەڵێت:

"کـیـژو کـوڕ بـگـرن لـە دەوری گـۆڕی هێمن ڕەشـبـەڵـەك
مـن کـە شـیـنـگێڕی شـەهـیـدانم، لـەکـوێ شینم دەوێـت!"

چەند ناخۆشە لێرە هەر دەڵێی لەسەر گۆڕستان دانیشتوین! دێ زەحمەتێکی زۆری کێشاوە، شتی زۆر جوان پێشکەش دەکات، بەڵام چەپڵەی بۆ لێنادەن. ئەو نۆستە کە ئەو شیعرە یان ئەو گۆرانیەی مەوردی پەسەندی مامۆستا زیادی لێدا[1]، زۆر جوانی پێشکەشکرد، بەڕاستی ئەمن لەخودی مامۆستا زیادی ڕەحمەتیم بیستووە، ئەویش هەروا خۆشی دەگوت. هەرچەندە دەنگی ئەو لاوە، سازترە لە هی ئەو، بەڵام بۆ دەبێت تەشویق نەکرێت لە جێگەیەك یان لەسەر قەبران لە ڕۆژی تازیەدا کەسێك قسە دەکات تەقدیری لێدەکرێت.

خۆ چەپڵە هەڵپەڕین نییە، چەپڵە، تەقدیرە لەو قسانە، لەو مەتڵەبانە، کە ئەوەی پشتی میکرۆفۆن تەقدیمی دەکات بەوانەی کە مخاتەب نین، داوای لێبوردن دەکەم کە ئەوە لای من نەریتشکێنی بێت کە ئەو داوایە دەکەم، بەڵام بەڕاستی ئەمن ئەوەم هەر لە باشوردا دیووە، ئارەزوو دەکەم ئەوە کە یەکەمینجار بێت و ئاخرجاریش بێ، یەکەمینجار بێت کە کۆڕیادمان ناوبردووە لەجیاتی کۆڕی ماتەمین، ئاخیرجاریش بێت کە گوێمان لە کۆڕی ماتەمینی یان لە چلەی ماتەمینی عەزیزی لە دەستچومان بێت... زۆر سوپاستان دەکەم داوای لێبوردن دەکەم.

---

١ – لە کۆڕیادەکەدا، چەند موزیکژەن و هونەرمەندێکیش ئامادەبوون، یەك لەوانە، کەمال ئەحمەد بوو، گۆرانیی (چەهچەهەی بولبول)ی هونەرمەندی دەنگخۆش (تاهیر تۆفیق)ی خوێند، کە ڕەوانشاد مامۆستا زیاد خۆی زۆر حەزی لەو گۆرانییە بووە. جا مەبەستی مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەنزادە، لەو گۆرانییەیە. (ئامادەکاران)

## مامۆستا مەزهەری خالقی
## (سەرۆکی ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد)

بەڕێزان، بەڕاستی ئاسان نییە کە من لە خزمەت مامۆستایانی گەورەی ئەدەب و فەرهەنگی کورد کە لێرە دانیشتوون، باسێك یان تەعریفێك لە نەوعی زانست و ئەدەب و فەرهەنگی مامۆستای بەڕێز وە گەورەی ئەم دەڤەرە وە هەتا کوردستان، کە ئەمڕۆ بەداخەوە لەگەڵی نیین، وە قەد بیرم نەدەکردەوە کە ئەمڕۆژە لە عومرم ببینم، چونکە خیلافی عومرمان زۆر نیە. من حەزدەکەم هەندێ بیرەوەری زۆر کورتم هەیە باسی بکەم بۆتان: ساڵی ٢٠٠٥ بوو کە (مامۆستا ئارارات) و هەروەها نوسەرو لێکۆڵەر کاك (کاك بوار) باسی ئەو بەڕێزەیان کرد وە ئێمەش بە نامەیەك دەعوەتمان کرد کە بێت زیارەتی بکەین لە بنکەکەمان. پاشان کە هات هەر لە لەحزەی ئەوەڵەوە ئەوەندە خۆشەویست و میهرەبان و ڕوومەت گەش بوو، کە وەکو شتێك کە ساڵەهایە ئەیبینم ئاشنایین لەگەڵی، دوایی باسی خۆی بۆ کردم کە چ مەینەتگەلێکی کێشاوە، وە ماوەیەکی زۆر دوور خراوەتەوە، لەکوێ بووە، وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی کە زۆر بۆ من موهیم بوو ئەیوت کە من لە مەنفابووم ئەوەی لەگەڵم بوو کۆمەڵێ یاداشت بوو کە لە توڵ عومرما ئەوانەم هەموو کۆکۆدبۆوە، بەقسەی ئەو، وەختێ لە هەر کۆڵان و گەڕەکێك و مەجلیسێك دانیشتووە، ئەوەی وا بەدڵی بووە، ناوازە بووە، موهیم بووە، ئینسانی بووە، کوردەواری بووە، بۆ کۆمەڵگاکەمان بەسوود بووە، هەمووی یاداشت کردووە، وە ئەو یاداشتانەش لەگەڵ خۆی بردووە بۆ ئەو شوێنەی کە نەفی کراوە، ئەیوت لە گیانی خۆم ئەترسام بەڵام کە ئەمەم پێبوو زیاتر، بەڵام هەر نەمئەتوانی لە خۆمی جیا بکەمەوە، ئەوە شتێك بوو کە بەڕاستی دیاربوو ئەو ئینسانە هەر لە ڕۆژی ئەوەڵەوە ئینسانێکە متەفەکیرە، ئینسانێکە کۆمەڵدۆستە، کۆمەڵگادۆستە، ئەوەبوو لە ماوەیەکی کورتدا کۆمەڵێ کتێبی دانسقەی بۆ ئێمە نووسی، بۆ میللەتەکەی نووسی، کە ئەو کتێبانە تا چاپی سێهەم هات، جۆرێك نەبوو کە لە بازاڕ بمێنێتەوە. وە هەروەختێ ئەهات بۆ ئەنستیوتۆ، لەوێ من غەڵبەغەڵبێکم ئەدی، چونکە بنکەکەی ئێمە زۆر جار ئیش دەکەن و ساکت و ئارامە، ئەمزانی کە مامۆستا هاتووە، دوای ئەوەی بەشەکانی ئەدیت، ئەهات بۆ لای من دائەنیشتین، هەموو غەم و ژیانی ئەوەبوو کە لەگەڵ ئەو مەوزوعە کاردەکات وەك عاشقێك باسی ئەکرد بۆم، وە هەتا باسی ئەکرد ئەو یاداشتانەی کە نوسیویەتی، وە ئەو یاداشتانەی کە کۆمەکی کردووە کە ئەو کتێبەی نوسیووە، هەڵە بووە، کەموکوڕی هەبووە، چەند گەڕاوە بە شوێنیەوە، چۆن ئەوانەی پەیداکردووە، هەمووی بەدڵ باس ئەکرد بۆم، یانی ئاشقی ئەو فکرو ئەندێشەو میهنەو نوسینەکانی خۆی بووە،

بەبڕواوە باسی ئەکرد ئەمانە ئەو شتانە بوو کە من هەموویانم وەرئەگرت وە ئیزافەم ئەکرد بەکارەکتەرو شەخسیەت و ئایدی و فکری خۆم کە منیش دەبێت وابم. ئەوە تێپەڕی. بەڕاستی، ماوەیەك نازانم دەقیقەت چ ساڵێك بوو، سەیرم کرد دیم کەسێك ڕۆژێك لە دەرگای ژووری کارەکەمی دا، بەرلەوەی هەستم بیکەمەوە، سەیرمکرد مامۆستایە، بەڵام ساکت بەبێ قسە، تەبعەن دەستم گرتو هاتە ژوورەوە فەرمومکرد لەسەر کورسیەکە دانیشێ. ماتڵی نەکرد هەر لەسەر کورسیەکەی وا بەتەنیشتمەوە بوو، دانیشت، هەر دیسان قسەی نەکرد پاش چەند لەحزەیەك وتی: "دەزانی من چیم لێقەوماوە؟" تەبعەن نازانم، ناتوانم بڵێم چی بێگومان... وتی: "من تەقاعودکراوم..." تێنەگەیشتم تەقاعودکراوم چ مانایەکی هەیە، وتم یانی تۆ لە ئیش بە فارسی پێی دەڵێن (بازنشستە) تەقاعود مەخسەدت ئەوەیە لە ماڵ ئیش دەکەی؟ وتی: "بەڵێ، چۆن نازانی؟ بەڵێ..." وتم ئەوە، ها لە ڕێگەی هەموومانە. سەرێکی لەقاند وتی: "نا من ئاشقی تەلەبەکانم..." دیسان تکراری کردەوە: "من ئاشقی کلاسەکەمم، من چۆن بەبێ مەعشوق بژیم!" من، کاتی خۆشی مامۆستا بوومە تەشخیسم دا کە چی ئەڵێت، بەڵام چون لەو وەزعیەتە دەربێنم! وتم دەی مامۆستا تۆ ئەوەی ئەڵێی ئیتر چیبکەم بێکارم، کارێکم نیە، مامۆستاکان نابینم، لەگەڵ مامۆستاکان، ئەوانیشم لەدەست دەرچووە، تەلەبەکانیشم لەدەست چووە، وتم نا، تۆ ئەو شتانەی کە تاکو ئێستا کردووتە، وە ئەو یاداشتانەی کە بووتە، هەموو ئەوانە کە دووبارە پیایدا بچیتەوە، ئەوە ئەو وەختە تۆ دونیایەکی گەورەترت هەیە، ئەو دونیا گەورە لە چوارچێوەی ژوورێکدا نیە، ئەوە دونیایەکە کە کتێبخانەی گەلەکەمان دەوڵەمەند دەکات، ئەوە بۆ سەدان ساڵی داهاتوو ئەمینێتەوە، فەرقی ئێمە لەگەڵ مەوجوداتی تری سەرئەرز ئەوەیە، بەشەر سازەندەیە، دروستکەرە، ئەمانەی ئێوە کردووتانە و دەیکەن، بینای ئەوەیە، قسەکەمی بڕی وتی تەلەبەکانیش وان، یانی هەمدیسان نەمتوانی لەم فەزایە دووری بکەمەوە بەڵام تا ڕادەیەك قەناعەتی پێهێنا، وە شایەد دوو مانگێك نەهاتەوە بۆ لامان، گوێم لە دەنگی نەبوو کە بێتە سەنتەر، دوای دوو مانگ کە هات دیم، ماچی کردم وتی: "فلانکەس!..." دەستپێك من زانیم کە مەبەستی چییە، وتی: "یاداشتەکانم دیسان دەرهێناوە خەریکم ئەنووسم!" هەر ئەو جۆرە بەو زەوقو شەوقەوە دیسان هاتەوە مەیدان، وە خۆشبەختانە کتێبگەلێکی زیاتری بۆ دروست کردین، ئومێدەوارم کە شاری ڕاپەڕین، شاری ماندونەبووی ڕاپەڕین، بتوانێ جێگرها وە کەسانی تری وەك مامۆستا بەدیبێنێ دروست بکات بەتایبەت تەلەبەکانی کە بتوانن ئەم شارە هەروا لە نیعمەتی فکرو ئەندێشەو کوردایەتی و کۆمەڵناسی و میلەتناسی بەدوورنەبێت. سوپاس

## مامۆستا غەریب پشدەری
## ( هاوڕێی مامۆستا زیاد )

ئامادەبوانی بەڕێز ئەم کاتەتان باش. لە یادبودی مەرگی تاقە خۆشەویستێکی خۆم، کە ناخۆشترین وەختەکانی ژیانی منە، بێم لە دوای مەرگی زیاد، من باسی شتەکانی زیاد بگێڕمەوە، ئەمن چاوەڕێی ئەوەی بووم، ئەو، ئەو کارەی بکردباو من لە جێگەی ئەو بومایە، بەڵام ئەو هەروەك چۆن لە سەرەتای ژیانی خۆمان لە ساڵی شەستەکان، بۆ یەکەمجار کە یەکترمان ناسی و ئەو، تازەگەنجێکی بەلەباریکەی گوپنەی چاوزیتی سوکەڵەی وەك هەلوك بوو، دەهاتو دەچوو، لە قۆناغی دوایەمین قۆناغەکانی خوێندنی خانەی مامۆستایان بوو، منیش تازە چوبومە قۆناغی یەکەم، لەوێ وەك ناسینێکی دوو هەرزەکاری دەورووبەری پشدەرێ و بەری مەرگەی، یەکترمان ناسی. ئەوان، ساڵ تێوەسوڕایەوە قوتابخانەیان بەجێهێشت و، ئێمەش یەك دوو ساڵی تر ماینەوە. دوایی، ئەزقەزا نسیبەکە وابوو کە ئێمەش دەرچووین، لەجیاتی ئەوەی لە ناوچەی دەڤەری خۆمان لە نزیك کەسوکارو ناوچەی خۆمان دابمەزرێین، وەختێکی خۆم دیتەوە، لە دەشتی هەولێرێ لە (شێخ گەزنە)ی پشتی عەنکاوەی، لە ١٩٦٢/١١/١٩ ئەمنیش لەوێ بوومە مامۆستا. لێك دابڕانێك هەتاوەکو ساڵی ١٩٦٨ کە گەڕامەوە بۆ قەڵادزێ، بۆ یەکەمجار لە (قوتابخانەی پشدەر) کە ئەوسا ڕێزدار (مامۆستا کاکەسوار) بەڕێوەبەری قوتابخانەبوو، لەوێ هەموو لە هەموو، یەکترمان گرتەوە، ئاشنایەتیە سەرەتایەکەمان وورده وورده بوو بە دۆستایەتیەکی نزیك لە یەك و، ئەوجا بوو بە برایەتیەکی پتەوی ئەوتۆ، کە بۆ هەتاهەتایە تا ئەو کاتەی منیش هەناسەی خۆم دەسپێرم، هەروەك ئێستا پارێزگاری لەو کەسایەتی و برایەتی و دۆستایەتیی ئەو زاتە دەکەم، چونکە ئەگەر وەکو مامۆستا باسی بکەم دەتوانم دەستی ئەوەی بۆ لە ملی بدەم یەکێك بوو لە نمونەی هەرە مامۆستا چاکەکان، بەتایبەتی مامۆستای قوتابی پۆلی یەکەم کە ئەلف و بێی دەگوتەوە. ئەگەر قوتابیەکانی تا نیوەی ساڵ کاغەزیان بۆ دایك و بابیان نەنوسیباو فێری خوێندنەوەو نووسینەوەیان نەکردبان، پێی وانەبوو کە کارێکی کردووە، ئەگەر دەقیقەیەك، ڕۆژێك، نەهاتبایە قوتابخانە، پێی وابوو تەواوی مووچەی ئەو مانگەی حەرام بووە، درۆم نەکردبێت دوور لە ڕووی ئێوە، زیاد ڕۆژێك لە ڕۆژان لە تەواوی هەموو خزمەتکردنی وەك مامۆستا، مەگەر نەخۆشی لەنێو جێگەی خستبێ، دەنا ڕۆژێك مۆڵەتی وەرنەدەگرت کە قوتابخانە بەجێ بهێڵت...

بەڵێ، وورده وورده منداڵ و سەلکوبنك پەیدابوون، یەکێك لە شتە خۆشەکانی ئەوەبوو، قەد مامۆستا زیاد نەهاتە دەرێ ئەگەر دوو منداڵی بەدواوە نەبایە ! ئەمن ناچارم، تازە مەیدانی

قسان هاتووه، ناتوانم نەیگێڕمەوە، هەموو جارێ کە بەدەردەکەوت دووی لەگەڵ بوون. دەمانگوت وەڵا زیاد، لا حیا فی الدین، ماینی فلانکەسیش[1] هەموو ساڵێ دوو دووان دێنێ[2]! ئەویش دەیگوت بۆ پێت وایە ئەمن لەوی کەمترم!... لەبەرئەوەی هەمیشە دوو یەخترمەی بەدواوەبوون. منداڵەکانی خۆی ئەوەندەیان بۆ دڵسۆز بوو، ئەوەندەی خۆشدەویستن، ئەو کاتانەی بێجگە لە ماڵێ بوو، دەبوو بۆ دەرێش دووی لەگەڵ بن، دەنا ئیدارەی نەدەکرد. ئیتر لە دوایی وایلێهات، ئیدی لەبەرئەوەی خێزانەکەشی یەکێك بوو لەو ڕووسورانەی کە کەسی خۆمن، تێکەڵاویەکەمان بوو بە تێکەڵاویەکی خێزانی، بەبێ یەك هەڵماننەدەکرد، زۆر کەس پێی وابوو (زیاد محەممەد ئەمین) و (غەریب محەمەد ئەمین) برای یەکن، پێیان وابوو منداڵەکانمان ئامۆزای یەکن، کەس پێی وانەبوو ئێمە برادەرین یان دۆستین، کە لە ڕاستیشدا هەروابوو... ئەگەر بێتو لەسەر مامۆستا زیاد کەمێك جڵەوی قسانی بۆ شل بکەم، نەك هەر بەوەندانە، بە دەیان ڕۆژی ئاوا، ناتوانم شتێك لەو بەسەرهاتانە بگێڕمەوە کە لە ژیانی ئەو، لە دڵسۆزی ئەو، نیشتمانپەروەریی ئەو، لە کەسایەتیی ئەو، لە دەست و پەنجەو نوکی قەڵەمە بەپێزەکەی ئەو، شتێك بڵێم، بەڵام هەر بۆ یادبوون، چەند شتێك لە زۆر شتی بەینی خۆمانی نزیك، دەگێڕمەوە بۆ ئەوەی ئەو گێڕانەوەش بێتە یادبوونێك لە بیرو یادی دانیشتن و ئەمڕۆی ئەو یادە پیرۆزەی ئەو ئینسانە گەورەیە[3].

---

١ – ماینێ فلانکەسیش: ژنێ فلانکەسیش... لە کوردەواریدا، زۆر جار بە کینایە، بە ژن (هاوسەر) گوتراوە، ماین.

٢ – هەموو ساڵێ دوو دووان دێنێ: هەموو ساڵێ دوو منداڵ دوو منداڵ دەبن، هەموو ساڵێ دوانەی دەبن.

٣ – لێرەوە دەست دەکات بە گێڕانەوەی بەسەرهاتە خۆشەکانی لەگەڵ مامۆستا زیاد، بەڵام لەبەرئەوەی کە تەواوی ئەو قسە و بەسەرهاتە خۆشانەمان، لە بەشی خۆیدا، یاداشتکردووە، بۆیە بە پێویستمان نەزانی لێرەدا دووبارەیان بکەینەوە. (ئامادەکاران)

# دكتۆر جەعفەر علی
## (هاوڕێی مامۆستا زیاد)

من ڕاستیەكەی نامەوێ زۆر بچمە نێو وردەكاری و تایبەتمەندی هاوڕێیەتی و ڕەفاقەتی ئەو ماوەیەی كە لەگەڵ مامۆستا زیاد بەیەكەوە لە (پەیمانگای مامۆستایان) مامۆستا بووین و دەرسمان گوتۆتەوە، هەوڵ دەدەم قسە لەسەر كۆمەڵێك شتی ئەو فەترەی هاوڕێیەتیەو ئەو ناسینە بكەم. مامۆستا زیاد بۆ ئێمەی ستافی پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی ڕانیە، هەرچەند بە تەمەن لە ئێمە هەڵكشاوتربوو، بەڵام دەمەوێ شاهیدی ئەوەی بۆ بدەم كە لە ڕووی ئەزموون و شارەزایی پەروەردەیی، گەلێك لە ئێمە ووردترو قوڵتر بوو، تەنانەت لە ڕووی پەروەردەی كۆمەڵایەتی و مامەڵەی تەندروست و یەكسان لەگەڵ خوێندكاراندا، زۆرێك لە ئێمە لە پێشتر بوو، وەك چۆن لەگەڵ منداڵەكانی خۆی میهرەبان بوو، بە هەمان شێوە لەگەڵ كچان و كوڕانی گەنجی پەیمانگا، هەمیشە وشەو ڕستەی میهرەبانی و خۆشەویستی دەبەخشیەوە. ئەو ڕۆژگارە، ڕۆژگاری ساڵانی سەرەتای دامەزراندنی پەیمانگا[1]، پاولۆ فرێدی بۆ من و، دڵنیام بۆ ستافی مامۆستایانی پەیمانگا ناوێكی نەناسراوبوو، نازانم بۆ ئەویش ناسراوبوو یان نا، بەڵام ئامادەبوونی مامۆستا زیاد لەنێو پەیمانگاو سیستمی پەروەردەدا، ئامادەبوونێكی فرێدیانە بوو، ڕای وابوو كە گرنگە مامۆستا لە یەك كاتدا هەم فێركارو هەم فێرخوازبێ، چونكە خوێندكاریش پێویستە لە یەك كاتدا هەم مامۆستاو هەم فێرخوازبێ، مامۆستا زیاد بەحەق فرێدی نێو پەیمانگاو نێوپەروەردەكارانی نێو ئەم سنورە بوو، بڕوای زۆری بە دایەلۆگ هەبوو، دژ بەو سیستەمی پەروەردە بوو، كە فرێدی، بە سیستەمی بانكی ستوونی ناوی دەبات، لە نێو پەیمانگاش نمونەی بەرجەستەكاری ئەو سیستەمەبوو.

مامۆستا زیاد لەنێو پۆلداو لەپەیوەندی لەگەڵ ستافی ئیداری و مامۆستاو فەرمانبەران، لە مامەڵەو ڕەفتاری لەگەڵ خوێندكاراندا، نمونەی پەروەردەكاری تەندروستی نێو سیستەمێكی تەواو ناتەندروست بوو، ئەوكاتی لەنێوان پشوی دوو وانە یان هەر دەرفەتێكیتر كۆدەبووینەوە، فۆرمی كۆبونەوەكانی لە دانیشتنێكی ئاسایی دەگۆڕی بۆ كۆڕێكی ئەدەبی و قوڵبوونەوە لەنێو دوونیای زمان و ئەلف و بێ و فۆلكلۆری كوردی. هەموومان گوێگری مامۆستایەكی قوڵ و بەتوانا و بەدەسەڵاتی نێو زمان و ئەدەبی كلاسیك دەبووین. ئەو بەزانیاری فراوانی خۆی، پەلكێشی نێو دونیای ماناكردن و لێكدانەوەی وردو قوڵی شیعری شاعیرانی كلاسیكی دەكردین. زیادەگۆیی ناكەم ئەگەر بڵێم ئەو بۆ ئێمە لە لێكدانەوەو ماناكردنی شیعری كلاسیكدا (مەلا عەبدوالكەریمی مودەڕیس) و (حەمەی مەلاكەریم) ی نەك تەنها نێو پەیمانگا، بەڵكو دەڤەرەكەش بوو. مامۆستا زیاد تا زیاتر دەسەڵاتی

[1] – پەیمانگای مەڵبەندی مامۆستایانی ڕانیە، ساڵی ١٩٩٦ دامەزرا.

بەسەر ئەدەب و فۆلکلۆردا دەشکا، خاکیترو سادەتر دەبوو، تا تەمەنی زیاتر هەڵدەکشا.
دونیابینی بۆ ژیان و پەیوەندی کۆمەڵایەتی مۆدێرنترو گەنجانەتر دەبوو. ئەو، مرۆڤێك بوو لە سیاسەتدا گەنج، لە پەروەردەدا گەنج، لە پەروەردەی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەر گەنج... چەند گەورەن ئەو مرۆڤانەی لە تەمەنێکی هەڵکشاوداو لەنێو کۆمەڵگەیەکی داخراودا گەنجانە قسە دەکەن، گەنجانەو ڕاستگۆیانە سیاسەت دەکەن، گەنجانەش مرۆڤ و ژیان و ئازادیان خۆشدەوێت و بۆ کرانەوەو ئازادی زیاتر دەجەنگن... مامۆستا زیاد بەحەق ئەو مرۆڤە گەورەیەی نێو ئەو دونیابینی و فەزا گەنجانەیەبوو، مرۆڤەکان لە هەر بوارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کاربکەن، زۆر کات هەڵگری جۆرێك لە سەرسامین بەکەسایەتیەکی تایبەت و دیاریکراوی دەرەوەی خۆیان، وە تا نمونەی باڵای خۆیان هەیە، لە ئاستی شەخسیدا، ئەگەر لەبواری فەلسەفەی مێژودا بۆ من (هیگل و تۆینبی) نمونەی باڵا بن، ئەوە وەك چەندین جاری دیکە گوتومەو ئێستاش و لەو بۆنەیەشدا جارێکیتر دەیڵێمەوە و دەڵێم مامۆستا زیاد لە بواری پەروەردەو پەروەردەی کۆمەڵایەتیدا نمونەی باڵا بووە بۆ من و هەرئاواش دەمێنێتەوە...

ماڵاوا هاوڕێ و مامۆستای ئەزیزم، سڵاو بۆ ڕوحی جوانت، سڵاو بۆ ڕوحی پڕ لە ژیان و مرۆڤدۆستیت، تۆ جوان هاتی، جوان جێت هێشتین، هەر بەجوانیش دەمێنیتەوە، ڕوحت شاد...

## ڕووناك فەرەج
## ( هاوڕێی مامۆستا زیاد )

لێرەوە زۆر سوپاسی بنەماڵەی مامۆستا زیاد دەکەم، لەبەرئەوەی ئەو شانسەیان دامێ بتوانم ئاوڕێك لە یادەوەریەکانی خۆم لەگەڵ مامۆستا زیاد بدەمەوە، لە سەروو ئەمەشەوە سوپاسی زیاتریان دەکەم کە من ئەمڕۆ لەگەڵ بەڕێزترین کەسانی هەرێمی کوردستان کە دەڤەری پشدەرو بیتوێنە، قسە دەکەم. لە ڕاستیدا ئەگەر بمەوێت باس لە یادەوەریەکانم لەگەڵ مامۆستا زیاد بکەم، ناتوانم نەگەڕێمەوە ئەو وێستگەیەی کە بۆ یەکەمجار ئەم ناوچەیەم ناسی، ئەو ڕۆژەی من هاتمە پشدەرو بیتوێن بە وەزیفەی مامۆستایەتی، ئەم ناوچەیە ئازاری لێنەچۆرا، یەعنی ئێستاش ناتوانم تەسەوری ئەوکاتانە نەکەم و لەبیرخۆمی بەرمەوە، گوندەکان ڕاگوێزرابوون، خەڵکەکە هەمووی لە ئۆردوگادا بوو بێخزمەت، لە چاویان حوزنێکی قوڵ هەبوو، نە ئابووریان مابوو، نە مەڕو ماڵاتیان مابوو، پێیدەگوترا ئۆردوگای هاوچەرخ! کە بە هیچ مانایەك ئۆردوگای هاوچەرخ نەبوو، بەڵام ئەوەی کە بۆ من خاڵی جەوهەرییە لەم قسەیەدا ئەیگێڕمەوە ئەوەیە کە خەڵکی ئەم ناوچەیە لەناو دەرونیاندا ئێنەرجیەك، مقاوەمەتێك هەبوو بە هەموو ئەو سەپاندن و ڕاگواستن و خراپی ئابووریە، کۆمەڵێ خەسڵەتی جوانی خۆیان لەدەست نەدا، منی دەرەوەی ئەوان، دەزانم چین ئەو خەسڵەتانە: میواندۆستی، غەریبدۆستی، مرۆڤدۆستی، مەشرەفخۆشی، یانی من وەکو مامۆستایەك لەم دەڤەرە ئەتوانم بڵێم کە هەمیشە لە چاوی ژنی ئازاو بەباوەڕو پیاوی ئازاو بەباوەڕی ئەم دەڤەرە، من ئیرادەم ئەخوێندەوە، چونکە من مامۆستای منداڵەکانیان بووم، لەگەڵ ژن و پیاوەکان تێکەڵاوبووم هیچکات خەڵکی پشدەرو بیتوێنم نەبینی بۆ یەك لەحزەش پەشیمان بن بۆ ئەو شۆڕش و یاخیبونەی دژ بە ستەم کرابوو کە لەو شۆڕشەدا ئەوان منداڵەکانیان ئاوای لێهاتبوو، ئەوە خاڵێکی زۆر زۆر گرنگ بوو بۆ من، ئەو مقاوەمەتەی لە دەروونی ئەم خەڵکەدابوو، لێرەوە دەڵێم مامۆستا زیاد یەکێکە وە یەکێك بوو لەو پیاو و ژنە ئازایانەی ئەم دەڤەرە، لەو پیاو و ژنە بەباوەڕانەی ئەم دەڤەرە، وێستگەی خەباتی من بەراستی لە بواری مافی مرۆڤ و بواری سیاسی ئەم دەڤەرە، کە زیاتر بواری مافی مرۆڤ و سیاسیەکەشی تێکەڵە، بەشێکی زۆری ژنە ئازاو بەباوەڕەکانی، پیاوە ئازاو بەباوەڕەکانی ئەم دەڤەری پشدەرو بیتوێنە، داگیری کردووە، هەتا ئەمڕۆش، وە لە زۆربەی چاوپێکەوتنەکانیشم من ئەوەم گوتووە بەسەدان پیاو و ژنی ئازاو بەباوەڕی وەك مامۆستا زیاد لەناو یادەوەری مندا هەیە ئەگەر ڕۆژێك ببێت بە کتێبێك، بۆ خۆم دەزانم چەند هاوکاربوون تاکو دەڤەرەکە پێشبکەوێت و باوەڕەکان بمێننەوە، لێرەوە دەچمە

سەرباسی مامۆستا زیاد، کە وتم یەکێکە لەو سەدان ژن و پیاوە ئازایانەی ئەم ناوچەیە و خاوەن باوەڕی ئەم ناوچەیە، سەرەتای نەوەدەکان بوو دیارە مەسئولی حیزبیەکەشم لێرە دانیشتووە کە من زۆر حورمەتم هەیە بۆی، وە زۆربەی کەسەکانیش لێرە دەناسم. ئەوەی وە ئەوەی کە پێشمەرگەش نەبوو لەناو دڵ و دەروونی خۆی پێشمەرگە بوو، من شاهیدی ئەوەم، زۆر سەغڵەت بووم، هاتم بۆ ڕانیە وە مامۆستا زیاد لە کۆمیتەی ڕانیە بوو یەکترمان ناسیەوە وتی مامۆستا ڕووناک چیە؟ وتم مامۆستا کوشتن هەیە، بنەتۆ هەیە، ئەو شتانەی لە دوای ڕاپەڕین ئێمەی ژنانی ڕاچڵەکاند. وتی بەس ئێمە شتی زۆر جوانیشمان هەیە. بە هەرحاڵ، ڕۆژان ڕۆیشت و لەگەڵ مامۆستا زیاد هاوکارێکی سەرەکیم بوو بۆ ئەو لێکۆڵینەوەو وشیاریانەی کردمان بۆ خەڵکی ئەم ناوچەیە لەسەر خەتەنەکردنی کچان و کوشتنی ژن بەتۆمەتی شەرەف لەسەر بنەتۆ، ڕاستە نەریتێك هەیە لەم ناوچەیە کە دەبێت بگۆڕدرێت کە دژ بە مرۆڤایەتیە، لەگەڵ ئەوەی چەندین خەسڵەتی جوان هەیە، ئەم نەریتانەش هەیە، مامۆستا زیاد و نمونەی مامۆستا زیادەکان هەوڵی گۆڕینی ئەوەیان ئەدا، مقاوەمەتی گۆڕینی ئەوەیان دەکرد، ئەوە بۆ ئێمە زۆر زۆر گرنگ بوو، ساڵی ۱۹۹۷ بوو، مامۆستا زیاد تەلەفونی بۆ کردم کە ئەو کات نۆرماڵ بوو وتی مامۆستا ڕووناك چیمان لێدەکەیت ژنێکیان بەستۆتەوە بۆ کوشتن دیارە لێرە هەڤاڵانی مەڵبەندو کۆمەڵێ ژن زۆر هاوکاریان کردبوو، وتم ئێوە بەس لە کوشتنەکە ڕزگاری بکەن و بیگەیەننە سلێمانی. بەس خۆم دەزانم مامۆستا زیاد و هاوڕێکانی چۆن عەبایان دا بەسەریا و چۆن گەیاندیانە ماڵی سەرۆك عەشیرەتێك و چۆن ڕزگار کرا. لەم شەوانە ژنەکە تەلەفونی کرد، ئێستا ئەو ژنە خاوەن ئابووریەکی بەهێزە منداڵەکانی هەمووی بردووە، هەر ئەو ساڵە ۱۳ سیانزە کچ و ژنی لە کوشتن ڕزگار کرد...

دیارە زۆر زۆر یادەوەری تریش هەیە لەگەڵ مامۆستا زیاد، ئەوە جگە لەوەی کە وشیاری خەتەنەمان دەکرد ڕۆژێکیان وتی پێم باش نیە بچیت بۆ فڵان شوێن، دیارە من حەزدەکەم حەقی ئەو پیاو و ژنانەی ئەم دەڤەرە نەخۆم چونکە لەو کارکردنە من نوقتەیەکی بچوکی ئەم کارکردنانە بووم هەمووی بە هاوکاری پیاو و ژنانی ئەم دەڤەرە کردوومانە، چونکە ئەم ناوچەی پشدەرو بیتوێنە، زۆر ئاسان قابیلی گۆڕانن، خەڵکێکن هەروەکو سروشتەکەیان ئازادن، خەڵکێکن زوو پێشکەوتن وەردەگرن تا وای لێهات چەند ساڵێك دوای ڕاپەڕین گوندەکان خۆیان کۆدەبوونەوە بۆ ئەوەی بنەتۆ نەمینێ، خەتەنە نەمینێ، هەر بۆیە من لە زۆربەی چاوپێکەوتنەکانم باسیان دەکەم، ئێستا کە ئێمە ئامارەکان وەردەگرین ئەگەر لە ساڵی نەوەدەکان بەهۆی داگیرکاری و ئیفلیجی فیکریەوە ئەو هەموو نەریتە خۆی تیادا مەڵاس دابوو، خوێندنەوەی بۆ نەکرابێ و دانەبڕابێ، ئێستا سەیر دەکەین ئاماری پشدەرو

بیتوێن سەرکەوتووە کە ئەو دیاردانە زۆر کەم بۆتەوە ئەم کەمبوونەوەش بە جوهدی، بەباوەڕی، بەفیکری خەڵکانێك کە لە دەروونی خۆیاندا مقاوەمەت بۆ ئازادی و مافی مرۆڤ هەیە، هەروەك چۆن دژی ڕژێم و زوڵم ڕاپەڕین، ئێستاش خەبات دەکەن بۆ ئەوەی مەدەنیەت لەم ناوچەیە بچەسپێ، بۆیە من هەمیشە دەڵێم ڕوحی مامۆستا زیاد شادبێت هەمیشە یادەوەریەکانی بە سەروەریەوە ئەگێڕمەوە، وە من خۆم یەکێکم لەوانەی هەمیشە حورمەت و خۆشەویستم بۆ ئەو هەبووە، حورمەت و خۆشەویستم بۆ هەموو ئەو ژن و پیاوانە هەیە لەم دەڤەرە کە زۆر زۆرن، هەموویان بەحورمەتەوە باسدەکەین...

## حەمید قەڵادزەیی
## (هاوڕێ و هاوشاریی مامۆستا زیاد)

هەرگیز ڕۆشنایی نامرێت، هەرگیز باڵای مردن، هێزی مردن، ناگاتە باڵای ڕۆشنایی... مامۆستا زیاد، یەکێك بوو لە نموونە زیندووەکانی کارەکتەری ڕۆشنایی کوردی، ئاخر خەملەکۆڵێك، خەمی جوانی و خەمی ژیاندۆستی و پەروەردەو کەلەپووریارێزی گەلەکەی و خەمی ئاوەدانی زیاترو ڕۆشنبیری زیاترو، خەمی پاراوکردنی بیری نەتەوایەتی و نیشتیمانی لەلای لەخەمی نان زیاتربێت، ئەوە جگە لە ڕۆشنایی زیاتر، شتێکی دی نییە، بۆیە مومکین نییە مامۆستا زیاد پێمانوابێ مردووە!

ئەو زاتە، درەختێکی ڕەگداکوتاوە لە کێڵگەی ویژدانی زیندووی هەرتاکێك کە خاوەن ویژدانێکی زیندووبێ، ئیدی مردن چ حەدی هەیە بلێ باڵام بە باڵای دەگرم! مامۆستا زیادو هاوشێوەکانی، بەپێچەوانەی ئەو کەسانەی زەمەن و ڕۆژگارێکی کاتی، بەرهەمی هێناون و بەڕواڵەت دەیانبینی لەسەر شەقامەکان هەن کۆشك و باڵەخانەکانیان بەرزە، بەڵام لە ویژدانی ویژدان زیندواندا، مردوون. مامۆستا زیاد بەپێچەوانەی ئەوانەوە، ئەوانە زیندووێکی مردوون. مامۆستا زیاد، مردووێکی زیندووە وە دڵنیاشبن هەربەزیندوی دەمێنێتەوە، قەولێکی فارسی هەیە:

روزها از من میگزرد

امما، من از روزها نمیگزرم!

ڕۆژگارەکان تێدەپەڕن، بەڵام من لە ڕۆژگارەکان تێناپەڕم... بەڵێ ڕۆژگارەکان تێدەپەڕن بەڵام مامۆستا زیاد لەو ڕۆژگارانە تێناپەڕێ کەلە ویژدانماندایەو بەشێکە لە یادەوەریمان، بەم کۆپلەی خۆم کۆتایی بەقسەکانم دەهێنم:

پەپولە عیشقی بەکێ ببەخشێ

دوای توانەوەی تەمەنی مۆمێك

کە ڕۆشنایی چوبێتە

ناوچوار دیواری دوای گەرمەشینێك !

(....)

## شیعری عومەر حاجی

هەمیشە بۆنی خاکت لێدێت
بگەڕێنەوە بۆ منداڵی
یەکەم تەختەڕەش و یەکەم هاوڕێ و
یەکەم نیگای شەرمنتان
ئەوکات هەموومان پەڕەیەکی سپی سادەبوین
مامۆستا بەخامەیەکی میهرەبان
لەسەر سینگی نووسین: خۆشەویستی نیشتیمان
دەستپاکی و دڵپاکی و ڕاستگۆیی و
مردن لەپێناو جوانیەکان
منداڵەکانت فێرکرد
خیانەت لە مانگەشەو نەکەن، چراکان خامۆش نەکەن
شەرم لەتاریکەشەو نەکەن
فێرتکردن ژیان بخەنە ڕستەوە
واتکرد دارا لەدوورەوە دوو دار ببینێ
ئازاد گوێ لە زریزەی زارا بگرێ
مێوژ لە مام زۆراب بکڕن
دۆی دادە کۆ بکەنەوە
تۆهەر مامۆستا نەبویت
تۆ گەورەبویت تۆ گەوهەربویت
ساڵانێکی دوورو درێژ چرایەك بووی
ڕۆشن ڕۆشن دادەگیرسای
فێرتکردین ڕوناکیمان خۆشبوێت
ڕێگا تاریکەکان کۆ بکەینەوە
لوتکەیەك بکەینە قیبلە
ساڵانێك باخەوانی گوڵستان بوویت
بەحەیران ئاودێری گوڵەکانت دەکرد

بەگەلۆ مانگەشەوت دەلاواندەوە
بە چرای وشەکانت ڕاوی دووپشك و
شەمشەمەکوێرەکانی وڵاتت دەکرد
تۆ گەورەی، تۆ نەمری
هەمیشە بۆنی خاکت لێدێت
ئێستا بە ڕۆیشتنت گەلۆیەك هەتیو کەوت
حەیرانێك بەحوزنەوە بەکوڵ دەگریت
گوڵزارێك سەری سپی دەهۆنێتەوە
شیرین گەرمەشین دەگێڕێت

## لە گەرووی (گەلی)وە
### ئیسماعیل راجی

وازی ڕازی دڵسۆزی و،
لە چریکەی باڵۆرە و حەیرانەوە، ڕەسەنایەتی و،
لە داستانی سەربوردە تاڵ و شیرینەکانی تەمەنیدا،
وانەی ئەوین و سادەیی وعیشقی خاك و نەسرەوتنی فێرکردین...
(بەردەشانی)ی لە بن هەتاری تاروماربوون دەرهێنا و،
لە هەوهەوی شۆڕسوارانددا
بە بەیتە نەخشینەکانی نەخشی (سوارۆ)یەکی
پێشەنگی ئەو مەیدانەی
لە ئەندێشەماندا نەخشکردووە...
خۆ (زیاد) لە زێدم زیاد نەبوو،
نازانم بۆچی وا زوو لەم نەورۆزەدا
فریشتەکان بۆ ئاسمانیان بردەوە؟!!
بەخێربێن بۆ کۆڕیادی چڵەنێرگزێکی
هەمیشە گەش...[١]

---

١ – ئەم تێکستە، لەسەر بەرگی خشتەی مەراسیمی کۆڕیادەکە نووسرابوو، لە مەراسیمەکەدا نەخوێندراوەتەوە.

## وتاری بنەماڵە
## ( لەلایەن هێمن، کوڕی مامۆستا زیادەوە خوێندرایەوە )

سەرەتا بەخێرهاتنی هەموو لایەك دەکەین، بەخێربێن سەر سەرو سەرچاومان بەناوی خانەوادەکەمان، بەناوی سەرجەم خزمو هاوڕێ و هاوخەبات و هاوقەڵەمەکانی باوکم، بەخێرهاتنتان دەکەین.

لێرەوە دەمانەوێت سوپاسی هەموو ئەوکەسانە بکەین کە لە پرسەکەی بەشداربوون یان بە نامە یان بەتەلەفون یان لە ڕێگەی دانانی وێنەی باوکم لەسەر تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان هەستی جوان و هاوخەمی خۆیان دەربڕی. بەشداری گەرمی ئێوە، بەشداری خەڵکی زۆر، لە پرسەکەی، ئەو سەروەتە گەورەیە بوو کە باوکم لە دوای خۆی بۆ ئێمەی جێهێشت. ئەو هەمیشە دەیگوت من لە ژیان ڕەنگە وەکو باوك نەمتوانیبێ زۆر شتتان بۆ بکەم، ڕەنگە لە دوای خۆشم نەتوانم سەروەت و سامان و ماڵی دونیاتان بۆ بەجێ بهێڵم، بەڵام شتێکتان بۆ بەجێدەهێڵم کە هەمیشە شانازی پێوە بکەن و هەمیشە لەنێو خەڵکدا پێی سەربەرز بن. دیارە پەرۆشی ئەو خەڵکە بۆ باوکم، شتێکە کە هەرگیز کۆتایی نایەت. هەر خۆشەویستی ئەو خەڵکەش وای لەو پیاوە کردبوو کە زۆربەی زۆری تەمەنی لە خزمەت گەل و وڵاتەکەی تەرخان بکات.

چەند ڕۆژێك بەر لەماڵاوایی، بەرلەوەی مەرگ دەستی بگرێت و بیبات، ئەو گوتی هەر ئەوەندەم ئیش بە ژیان ماوە تا ئەو کتێبەی بەردەستم تەواو دەکەم[1]، خەمی ئەوەی بوو بەر لەسەفەری ماڵاوایی، کتێبێکی دیکە بخاتە نێوکتێبخانەی کوردی، وە گەلێك شتی کەلەپوورو گەوهەرناسای ئەو میللەتە لە مردن ڕزگار بکات، لە فەوتان ڕزگار بکات. بەڵی باوکم هەرواشیکرد، سێ ڕۆژ بەر لەوەی مەرگ دواخاڵ لەسەر دوالاپەڕەو دوادێڕی ژیاننامەی ئەو دابنێ، ئەو دواخاڵی لەسەر دوالاپەڕەی کتێب و دوادێڕی کتێبەکەی دانا کە ئێستێ ئامادەیە بۆ چاپ و بە هەوڵی دۆستان، لە ئایندەیەکی نزیك دەکەوێتە نێو کتێبخانەی کوردی. من دەمەوێ لێرەوە ئەوە بڵێم، بۆ مانەوەی وێنەی ئەو پیاوە لەنێو ئەلبومی یادەوەریەکانماندا، بۆ مانەوەی بەرزی ئەو پیاوە، هەرکاتێك سەیری چیای ئاسۆستان کرد، ئەوتان بەبیربێتەوە، چونکە ئەو وەکو ئاسۆس خۆشەویستی هەرسێ دەڤەرەکەی مەرگەو پشدەرو بیتوێن بوو، هەرکاتیش لەبەردەم ئەو چیایە دەوەستا، تەواوی بیرەوەریەکانی ژیانی ڕابردووی خۆی دەهاتەوە پێش چاو، دەستی چەپی پێدەشتی بنگرد، شوێنی منداڵی و شوێنی بێ باوکی و شوێنی گەورەبوونیەتی. دەستی ڕاستی، پێدەشتە بەهەشتیەکەی

[1] – مەبەست لە کتێبی (پێشبار)ە، کە دوای مەرگی ڕەحمەتی، ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد، بەچاپی گەیاند لەساڵی (٢٠١٧).

پشدەریان، کە بە چیا سەربەرز و جوانەکان پەرژین کراوە، شوێنی خەباتی نهێنی، شوێنی زۆرترین خزمەت بە ئەلف و بێی کوردی، شوێنی پێگەیاندنی ئێمەو سەدان نەوەی خوێندەوارو شۆڕشگێڕ بوو. بەردەمیشی، دەربەندو چیای کێوەڕەش دەشتە جوانەکەی بیتوێنیان، کە شوێنی خەباتی سیاسی و شوێنی پاراستنی مافی مرۆڤ و وە پێگەیاندنی دەیان مامۆستا، وە شوێنی نووسینەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی بوو. لە کۆتاییدا دەمەوێت ئەوە بڵێم:

ئێمە شانازی بە باوکێکەوە دەکەین کە بە درێژایی ڕێگەی ژیانی، بە درێژایی خزمەتکردن بە ئەلف و بێی کوردی، بە دەم ڕێگای خەبات و تێکۆشان، بە دەم ڕێگای خوێندەوارکردنی منداڵەکان، بە دەم ڕێگای ئەشکەنجەو ئازارو زیندان و دوورخستنەوەو ژیان، ئەو هەمیشە خەریکی چنینەوەی گوڵە گەنمەکانی لاوك و حەیران و بەیت و بالۆرەو شیعرەکانی عەلی بەردەشانی بوو، خۆشبەختانە لەم ڕێگەیەش خەرمانێکی پڕ بەرەکەتی پێشکەش بە کتێبخانی کوردی و مێژووی میللەتەکەی کردووە.

لێرەوە دووبارە بەخێرهاتنتان دەکەین، هاتنی ئێوە وەفایە بۆ ڕوحی جوانی ئەو پیاوە، وەفایە بۆ خەباتی، بۆ تێکۆشانی، بۆ نوسینەکانی.

دووبارە بەخێربێن سەرسەرو سەرچاومان هاتن.

## مەراسیمی ناساندنی کتێبی پێشبار

بە چەند مانگێك بەرلەوەی ڕەوانشاد مامۆستا زیاد، باروبنەی دواسەفەری بپێچێتەوە و بەجێمابهێڵێت، بنکڕی[1] ئەو بابەتە فۆلکلۆرییانەی کە لە کەشکۆڵەکانیداما بوون، ئامادەیکردن، ساغیکردنەوە، دوو سێ کەڕەت پێداچوونەوەی کردن و ئینجا وەك دەستنووس، ئامادەیکردن بۆ چاپ و ناوی نا (پێشبار). وابوو، مەرگ، وەك براگەورەیەکی غەددار، ڕێی پێگرت و مەودای نەدا ئەو ڕۆڵە ناسکونازدارەیشی، وەك هەموو جگەرگۆشەکانی دیکەی ببینێ و لەئامێزی بگرێت و تێر بەدڵێ خۆی بۆنی پێوەبکات، پیلی گرت و لەگەڵ خۆی بردی!

دوابەدوای پرسە وماتەمینییەکەی، ئەندامانی خانەوادە بەڕێزەکەیان، دەستنووسەکەیان بە بوار نورەدین و ئارارات ئەحمەد سپارد کە پێداچوونەوەی بۆ بکەن و لە ڕووەکانی، پەراوێزدانان و زیاتر ساغکردنەوەی هێندێك وردەهەڵە و کەموکوڕی و...، تەواویکەن. پاش ئەوەی ئەو کارەش کرا، دایانە ئینستیتیووتی کەلەپووری کورد و، ئەوانیش لە وەختێکی زوودا، چاپیانکرد.

ئەوەبوو لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠١٧دا پێشبار چاپکرا وکەوتەوە دەستی خانەوادەکەیان. ئەوانیش لەباتیی ئەوەی کە بیبەنە بازاڕ بۆ فرۆشتن، بڕیاریاندا لە ڕێوڕەسمێکدا ناساندنی بۆ بکەن و بەسەر کەسانی نووسەر و ڕووناکبیر و دۆست و هاوەڵانی مامۆستادا، دابەشیکەن.

بۆ ئەو مەبەستە، بەشی ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکانی (ئیدارەی سەربەخۆی ڕاپەڕین) بە هاوبەشی لەگەڵ بەشی ڕۆشنبیری و هونەری لە ڕانیە، لە ڕێکەوتی ٢٠١٨/٨/٢٩ و، بە ئامادەبوونی زۆرێك لە ڕووناکبیر و شاعیر و لێکۆڵەر و هاوڕێ و نزیکانی مامۆستازیاد، لە هۆڵێك لە هۆڵەکانی کتێبخانەی گشتیی ڕانیە، کۆڕێکیان بۆ ناساندنی کتێبەکە سازدا. لەو ڕێوڕەسمەدا، نووسەر و شاعیر ئیسماعیل ڕاجی، بەڕێوەبردنی کۆڕەکەی گرتەئەستۆ و، مامۆستا بڕیار عوزێریش، هەڵسەنگاندنێکی شایستەی بۆ کتێبەکە پێشکەشی ئامادەبوان کرد.

دوای پێشکەشکردنی هەڵسەنگاندنەکە، کۆمەڵێك ڕووناکبیر و نووسەر، بە سەرنج و ڕاوبۆچوونەکانیان، بەشداریی ناساندنەکەیان کرد و ئینجا پێشبار بە پێشوازییەکی جوانەوە، بەسەر ئامادەبواندا دابەشکرا و، دواتریش چەند کەسایەتییەکی ئەدەبی و هونەری بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، کە لەوێ ئامادە بوون، قسەیان لەسەر کرد.

---

١ – بۆیە وشەی بنکڕمان بەکارهێنا، چونکە زۆربەی وەخت بنکڕ تامێکی خۆش و تایبەتی هەیە. (ئامادەکاران)

## قەڵەمێکی سەوزی پاییزی
## ئاوڕدانەوەیەکی خێرا لە بەرهەمەکانی مامۆستا زیاد
## بوار نورەدین

مامۆستا زیاد، لە یەك کاتدا چەند کارەکتەرێکی هەبووە: ٤١ ساڵ مامۆستا بووە، لە سەرەتای لاوێتییەوە، هەنگاوی خەباتی نەتەوەیی هەڵێناوە و بۆ ساتێکیش شل نەبوون. کاتێکی زۆریشی بە (نووسین)ـەوە بەسەر بردووە.

یەکەم نووسەر (خوای گەورە) بووە و یەکەم کتێبیش کتێبەکانی (خوا) بوون، کەواتە بەرپرسیارێتیی نووسەر، زۆرە. کەمن ئەوانەی هەستیان بە ئەرکی نووسین کردووە و وەك کاری خۆیان دایانناوە. هەندێکیش، زۆر بە هەستیاری و وردبینی و ترس و دڵەڕاوکێوە، بەشێکی زۆری ژیانیان بۆ تەرخانکردووە. لە چینی دووەمیش کەمتر، ئەوانەن کە هەر زوو هەستیان بە چێژ و گەورەیی نووسین کردووە، بەڵام پەلەیان لە بڵاوکردنەوە نەکردووە.

پێمان وایە مامۆستا زیاد لە چینی سێیەمدا دەردەکەوێت، ئەو، لە سەرەتای حەفتاکانەوە، دەستی بە نووسین کردووە، لە هەشتاکاندا بابەتی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردووەتەوە، دوای ساڵی ٢٠٠٦یش، دەستی بە بڵاوکردنەوەی کتێبەکانی کردووە.

لە هەموو کتێبەکانیدا، شێوازی کۆکردنەوە، ساغکردنەوە و لێکدانەوە، بەراوردکردن، سەلیقەی زمانەوانی و بەدواداچوون، شێوازی گێڕانەوەی بەیت و چیرۆك و بەسەرهاتەکان، تایبەتمەندیی مامۆستا زیادە و کەمتر نووسەران و فۆلکلۆریستان، کاری ئاوا ورد و پوختیان کردووە.

### دیوانی عەلی بەردەشانی

ئەم کتێبە، یەکەم کتێبی مامۆستایە و لە هەموویان زۆرتر جێگەی گرتووە. تایبەتمەندیی ئەدەبیاتی (گوندی بەردەشان)، کە زێدی مامۆستایە، خاڵی سەرەتای تێکۆشان و هەوێنی نووسینەکانی بوون، ئەوەش بە هۆی ئەوەی کە (عەلی بەردەشانی) خەڵکی گوندی (بەردەشان) بووە، کە وایکردووە مامۆستا زیاد نووسینەوەی بەشێك لە فەرهەنگی گوندی بەردەشان و ناوچەی مەرگە، بە ئەرکی خۆی بزانێت و ببێتە سەرەتایەك، بۆ ئەوەی ئەم خەرمانەمان پێشکەش بکات.

## تایبەتمەندیی دیوانی عەلی بەردەشانی

هەرچەند دیوانەکە، وەك توێژینەوەیەکی زانستی ئەنجام نەدراوە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەتوانرێت وەك کارێکی زانستی ئەژمار بکرێت، چونکە:

١-کەڵکی لە کۆمەڵێك سەرچاوە وەرگرتووە و لەگەڵ هەندێکیشیاندا بەراوردی کردووە.

٢-پشتی بە خەڵکی ناوچەکە و دەرەوەی ئەو ناوچانەش بەستووە.

٣-ماوەی خەریکبوون و تەواوکردنی ئەم کارە، پتر لە ٣٠ ساڵی خایاندووە.

٤-بۆ بڕیاردان و ساغکردنەوەی هۆنراوەکان، بەڵگە و پاساوی زانستی و ئەدەبی هێناوەتەوە.

٥-زۆربەی بەش و هۆنراوەکان، پێشەکی و پاشەکی بۆ نووسیون و پێویستییەکانی بەشەکەی ڕوون کردووەتەوە.

٦-کتێبەکە، دەیان پەراوێزی بۆ نووسراوە.

عەلی بەردەشانی و هۆنراوەکانی، بە دیارترین شاعیر و ئەدەبیی میلیی کرمانجی ناوەڕاست دادەنرێن، جگە لەمە، چەند بایەخێکی دیکەیان هەیە:

١.کۆمەڵێك ڕووداوی مێژوویيان تێدایە، هەروەها بەشێك لە چۆنێتیی ژیان و ژیاری ئەو سەروبەندەمان بۆ دەگێڕێتەوە.

٢.کۆمەڵێك وشەی ڕەسەن و هەندێك شێوازی ڕستەسازی و ئاخاوتنی ناوچەکانی (مەرگە و پشدەر و بیتوێن) زیندوو کراونەتەوە، کە بۆ ئێستای ئەدەبیاتی کوردی، بایەخی تایبەتیان هەیە.

٣.ناوی کۆمەڵێك دابونەریت و ئامراز و ئامێر و کەرەسەی سەربازی باس کراون، کە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر بوارەکانی کەلەپوور و جەنگ و مێژووی کورد، بایەخدارن.

## بەکارهێنانی پەخشانە شیعر لە وەسف و بەرجەستەکردنی دیمەنەکاندا

مامۆستا، خۆی وەك (پەخشاننووس) نەناساندووە و بە ناوی پەخشانەوە بابەتی بڵاونەکردووەتەوە، بەڵام ئەگەر بە وردی تەماشای بەرهەمەکانی بکەین، دەبینین لە زۆر شوێندا، بە ناخی بابەتەکانیدا چووەتە خوارێ و هەر یەکێکیانی کردووە بە گرتەیەکی سینەمایی و لە بیبلبیلەی چاوی ئەندێشەیی مامۆستادا بەرجەستە بوون و بوون بە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەی، هەر ئەوەش وایکردووە لە زۆر شوێندا خۆی بۆ نەگیرێت و هەست و شاکارە جوانەکانی، بخاتە ڕوو.

وەك ڕۆماننووسێکی شارەزا، کاری لەگەڵ ئەو شوێنانەدا کردووە، کە پێویستیان بە (گێڕانەوە) و (بەرجەستەکردنی دیمەنەکان) بووە، واتە بەبێ ئەوەی نووسەر ڕووداوەکانی

دیتبێت، بە شێوەیەك گێڕاوییەتەوە، كە خوێنەریش وەك تەماشاكەری گرتەیەكی سینەمایی، دیمەنەكان ببینێت.

**پەخشانەشیعر لە (بەیتی پیوازان)ی دیوانی عەلی بەردەشانی**

لە دیوانی عەلی بەردەشانی و لە بەیتی پیوازاندا، باسی دیمەنی شەوی ئەو شاییەی كردووە، كە عەلی بەردەشانی و حەمە وەسمان و پیرەژنێك، شایەری بوون. عەلی و حەمە، بەرۆژ داوای دوو چڵە پیوازیان لە پیرەژنی خاوەن دەرماڵەی پیوازان كردووە، ئەویش نەیداونەتێ، بۆیە بڕیاریان داوە، بۆ شەوێ و لەلای دەرماڵی پیرێژنێ، گۆنگەلێكی بنێنەوە و پیوازەكانی هەڵقەنن.

م. زیاد بەم شێوەیە دیمەنی شاییەكەی پیشان داوە:

گەر بەهار بێ، یان پاییز بێ
كاتێك خۆشە شایی شەوێ، مانگە شەو بێ
لەگەڵ پەنجەی شمشاڵژەن و دەنگی بەستەی عەلیە كوێری
پێیەك هەستێ و یەك دانەوێ.
بەژنی بڵند، ناسك و شلك،
بێتە سەما،
ڕانی وەك ڕانی، مامز و كەفەڵی خڕ، بجوڵێنێ.
پشووی فێنكی شەوبای شەوێ،
مزرە سێوی باغی ژینێ،
لەسەر مەزرای تەختی سینەی،
هەڵبەزێنێو دابەزێنێ و بلەرزێنێ.
بەملاولادا، بسك و شابسك و پەرچەمان بێنێ و بەرێ و تێك ئاڵێنێ،
جارجار، ڕووانیان پێ وەشێرێ و زۆر جارانیش بۆ تریفانێ،
لەگەڵ مانگی ئاسمانێ، وەدەریان نێ...

**ساغكردنەوەی شیعری كەرەدێز**

وەك م. زیاد ساغی كردووەتەوە، شیعری شینی كەرەدێزی، هی (سلێمان بەگی حاجی میرانی خدر بەگ)ـە، چەند كورتەیەكی لـێ وەردەگرین:

**پێناسە:**

لە چەند شوێنێكدا، بەم شێوەیە پێناسەی كەر، یان گوێدرێژی كردووە:

• گوێدرێژ، هۆیەكی زۆر گرنگ و پێویستیی ژیانی پێشینان بووە، بۆیە هەر لە كۆنەوە گوتراوە: «ئەوەی كەرێكی نەبێ، كەرێكی نامێنێ!.»

• ئەوە گوێدرێژێكی چالاكی بە هەموو ئامرازەكانی پێویستی كارەوە، لەبەردەم چاوی ئەندێشەمدا بە ئامادەیی بۆ فەرمان وەرگرتنی كاركردنێ، لەبەر دەركێ ماڵێ بە ئارامی، ڕاوەستاوە و نە زووە زووە و، نە درەنگە درەنگەی دەكات.

• ئەم گیاندارە، بە خزمەتە، بە ئەدەبە، بە ڕێژەی درێژیی گوێیەكانی (بیسەر)ـە، وەكو مەندیی دەریای چاوە جوان و گەورە و گەشەكانی بە (ئارام)ـە، هێندەی ڕەقیی سمەكانی(خۆڕاگر و باربەر و بە پشوو)ـە، لە (كەمخۆر)ی هەر ئەوەیە ئەگەر هەمیشە (ڕۆژووەوان) نییە.

• گوێدێژ، وەكو مرۆڤان نین، كاری خۆیان نەزانن، ئەوان باش تێگەیشتوون و دەزانن، كە كەر و كـەرزادەن و لەو ئامڕازە زیندووانەن، كە پەروەردگار بۆ ئاسانكاریی ژیانی ئادەمیزادان، گیانی وەبەرناون و ئافەریدەی كردوون.

• هەرچەندە توورەكەكایەك و هێندێك جۆ و چەند چڵەپووشێك، ئەویش ئەگەر هەبن، بۆ خواردنی ژەمی گوێدرێژێك، بە بەراورد بە ڕێژەی خزمەتەكەی، زۆر كەمە.

**بەراوردكردن**

نموونەی شیعری چەند شاعیرێكی دیكەی هێناوەتەوە:

زۆر كەس، خزمەتی زۆری ئەو گیاندارەیان لەبەرچاو گرتووە و ڕێزیان لێناوە، بەڵام كەس وەكو شاعیران هێندەیان هەست پێنەكردووە و ئەمەكی خۆیان بۆ دەرنەبڕیوە.

• نالی، لەبارەی چالاكی و جوانی و یەكرەگەزی لەگەڵ ئادەمیزاناندا، بۆ هەر لایەنێكیان لە شیعرێكی درێژدا دەڵێ:

«چـەنـدە پێم خۆشبوو زوبـانـی حـاڵی دەیـوت (نالیا)
هـەردوو حەیوانین، ئەتۆ گوێ كـورت و من گـوێ درێـژ»

• قانیع، لە شیعری (قانیع و كەرەكەی)دا دەڵێ:

«كـەری نـوحـی نـەبـی، بـاپـیری ئـەم بـوو
لەگەڵ گوێدرێژی عیسا، خاڵ و خـوارزان»

• عەلی بەردەشانیش لە شیعری تالانێ بەردەشانیدا، کەرەکەی خۆی لە ڕاددەبەدەر بەرز دەنرخێنێ کە دەڵێ:

«کەرێکم هەبوو سپی گوێلار
باری سووکی لە حەوت تەغار
عەلیش لەسەری دەبوو سوار
ڕۆینی سووکی بە نەرمە غار»

**ساغکردنەوە**

ئەو شاعیرەی دەڤەری خۆشناوان، ساڵی ١٨٥٩، چاوی بە دیمەنی گوندی (بێتواتە)ی هەڵێناوە. وەکو لە بیستوان بیستراوە و لەسەر چاوان دیتراوەتەوە، (سلێمان بەگی شاعیر) لە تەمەنی هەشتا ساڵی (١٩٣٩)، مردووە. وەك بەرهەم، تەنیا ئەم شیعرەی (کەرەدێز)ی لەپاش بەجێماوە.

هەر لە ژێر ڕووناکی ئەم شیعرەشدا دەتوانین چۆنیەتیی ژیانی سلێمان بەگی شاعیر بزانین.

سلێمان بەگ، خێزاندار بووە و کۆمەڵێك منداڵی هەبوون، کە بە هۆی بەخێوکردنیانەوە ڕووبەڕووی ژیانێکی پڕ کوێرەوەریی سەخت بووەتەوە. بە ئاژەڵداری و کاری ڕەز و باخ و بارەدار فرۆشتنێ، ژیانی بەسەربردووە. گوێدرێژە گوێڕایەڵەکەی، کەرەستەی هەرە گرنگی دابینکردنی پێویستییەکانی بووە. بێجگە لەوەی سووتەمەنی زستانی ماڵی خۆی پێ دابینکردووە، بارەداریشی پێ فرۆشتووە، کەلوپەل و پێداویستییەکانی ماڵ و خێزانی پێ کڕیوە.

ئێوارەیەك، کەرەدێز نەگەڕاوەتەوە. ئەو شەوەی سلێمان بەگ زۆری بەدوایدا گەڕاوە، پاش ماندووبوونێکی زۆر، لە ناو دۆڵێکیدا کەرەکەی دیتووەتەوە، کە گورگ بە خەستی برینداریان کردووە.

کەرەکەی بۆ ماڵێ هێناوەتەوە و ماوەیەکی زۆریش خزمەتی کردووە، بەڵام کەرەدێز چاك نەبووەتەوە و تۆپیووە، وەك مامۆستا زیاد نووسیویەتی: «گیانی پاکی دەچێتە ڕیزی گیانی کەرچاکانەوە!»

سلێمان بەگ و سەرجەم خانەوادەکەی لە ژووری ماڵێ لە دەوری کۆبوونەتەوە و بۆی گریاون، سلێمان بەگیش، بە چاوی بە فرمێسکەوە و بە پەرۆشییەکی زۆر پەرۆشەوە، ئەم هەڵبەستەی بۆ گوتووە:

لە کۆتاییدا نووسیویە: «بە ئەمەکی شیعری شاعیری چەوساوەی نادیاری دۆڵێ

خۆشناوان (سلێمان بەگی حاجی میرانی خدر بەگ)ی کۆتایی بە پێداهەڵگوتنێ (کەران) دێنین.

## شیعری کەرە دێزی

بــە پشــتــی تــۆ ژیـــانم بـــوو لـیـبـاس و ڕۆن و نـــانم بـوو
وەفـــاتـــی تـــۆ، فـــەوتـــانم بـــوو داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
کـــەر، کـــەر نـــەبـوو، ئێـستر بـــوو لـــە پـــاپـــۆڕی چـاکـتر بوو
پـــاپـــۆڕ بـــوو، بـــەحـــربـــڕ بـــوو داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
دەهـــاتـــەوە لـــە داروکـــــە بـــە پـــەلـــە پـــەل و تـــاڵـووکـە
لـــەلام وابـــوو، بـــۆم دێ بـووکـە داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
کـە دەسـتـی دەدا هـــەورازی دەسـتـی دەکـــرد بـە ڕمـبـازی
زسـتـــانـێ لـێـکـــردم تـــازی داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
ئـەو کـەر نەبوو، (دوڵـــدوڵ) بـــوو شـــان بڵند، کلك قـــوڵ[1] بوو
ئـــازا و چـــاپـــووك و سـڵ بـــوو داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
لـــەدوای تـــۆ، مـــن ژیـــانم چـــوو لیباس و ڕۆن و نـــانم چوو
ئـــاگـــر و ئـــاگـــردانم چـــوو داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
کـورتـانـی سـەد فـلـوس بـاوی بـە مـــیرات بـــۆم بەجێماوی
لـــە خـــانـــووی بـــۆن دووکـــەڵاوی داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
لـە دوای تـــۆوە مـــن بـێـــزارم نـــەمـــا سـەبـرم، بـێ قـــەرارم
مـــن دژمـــنـــی گـــورگـــی هـــارم داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز
تـــاوەکـــو سـڵـێـمـان مـــابـێ کـــەرێـکـی وەك تـــۆی قـــەت نابێ
گـــەردنـــت خـــۆش و ئـــازا بـــێ داخـــی گـــرانم، کـــەرەدێـــز.

---

١ – کلك قوڵ: کلك قوڵە، کلك کورت.

**تێبینی و سەرچاوە:**

١- ئەم بابەتە لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ژمارە ٧٢٦٢ی ڕۆژی٢٠١٧/٥/٩،ل٨-٩دا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها لەو بۆنەیەدا کە بە هۆی تێپەڕبوونی چلڕۆژەی کۆچی دوایی مامۆستا زیاد، لە شاری ڕانیە سازکراوە، خوێندراوەتەوە.

٢- لە سەرەتای نووسینی ئەم بابەتەدا، ناسنامەی هەموو کتێبەکانی مامۆستا زیاد دانراوبوون و لێرەدا لابراون.

٣- لە نووسینی ئەم بابەتەدا، کەڵك لە زۆربەی کتێبەکانی مامۆستا زیاد وەرگیراوە، بە تایبەتیش:

- دیوانی عەلی بەردەشانی، بڵاوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپی یەکەم، چ: وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- ئاواز و بەسەرهات، بڵاوکراوەی ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، چاپی یەکەم، چ: ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

## ڕاوچی مرواری
## ئارارات ئەحمەد ئەحمەد
## (هاوڕێی نزیکی مامۆستا زیاد)

### چەند پەیڤێکی نیوەچڵە، بۆ گیانی فریشتەیی
### مامۆستا زیاد محەممەد ئەمین

* بۆ دواسەفەر و ماڵاوایی گەورە پیاوان، هەر ئەمڕۆ و سبەی نا، هەر ئەمساڵ و ساڵێکی دی نا... هەمیشە زووە! چونکە هەتیو و منداڵی بێنازی وڵات، چاوەڕێن بە دەستە موبارەك و خاوێنەکانیان، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لە هیچ شتێکی پیس و گڵاویان وەرنەداوە، چاوی فرمێسکاوییان بسڕن. گۆڕ و گیانی شەهیدەکان، چاوەڕێی ئەو دەم و دڵە میهرەبانانەن، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان جگە لە خەمی نیشتیمان و نان بۆ هەژاران، ختوورەیەکی خراپیان تێ نەگەڕاوە، بەدڵ و بێ درۆ بیانلاوێننەوە. خاك و خۆڵی نیشتیمان، چاویان لە پێی کەسێکی نوورانییە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان، حەرەمی وڵاتی نەشکاندبێ، بە قەدر و حورمەتەوە بەسەریاندا ڕاببورێ...

* ڕاوچی زۆرن کە لە تەنکاو و قوڕاواندا ڕاوی خۆیان دەکەن، بەڵام زۆر کەمن ئەو ڕاوچیانەی کە لە دەریای گەورەدا نەبێ، ڕاویان پێ ناکرێ... ڕاوچی زۆرن کە هەرچی بە تۆڕەکەیانەوە ببێ، لە تیرەماسی، لە ماسیە قوڕاویلکە و لە مارماسی، بە هەموو شتێك قنیاتیان دێ، وەلێ، ڕاوچی گەورە، بە مرواری نەبێ ڕازی نابێ، وەك مامۆستا زیاد...

* بەردەشانی، ڕێبوارێك بوو، ماندوو ماندوو، تینوو تینوو، برسی برسی، ڕێگای دەبڕی و تۆز و خۆڵی مێژووی دوو سەت و پەنجا ساڵی لێ نیشتبوو، بۆ خۆیشی نەیدەزانی بۆ کوێ دەچێ... چاوی بۆ شوانێك، گاوانێك، توتنەوانێك، ڕەزەوان و بێستانەوانێك، چاوی بۆ ئاشنایەك دەگێڕا خوڵقی بکات و نانێکی دەروێشی دەگەڵ بخوا، چێشتەخەوێکی لە کن بکا، بەڵام کەس نەبوو بیناسێ، کەس نەبوو خوڵقی بکا... تا باخەوانێك، باخەوانێکی زێدە شیرین و میهرەبان، ساحێب دەرك، لە و دیوو پاردەوە[1] هاواری لێکرد: وەرە مام عەلی وەرە، وەرە لادە... عەلی لایدا، دەستێکی کرد بە کەپری سەر تەوێڵی و، چاوەکانی قوڵ کردنەوە و قەدەرێك لە باخەوانی ڕاما و کوتی: ڕۆڵە زیاد، ئەوە ئەتۆی؟ ئەرێ ئەوە مەملەکەت بۆ وای بەسەر هاتووە! خۆ کەس کەس ناناسێتەوە!... مامۆستا زیاد، عەلیی

---
١- پاردە: دیواری یان وشکەکەڵەکی دەوری ڕەز و باخ.

برده (کانییه سەرچاوێ[1])، جوان جوان شوشتی، جلەکانی گۆڕی و بەرگێکی نورتو نوێی بەبەرداکرد، ئیدی عەلی، بووەوە بە بەردەشانیەکەی دیوانی میرانی بابان و، ئێستێ کەس نیە نەیناسێ، سەر بە هەرکۆڕ و دیوەخانێکدا دەکا، یەکێ لەبەری هەڵدەستێ، دوای ئەوەی بەیتێکی بە دڵی خۆیان بۆ دەڵێ، بە قامکی ئیشارە بۆ مامۆستا زیاد دەکا و دەڵێ: خزمینە ئەو پیاوەی دەناسن؟ ئەوە ئەو پیاوەیە ئەگەر ئەمنی لە چنگی مردنێ دەرهێنا!

* مامۆستا زیاد، ئەو مەسیحە بوو، خودا ڕۆژێك ڕایسپارد و پێی گووت زیاد، ماتڵ مەبە، چاوەڕێتن: بەردەشانی، خاتوو بەڵقیس، مام خالید و مام وێنس و...[2]، بڕۆ، ئەگەر چووی دەزانی... لە ئاویلکەی سەرەمەرگێدان، خەریکن جواناوێ[3] دەڕێژن، نامەوێ ئەوانە بمرن، بڕۆ لە نوێ هیوا و ژیانیان وەبەرنێوە... مامۆستاش، بێ ئەمریی نەکرد، خودا چۆنی فەرموو، وای کرد...

بۆیە، لە ساڵی گرانیدا، لە ڕۆژگاری قاتو قڕی و نەهاتیدا، بۆ کۆچی گەورە پیاوان، بۆ کۆستی پاشای ڕاوچییەکانی مرواری، هەمیشە و هەمیشە زووە!

نیسانی ٢٠١٧ ـ سلێمانی

---

١- کانییە سەرچاوێ: کانییەکە لە سنووری گوندی بەردەشان و نزیکەی پێنجسەد مەترێك لە گوندەکەوە دوورە.

٢- عەلی بەردەشانی، مام خالیدی فەڕاشی قایمقایم، مام یونسی زوڕناژەنی کارامە و بەناوبانگ و سەرۆکی چاوەشەکانی پشدەرێ لە سەدەی بیست تا هەشتاکان، خاتوو بەڵقیسی کەوڵەکەسکی ڕەبەن لە چیای ئاسۆس و لە کوێستانی ڕەبەنێ، ئەو کەسایەتییانەن، کە بەرەو بزربوون و مردن دەچوون، مامۆستا زیاد هەر یەکەیان کتێبێکی لەسەر ئامادە کردوون و بەو هۆیەوە ژیانی بەبەرداکردنەوە!

٣-جواناو: وردە ئارەقەی کاتی گیاندان.

# بۆ مەرگی پیاوێکی مەزن

## حەمید عەبدوڵلا ڕەسوڵ
## ( هاوڕێ و هاوشاریی مامۆستا زیاد )

هـەمـوو ڕێـگـا حـەرفـڕێـژکـەن
ئەلف و بێتان بە دەستنوێژکەن
پــــەڕە لــە کـفـن خـــاڵی بێ
کـێــل بــا دیــوانــی نــالی بێ
ڕووی قیبلە زمـانـی پـاراو بێ
وەك هەستی زیـاد، بـە ئـاو بێ
بـــاڵای لــە چـــاوانـــدا ونـبـێ
نـاوەکـەی دەرسـی خـوێـنـدن بێ
حـەیـفـە گــەڵای چـنـاری وا،
لــە بـــەهـــارت لـێـبـێـتـەوە
شـەرمـە ئـەو پـیـاوە مـەزنـە،
بـەبـێـدەنـگ سـەربـنـێـتـەوە!

**یەکەم:**

**دیوانی عەلی بەردەشانی**

کۆکردنەوەو توێژینەوەی: مامۆستا زیاد محەمەد ئەمین

پێداچوونەوەی: بوار نورەدین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێبی ئینستیتوتی کەلەپوری کورد ٣٦

لەسەر ئەرکی دەزگای ئاراس چاپکراوە

شوێنی چاپ: هەولێر

ساڵی چاپ: ٢٠٠٦

ژمارەی سپاردن: ٥٩٨ ساڵی ٢٠٠٦

قەبارە: ١٦,٥×٢٣,٥

ژمارەی لاپەڕە: ٢٨٦




**ناوەڕۆك:**

من و شیعرەکانی عەلی بەردەشانی، عەلی بەردەشانی، بەردەشان لەچەندوکە دێڕێکدا، شیعرەکانی عەلی بەردەشانی، عەلی بەردەشانی و ئاینی ئیسلام، شەڕەکانی عەلی بەردەشانی لەگەڵ پیرەژنان، بەیتێ پیوازان، بەیتێ (نازو خدر)ی، یان (شەڕی مام و برازا)، فاتەکوێرو ئایشەکوێر، ئەمن و عەلی برا بووین، کاروانی مەرگەیی، عەلی و خاڵندی چاڵاوایە، شاییە دۆڵەبییە، شیعری هەناران، عەلی بەردەشانی و مەستان، تالانێ بەردەشانێ، ڕاوێ پاشای، عەلی بەردەشانی و عەلی حەریری، عەلی و کیژۆڵەی شوانی بەدرخان، چیغ و ڕەشماڵ و چادر، هانا، بەیتێ داران، بەیتێ باپیرئاغای مەنگوڕ، عەلی و زەریە بەرنانی، جووتێك کەوشی ڕەش، بەیتێ تفەنگێ، خەزێم، بەیتێ کیسەڵێ، بەیتێ ئەوڕەحمان پاشای بابان، چەند هەڵبەستێکی شایی، شاییە ئەجندان، شیعری هەللاجی، تکایەك.

**نموونەم:**

**ئاوازو بەسەرهات**

ئامادەکردنی: زیاد محەمەد ئەمین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: ئاراس

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ٥٤

شوێنی چاپ: هەولێر

ساڵی چاپ: ٢٠٠٧، لەسەر ئەرکی دەزگای ئاراس چاپکراوە.

ژمارەی سپاردن: ٦٣١ ساڵی ٢٠٠٧

قەبارە: ١٦,٥×٢٣,٥

ژمارەی لاپەڕە: ١٢٧



**ناوەرۆك:**

زێڕنـۆکـێ و ئیشق و خـەم و ئـاواز، قۆنگرۆکە (مـەقـام)، شـەم و شەمزین، ئـایشـەگوڵ و پەشیمانی و تەنیایی، کۆپلەکانی ئایشەگوڵێ، حەیران لە هەگبەی کەلەپووردا، شوێنی لەدایکبوونی حەیران، حەیرانی بەسەرهات، پاییزو پاییزە مەقامی ئای ئای، حوێسنی برایم گەڵیشکی و دوو هەڵبەستەگاوانییە، سلێمان بەگ کوڕی حاجی میرزا خدر بەگ، شیعری کەرەدێزی، کانەبی، ئـازیـزەو ئـایـزە پەخشانێك و پەراگەندەی نیگایان.

**سێیەم:**

**هەتا دەمری نازانی چیت بەسەردێ (کۆمەڵێک بەسەرهات لەزمانی مام خالید)**

ئامادەکردنی: زیاد موحەمەد ئەمین

پێداچوونەوەی: بوار نورەدین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: دەزگای ئاراس

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ٦٩

شوێنی چاپ: هەولێر

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

ژمارەی سپاردن: ١٤٥٦ ساڵی ٢٠٠٨

قەبارە: ١٦,٥×٢٣,٥

ژمارەی لاپەڕە: ٣٥٢




**ناوەڕۆک:**

پەیڤێک، سەرەتایەک، هەتا دەمری، نازانی چیت بەسەردێ، مام خالیدو کورتە باسێک، خدرئاغاو کورتە لێدوانێک، جوداکردنەوەی بابەتەکان، قایمقامەکان و مام خالید، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، هەتادەمری نازانی چیت بەسەردێ، کابرا کوژاوی دەشتی سەرسیان، چۆن بووم بەماڵ، کوێرا بووی بەم پیاوە، خالید نەیکەیە پەڕێن، پاپازی قەرە، ئاردە دزراوەکەی پیرۆتی حەمەڕەشی، پارەوردکردنەوە، خالید خۆمان گێڕنەکەینەوە، لەهاتێ، بەمشوورنەبی، لێت دەبێ بە نەمات، سەرهاتی کێچان، پیاو لەهەموو شوێنێکی کڵاشە کۆنێکی، وریابە لووتی خۆت نەبڕی، بۆیەم وانەکرد

تاوای لێبێ، خدر ئاغاو جنێوەکانی، لەبەرکەریانت کەربووی، لەدووبەشی (ق..ی)دایەی بەم، خدرئاغاو پۆلیسە عەریفەکە، خدرئاغاو خانەنشینی، (...) فەندی، بەماڵێ خۆیان نازانێتەوە، ئەو منداڵە هی چ گەوادێکە، (...) نووسەی قائیمقام، ئەو گەوادەم بۆ بانگ بکە، مام خالیدو قائیمقام و حاجی ئەستی، خالید، قائیمقام بەچی وا دەوڵەمەندبووە؟، بەقسەی پیاوای وا نەدەهاتمەوە، چۆن پارەی ئەو دەعوەتە پەیدا بکەمەوە، قەرزداری تەرەقەم، قائیمقام خۆی زیندانی دەکات، لەسەرچاوەکەیەوە شلوێیە، پاس، یان چایخانەی بێ مشتەری، پەشیمانی پیاوەتیە، (گەوادییە)، کنگرو ماستی سمایل ئاغای سەرسیان، خالید ئەمشەو نەوەدو پێنج دینارم دۆڕاندووە، ئێمەشیان بەتۆەوە (دە..)، ئەو مامۆستایە ئەگەر ناموسی نەبێ، من لە، وەکو مێشە هەنگوینەی جارێك پێوە، بالەسەرتۆ بمکوژن وەك کابرای لەبازاری، غەریب زەڕی، بەڵام زیاد زەڕی، ترێك هەشتا لیران دێنێ، چەرمی خاوە بەرەکەت لەخواوە، ئەگەر بۆ نانخواردنێ بچینەوە، درە، یاری تەرەقەو میاوی دەبڵ، خوایە ڕۆژێ بمرم ئەگەر خالید لەم، سەگوەرەکەم لەسەر ورگی خۆم لابرد، لەمن وایە فەیلەسوفن، نەمزانی ئە، ئای خالید، خۆگوتی، گەوادبم!!، جا، با ئەستی هەر نەیاتەوە، نوێژکردنی مام خالیدو دوو گردی کچەکا، حەمەی برام، نانی بۆ بابم نەبرد، مام خالید لە ئۆردوگای خەبات، توورکرین، شەڕی سەرچەورو قوون لووسان، ئامانێ سەنگەسەری، گەوادی لەبرا چووکەییە باشترە، گاسوورم خێربێ (...) بەدانیشتنەوە، بڵێ وەکو تۆم، ئەم پارانەت دەدەمێ، جەژنە قوربانەکەی مام خالیدو حاجی، هەزار قولەو عوزو، کورتە بەزێك ناهێنێ، ئادی مەگەر بمکەی بەماکەر، خۆمیان لەسەر پشتی وشترێ (گ...ە)، گوو بەریشی بابیشم بۆ کردەوەی کرد، گۆشتاوی خۆش، کەرو کوڕ تەنیا هی خاوەنیان نین، ئەگەر خودا بکات وەشمان لێبکەرێن، سەفەری بەغدایە، بمبە بۆ وڵاتی بێناموسان، سێ ڕوا تاپریش دەخوا، ڕەزی زۆرو ترێی کەم، دەرکردنی بە ئەدەب، کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە، سەرەتای پەیدابوونی تەماتە، حوسێنی موختارو دیوەخانی بەردەشانی، لەباتی هەمینێ، ئەستییە دەبەم، گاسووری مەزناوێ، بارگیرەکەت لەخۆت بەناموستربوو، ئەو خشپە چ بوو؟، خوازبێنی کردنی مام سلێمانی، دوورەپەرێز، خاتری حەمە دۆکەی بێ، سێسەد دیناری بەژن داوە، جارە جارەش مزرە سێوان باوە زارت، ترخێنەیەو سەر لەنوێیە، گێرە گێری کابرا، سەعاتە بزوربووەکەی عەبەڕەش، یازوغ ماڵی دەوڵەت زایەع ئۆڵدی، ئەوەی لە دەرگای خەڵکی بدان لەدەرگای...، بەشی جارێکیش نابین، شەدەم بۆ دەربەندی دەیوست، بەسەرهاتەکەی تەنگژێ، دەترسم وەك (ك..)ی سەری تێیدا عاسێ، کابرای بنگردی و حاجی لەق لەق، هەتا بەهارێ گوڵە جۆیان نەبینم، سەرجێی، وەستا محێدینی تەنەکەساز چۆن فێری شە، زمانی بۆقان، چەتەی حیز، لەبەر بەرازان واز لە کشتوکاڵ ناهێندرێت، مام خالید ئیشی بە تەقەڵاقەکانی نەماوە، حەمەی کڵاولباد بەماڵێ خۆیان نازانێتەوە، کەریەتییەکەم بەسەرچووە، سوپاس و پێزانین.

---

**چوارەم:**

**مامان برازا بزر کرد خاڵان خوارزا مەزن کرد**

(هەندێ بەیتی ناوچەی پشدەر)

کۆکردنەوەی: زیاد موحەمەد ئەمین

پێداچوونەوەی: بوار نورەدین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: ئاراس

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ٧١

لەسەر ئەرکی دەزگای ئاراس چاپکراوە

شوێنی چاپ: هەولێر

ساڵی چاپ: ٢٠٠٨

ژمارەی سپاردن: ١٤٥٨ ساڵی ٢٠٠٨

قەبارە: ١٦,٥×٢٣,٥

ژمارەی لاپەڕە: ٢٨٨




**ناوەڕۆک:**

پێشەکی، ناسرو ماڵماڵ، فەرخ و خاتوو ئەستی، شۆڕ مەحموودو مەزرینگان، شەڕی مام و برازا، خەج و سیامەند، گەنج خەلیل، برایمۆک، کولک و کەڕۆ، کورتەیەک لەژیانی بەیتبێژەکان،

**پێنجەم:**

**جوانستان** (چەند بەیتێکی فۆلکلۆریی ناوچەی پشدەرو مەرگە)
ئامادەکردنی: زیاد موحەممەد ئەمین
پێداچوونەوەی: بوار نورەدین
چاپ: چاپی یەکەم
چاپخانە: ئاراس
زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ۸۹
شوێنی چاپ: هەولێر
ساڵی چاپ: ۲۰۰۹
ژمارەی سپاردن: ۱۵۸۵ ساڵی ۲۰۰۹
قەبارە: ۲۳,۵×۱٦,۵
ژمارەی لاپەڕە: ۲۰٦




**ناوەڕۆك:**

چەند سەرنج و خاڵێك، ئەسپ لە مێژووی داستاناندا، مام یونس، رەسوڵ ئاوەژەیی، بەیتەکان، شەریف بەگ و عەدلەخان، دلۆو لەوەند، بزیەگ، مەمێ زەری، چەتۆ، سەیدەوان، دەروێشی عەبدی، کورتەیەك لە ژیاننامەی ئامادەکار.

**شەشەم:**

**مەپوانە هەپەشەی دێوان – بپوانە جەوهەری پیاوان** (دە ئەفسانەی تایبەت بە دێو لە ناوچە پشدەر)دا

نووسەر: زیاد محەمەد ئەمین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: شڤان

شوێنی چاپ: سلێمانی

ساڵی چاپ: نییە

ژمارەی سپاردن: ١٦٢٧ی ساڵی ٢٠١٠

قەبارە: ١٤,٥×٢٠,٥.

ژمارەی لاپەڕە: ١٣٠



**ناوەڕۆک:**

کورتە گوتنێک، هەرزووزێ سەرمازوو، گۆزەفرۆش، گەڵای داری بی، ئەحمەد پاشا و فندقی دێو، کۆلکەدار، سپیلخان، ددان دەرزی، هەمزە پاڵەوان، پاشای بێ منداڵ، پاشای ڕۆژهەڵاتێ و پاشای ڕۆژئاوایە.

حەوتەم:

**دیوانی عەلی بەردەشانی**

کۆکردنەوە و لێکدانەوەی: زیاد محەممەد ئەمین

چاپ: چاپی دووەم

چاپخانە: چاپخانەی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ١٩٦

شوێنی چاپ: سلێمانی

ساڵی چاپ: ٢٠١٥

ژمارەی سپاردن: ١١١٠ ساڵی ٢٠١٥

قەبارە: ١٤,٥×٢٢

ژمارەی لاپەڕە: ٢٩٠




ناوەڕۆک:

خەونی شارەمێروولە، عەلی بەردەشانیی و ژنە داوێنپیسەکە، لە ئەستەنبوڵ هۆتدایەوە، با بۆزە هەرنەیاتەوە لە گاڕانێ، هەندێ سەرچاوەی دیکە.

سەرنج: ئەم کتێبە لەچاپی دووەم تەنها ئەو چەند بابەتەی بۆ زیادکراوە، بۆیە بەپێویستمان نەزانی تەواوی ناوەڕۆکی چاپی یەکەم بنووسینەوە.

## هەشتەم

**بووکێ خەمان (کۆمەڵێك چیرۆکی فۆلکۆری ناوچەی پشدەر)**
کۆکردنەوەی: زیاد محەمەد ئەمین
پێداچوونەوەی: ئارارات ئەحمەد
چاپ: چاپی یەکەم
چاپخانە: کارۆ
زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ١١٨
شوێنی چاپ: سلێمانی
ساڵی چاپ: لەسەری نییە
ژمارەی سپاردن: ١٥٠٥ی ساڵی ٢٠١١
قەبارە: ١٦،٥×٢٢،٥
ژمارەی لاپەڕە: ١٦٤




**ناوەڕۆك:**

چەند وشەیەك، چاکەی بکەو بەئاوێیدا بدە، کۆسەی یەك موو، شێرو فیرِنە گولە، سوورەی چاوشین، بووکێ خەمان، کوڕی پاشای و کوڕی وەزیری، ئەحمەد پیرەژنێ، هەر پڕی زاری گۆزەی، دەخوات، داری پیرو جوانان، ئەحمەدو کەللەسەر، زمان باشترین و خراپترین گۆشتە، ڕاوکـەرە هەژارەکەو شێرێك، ئەو جێیە خۆشە دڵی لـێ خۆشە، سێ پیاوی کوێرو پیاوێکی تەنبەڵ، گاوان و تەڕیم، پیرەژن و لەیەککردنی دڵداران، ئەنجامی ناپاکییە، خلەو بلەو حەمە، گایەکەی پاشای و شەڕەگا، جووتیارو کوپەلیرە، مشك و پووشکەو کەرسەگڵ، لاق باریك، مل باریك، سنگ تەنك، مووڕووی دوو کونە، فێڵ لە فێڵدا، نەڕنەڕە شێر، ئێستا خاوەن تەڵە نەهاتووە!، ئەنجامی چاوچنۆکی، کوتك بکوت، مریشکە قوندە، شێرو ڕاوچی، بۆق بۆقیلەی نێو ئاوان، سەرکودیلە، گرۆیە پیرەژنێ و شەیتانی، ئەسکەندەری زیلقەڕنەین و سەرتاشەکەی، کوڕە پووشفرۆشەکە، حەمەی جووتیار، گرۆیە شەیتانی و دوو زمانی، نۆشیروان حاکم بێ و بەختەك نائیب بێ، هەزار کەلاوە بە پوولێکی.

**تۆیەم:**

**بیرەوەرییەکانی مچە مەرگەیی** (لە نێو خانەوادەی شێخ مەحموودی حەفیددا)

ئامادەکردنی: زیاد محەممەد ئەمین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: کەمال

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ١٣٤

شوێنی چاپ: سلێمانی

ساڵی چاپ: لەسەری نییە

ژمارەی سپاردن: ١٣٣٩ ساڵی ٢٠١٢

قەبارە: ١٤,٥×٢٢

ژمارەی لاپەڕە: ١٠٣



**ناوەڕۆک:**

پێشەکی ئنستیتیوت، دەروازەیـەک: سدیق ساڵح، مچە مەرگەیی کێیە؟، چەند ساتێک لەگەڵ خاڵ مستەفادا، عەشیرەتی شیلانەو شێخ مەحموود، شێخ مەحموود، لەبەغداوە بۆ سیتەکی شاربازێڕ، لەشکری پشدەریێ و شەڕەکەی وەڕاز، جەفەنگی شێخ مەحموودو کوێخا ئاللآیی بەردەشانی، ئاشتبوونەوە، چۆن بارزانی لەسلێمانییەوە گەندرایەوە زەمبیلی بۆکان؟، کوێخا پیرۆت و شێخ لەتیف، شەڕی چوارتاو شیلانەکان، کوێخا ئاللآی بەردەشانی چۆن زمانی قسەکردنی کرایەوە، پێویستە لەخزمەتی تۆدا، جێی خۆم بناسم، سەرچاوەکان.

دەیەم:

**خاتوو بەڵکیسی کەوڵە کەسکی ڕەبەنی**

ئامادەکردنی: زیاد محەممەد ئەمین

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: چاپخانەی ئنستیتیوتی کەلەپوری کورد

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ٢٥٠

شوێنی چاپ: سلێمانی

ساڵی چاپ: ٢٠١٥

ژمارەی سپاردن: ١٦١١ ساڵی ٢٠١٥

قەبارە: ٢٢×١٤,٥

ژمارەی لاپەڕە: ١٢٨



ناوەڕۆك:

چیرۆکی (خاتوو بەڵکیسی کەوڵە کەسکی ڕەبەنی)، ناوەکان و شوێنەکان، میواندارییەکی برایان، کەوڵ لەنێو قسەوباساندا، کەسك وەکو ڕەنگ و مێژووی کۆن و نوێ، ڕەبەن وەکو شوێن و فۆلکلۆرو، دمکانەو چۆنیەتی دروستکردنی، ئەشکەوتێ خاتوو بەڵکیسی، ئاسۆس، ئاسۆس و هەوادارو هونەرمەندانی، گوندی سەرچیا، گوندی هەڵاوێژەو شەڕی ئەمبەرو ئەوبەران، چیای ئاسۆس و ڕووداوێکی سەیر، دڵداری لە کێوان، دارێ خێراتێ، ئاشتی وەیسەمەران و جەفەنگ، چەکواوێ حاجی رۆستەمی و چەتەگەری، بەردی پوور حەلیمێ، نیسکجار، بلۆقین، دەربەندی شیعرو بەند، دەربەندو هۆیە کۆن و نوێیەکانی پەڕینەوە لە زێ، سەرچاوەکان.

**یازدەیەم:**

**پێشبار**

ئامادەکردنی: زیاد محەممەد ئەمین

پێداچوونەوە: بوار نورەدین، ئارارات ئەحمەد

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: چاپخانەی کارۆ

زنجیرەی کتێبی ئینستیتیوتی کەلەپوری کورد ژمارە ٢٢٧

شوێنی چاپ: سلێمانی

ساڵی چاپ: ٢٠١٥

ژمارەی سپاردن: ١٧٩٦ ساڵی ٢٠١٧

قەبارە: ١٤،٥×٢٢

ژمارەی لاپەڕە: ٢٢٥




**ناوەرۆك:**

پیشەکی، گوتنێکی پێویست، گۆرانی، گەلۆ، وەکو دەق (تێکست)، گەلۆ – لێکدانەوەی هێندێك لە زاراوەو دەستەواژەکان، غەمێ لە دڵم پەڕاگەندە، شیرین لەیلا، ساڵی دوجاران دەدرێیەوە لە قونێ ئەوێ کاولەدنیایێ، سەخرەتوڵڵا، گوڵەکەی باخی شەدادی، نێوقەد بەدراو، خاڵی ڕەشی عاقرەوی، وەستا موحەممەدی کۆیەو میدادی ئەڵمانیان و سەردەمی دانانی گەلۆی، تەختی سولەیمان پێغەمبەری، شەجەڕەتوبا، وشە لە نێوان گەلۆیدا، دادگایی کردنێ نێوانێ گوڵان و خاڵی شیرین لە یلایێ، دانەری گەلۆی باسەکەمان، بۆچوونێ وەکو یەکدی لەنێوانێ بابەتەکانمان و شیعری کلاسیکدا، هەڵەی دەماودەمی گۆیندان لە نێوگەلۆیدا، گەلۆ و گەلۆبێژان.

کولێ، دەربارەی گولێ، نێوەشەوە، نیوەشەوە باسێك، مەکەن مەنعی عاشقان، شیعرستانێکی گونجاوی شاعیران لەگەڵ شەوان و نیوەشەواندا، زاڵم، بەردی بەرکوژێ، کورتە توێژینەوەیەك لە دەقی زاڵمی باسەکەمان، لەنێوانێ مەحوی شاعیرو دانەری دەقی زاڵمیدا، ئازیزەکەی عەلی کەرداری، تروسکێك لەسەر بەشە ئازیزەکەی عەلی کەردار، شلەخەجێ، سەحەر، وەگەر شەمس و موقابڵ چرا دادەگیرسێنن لە سێبارەتی شەوێدا، ئامینێ، لە تۆ دینێ من دینێ من دینێ – ئامینێ، بە هەردووکمان سەرینێ، ئیشکەرم بمرێ، بەڵام مشوور خۆرم نەمرێ، پاشبار.

# چەند پارچە شیعرێك

ئێمە نازانین، وە لەوەیە کەسانی دیکە و هەتتا ئەندامانی خانەوادەکەیشی، هەر نەزانن کە ئایا مامۆستا زیاد، لەو چەند پارچە شیعرە، زیاتری هەبووە یان نا، بەڵام ئەوەی کە دەیزانین و لەکنمان ڕوونە، ئەوەیە کە بە شێواز و ئەدەبیات و وشەئاراییی و هەستی شاعیرانەی ئەو پارچە شیعرانەڕا دیارە کە مامۆستا زیاد، توانا و سەلیقەی نووسین و هۆنینەوەی شیعری زۆر بەرز و باڵا بووە، وە زۆر شارەزا بووە و ئەگەر بیویستبا، دەیتوانی شیعر بنووسێت و لەسەری بەردەوام بێت و وەك شاعیرێك دەربکەوێت. بەڵام، بەدەر لەو گریمانەیەی کە لە خوارەوە خستوومانەتەڕوو، ڕوون نییە و نازانرێ کە بۆچی وەك کارێکی سەرەکی، خووی نەداوەتە نووسینی شیعر و خۆی دەگەڵ ماندوو نەکردووە ! گریمانەکەش ئەوەیە: بە بۆچوونی ئێمە، سەودای نیشتیمان و سەرقاڵبوونی بە کوردایەتی و کاری ڕێکخراوەییەوە، بواری پەروەردە و کاری مامۆستایەتی، وە لەپاڵ ئەوانەو بەڵکە لەسەروو ئەوانەیشەوە، قاڵبوونەوە و خۆساغکردنەوە بۆ کۆکردنەوەی کەلەپوور و ئەدەبیاتی فۆلکلۆر و ساغکردنەوەیان، گرتوویەتی و، وای لە مامۆستا کردووە کە پشت لە نووسینی شیعر بکات و وەك شۆڕەسواری نێو ئەو مەیدانە، ئەسپی خۆی تاوبدات، کە بەڕاستی هەروایش دەرچوو...

**ئاسۆس**

ئــاســۆس ئــەتــۆ ژیــانــی مــنــی<br>
جــێــگــای شــەرەفــپــاراســتــنــی<br>
زســتــانــان ئــەشــکــەوتــی شــاخــت<br>
هــاویــنــان کــانــیــاوو بــاخــت<br>
دەمــێــکــە ئــاشــنــان کــوردو بــەرد<br>
بــەردە ســەنــگــەری کــوردی مــەرد<br>
تــاکــو کــوردو بــەردێــك بمێــنــن<br>
تــۆڵــە لــە دوژمــن دەســتــێــنــن

## گوارەم خۆشناوێ

گوارەم خۆش ناوێ کە دێت و دەچێ
چونکە وەك پەتی سێدارە دەچێ
بەرموور ناحەزە، تەوقی گەردنە
گەردن پەتکردن، هەر بۆ مردنە
مەچەکت جوانە، جوانتر بێ بازن
مەکەوە لاسای کەلەپچەی دوژمن
خرخاڵ دەمێکە باوی نەماوە
بەلام پێوەندیان لەجێ داناوە
تۆ کە لە جوانی تەواوتکردووە،
ئیدی ئەوانەت بۆچ بەخۆ بەستووە!؟

١٩٧٨ - قەلادزێ

## چیرۆکێك

وەرن منداڵە کوردینە
ئەم چیرۆکە زۆر شیرینە
ئێوەش وانەی لێوەرگرن
پشتی یەکی پێبگرن
چیرۆکێکی بەتام و چێژ
دەگێڕنەوە لە چیرۆکبێژ
دەڵێن کە سەردەمێکی زوو
پاشایەکی بەدخوو هەبوو
جووتێ ماری بەخێو دەکرد
بە مێشکی پاکی لاوی کورد
هەموو ڕۆژێ لەگەڵ بەیان
دوو لاوی کوردی دەهێنان
سەری دەبڕین و مێشکیانی
دەکردە خواردنی مارانی

ئـەم ڕووداوە زۆری خایاند
دڵی زۆربـەی کـوردی هـەژاند
تـاکـو ڕۆژێـك کـاوەی دلـێر
هـاتـە مـەیـدان هـەروەکـو شێر
کـوردی کـۆکـردنـەوە سـەرجـەم
ڕۆڵـە کـوژراوی دڵـبـەغـەم
ئـازایـانـەی تـێـگـەیـانـدن
ژیـانـی ڕاسـتـی پـێـسـەلمـانـدن
ئـاگـری کـردەوە لـە بـڵـنـدان
لـەسـەر لـوتـکـەی چـیـاو گـردان
دەی هـەڵـمـەت بـەرن کـوردیـنـە
دەی بـا بـەس بـێ، نـۆرەی ژینە
مـەردانـە کـاوە پـێـشـکـەوت
تا بـەر کۆشکی شـا، نەسرەوت
هـێـنـدەی نـەبـرد بـوو بـەهـەرا
گـەل سـەرکـەوت، کـۆشـك ڕمـا
بـۆیـە بـەهـار، ئـاور، کـاوە
ئـێـسـتـاش پـیـرۆزن لـەم نـاوە
بـژی کـاوە، بمـرێ زۆردار
بـژی ئـاشـتـی، بـژی بـەهـار
دە ئـێـوەش هـەروەکـو کـاوە
شـۆڕش بـگـێڕن لـەم نـاوە
ژیـانـی ژێـردەسـتـی، مـردنـە
ژیـان، هـەر خـەبـاتـکـردنـە
"چەپکێ گـوڵ و چەپکێ نێرگز
مـەرگـتـان نەبینم هـەرگـیـز!"

١٩٨٤/٣/٢٠ – قەڵادزێ

## چوارینە

### تۆڵە

لە هەرکات و لە هەرشوێنێ
کەسێ کوردێک بفەوتێنێ
کە ئەو زووحاکی سەردەم بێ
کاوەی سەردەم دەیتۆپێنێ

### دیاری سەرکەوتن

چەپکێ گوڵی گەشی پاراو
بە خوێنی کوردجی ئاودراو
لە یەکەم ڕۆژی سەرکەوتن
پێشکەش کاوەی ڕۆڵەی کوژراو

### مەرگی ئەژدەهاک

لانەی شێرانن ئەو کێوە
سەدان کاوەیان وا پێوە
مژدەت دەمێ دایکی شەهید
مەرگی ئەژدەهاک بەڕێوە!

### قەڵای ئازادی

ئەژدەهای سەردەم دادەبەزێنن
بە کاوەی سەردەم مێشکی دەپژێنن
لەجێی تەلار و کۆشکی زۆرداری
قەڵای ئازادی دادەدەمەزرێنن

### دەرێی ئەمجارە

ئـەوەنـدە پاکە دەرێــی ئەمجارە
دەڵـێـی ئاونگی مانگەشەویارە
جێی نابێتەوە ئـەوەی کە فێری
باوەشی گەرمی کابرای زۆردارە!

### ئەم ڕیس و گوریسە

ئەم ڕیس و گوریسە، لێك نابێتەوە
مەر[1] یەکێ بمرێ و زیندوو بێتەوە
گەلێك ئـاڵـۆزە، کەسی تێناگا
تا بێڵ بەقوونێك دەگـەڕێـتـەوە

### ئەو ڕۆیشتووانەی

ئەو ڕۆسشتووانەی کە لەپێش منن
وەك بـەردی ژێـری گۆمی بێ بنن
خۆزگە بۆ یەك ڕۆژ منیش دەمرم
تاکو تێبگەم لەکوێن؟ بۆ ونن؟!

### ئەمشەو

ئەمشەو گــەڕام بـۆ هـاودەمـێ
کـە لابـــەرێ لــە دڵ غـەمـێ
هــەرچــی دیـتـم غــەمــاوی بـوو
نـەبـوو دڵ بـێـگـەرد و غەمێ!

### پەشیمانی

مانگ و ئەستێرە و چنار و کانی
ئارایشتیانکرد هەرسێ بەجوانی
کە کـوڵم و چاوو بـاڵای تۆیان دی
خۆیان شووشتەوە بە پەشیمانی

---

١ – مەر: مەگەر

## کۆن و نوێ

دەدوام من لەگەڵ ئێسقانێ
دەدوام لەگەڵ کۆنەجوانێ
ئێسقانێك بوو هاتبووەدەر
لانەی تێکدابوو بلدۆزەر
تەنها دوو سێ بەردی مابوو
کە ئەو تۆزەی شارامگابوو
هێنامەدەر، هەڵسەنگاند
کۆنم پرسی، نوێم تێگەیاند

## سارا

بارە دڵت لە خەمی پیرۆز و خۆشەویستی
دیارە کە تۆش ئەم وڵاتەی دەپەرستی
سارای و لوتکەی بیری بەرز و پاك و هەڵچوونی
زۆر موقەددەسی و هاوشانی پیرەمەگروونی
تۆ بە هەورازی دووری هیوادا هەڵدەگەڕێی
بێباکی لە سەرما و گەرما و سەختی ڕێی
خۆشەویستی ئەم وڵاتەت لەلا هێندە گەورەیە
بۆیە بۆی دەبەخشیت هەرچیت هەیە
دەربەست مەبە کە هەڕەشە لە بەرزیت دەکرێ
تۆ چیایت و، چیاش نانەوێ و نامرێ

١٩٨٨/١١/٦

## وشەی سەر سینە

لە حەوشێکدا لەسەر تەختێك
لەژێر سێبەری درەختێك
کچە کوردێك بڕۆکەوان
نەرمونۆڵ و خڕوخەپان
جلی جوانی کوردی لەبەر
کورد بوو لەپێ، تا تەوقی سەر
سادە و ساکار بەبێ دەرمان
وێنەی فریشتەی ئاسمان
گەڕابووە لە ڕەشبەڵەك
ڕاگوشرابوو پەنجە و مەچەك
ماندووی دەستی کوڕی کورد بوو
حەسانەوەی لا پەسەند بوو
نوستبوو بەدەم لێکدانەوە
لێکدانی وشەی جوانەوە
وشەکانی تاریك و ڕوون
لەسەر مەمکانی نوستبوون
گوتم خۆزگەم بەو وشانە
کەمیوانن لای ئەو جوانە
خۆزگەم بە وشەی تاریك و ڕوون
لەسەر سینە و مەمکان دەنوون!

## قەلەڕەشە

دە بڕۆ دە بڕۆ، قەلەڕەشە!
بۆ تۆ هەر کەلاوە خۆشە
هەرچەند بەلەنجەولار دەڕۆی
بەلاّم خواردنی پیس دەخۆی
ئەی، ڕەنگ خەماوی گەندەخۆر
ئەی، خاوەنی تەمەنی زۆر
خواردنی پیس و دەنگی ناخۆش
بۆت بوونە ژیانی فەرامۆش
ئەگەر کەمێ دەنگخۆش دەبووی
بەسۆز و جۆش و خرۆش دەبووی!
ڕاوچیت هەمیشە لەدوابوو
ئەم جیهانەت لێ بەلاّبوو!

نیسانی ١٩٧١

## کوردێك و بەردێك

دوو سێ بزن و یەك دوو نانێك
لە چیاو گرد و دۆڵ گەڕانێك
ڕانکوچۆغێکی شڕ لەبەر
کڵاوێکی چڵکن لەسەر
دەبێ ئەو تاوانی چی بێ؟
بۆ دوژمنی لێ غەزریبێ؟
کوردێك سەرئانیشك دڕاو
دوو سەر ئەژنۆ، پینەکراو
پێڵاو، جووتێك لاستیکی شڕ
لەپێی دەخشێ بە شڵپوهوڕ
بۆچی دەبێ هەیبێ دوژمن؟
هەوڵی بۆ بدا بۆ کوشتن؟!
لە جیاتی تاقمی نوستن
بەرەی دڕاو، لێفەی کونکون

سەرمای زستان بیلەرزێنێ
گەرمای هاوین بیسووتێنێ
واش ڕازییە ئەو بەو ژینە
سەیرە خەڵکی لێی بەقینە!
لەو ڕۆژەوە کە کورد هەیە
لە کۆنیان نازانین کەیە!
دوژمنی گەلێک زۆر بووە
پشتیشی تێنەکردووە
هەر وابووە و هەر ماویشە
هەر کوردیشە و هەر پیاویشە
تا ئەو کێوانە بمێنن
کوردان سەریان نانەوێنن
زستانان، ئەشکەوتی شاخی
هاوینان، کانیاو و باخی
بەرز و سەختە لوتکەی هەڵگورد
پشتیوانە بۆ نەوەی کورد
ئەو چیایانە، مانی منن
جێگای شەرەفپاراستنن
دەمێکە ناشنان کورد و بەرد
بەردە سەنگەری کوردی مەرد
کوردێک و بەردێک بمێنن
تۆڵە لە دوژمن دەستێنن

## سەنگەگاور

کوردێک مردووە لەم لاڕێیە
کەس نازانێ ئەگەر کێیە!
کردوویەکی کۆنەساڵە
فڕێدراوە لەم لاپاڵە
لەو ڕۆژەوە کە مردووە
ناوی ئەویان ونکردووە
زۆر بەسووکی سەیری دەکەن
بەردی بۆ سەر فڕێدەدەن
بەردی لەسەر کۆمەڵ کراوە
قوچکەی لەسەر هەڵچنراوە
بۆیەش قوچکەی لەسەر دەکەن
تا بە خەڵکی نیشان بدەن
بڵێن کەسێک مردووە لێرە
بێن، بەردی پێدادەن، خێرە
شوناسنامەی بۆ دانراوە
بە دەستی دوژمن نوسراوە
شوناسنامەی وا بەمشێوە
نەبینراوە لە هیچ جێوە
وای نوسیووە بێویژدانە،
کە ڕووڕەشی دوو جیهانە
لەم دنیایە، سەنگەگاور
لەدنیای دیش، جێگەئاور!
توخوا خەڵکینە ئا لێرە،
ئێوە ئیستێ بکەن، خێرە
تۆزێک وردبنەوە لەو کاکە
شەهیدە لەڕێی ئەم خاکە
پاڵەوانی داستان بووە
شەهیدی کوردستان بووە
سواری بۆری ئەبلەق بووە

پشتی بەناهەق گرتووە
شیری ڕووتی هەڵکێشاوە
داگیرکەری پێ ڕاونـاوە
لە هەڵسووڕان و لێدانا
ڕۆستەمێك بووە لە داستانا
بۆیە ئێسکی وڵاخەکەی
پیرۆزە لام وەك خاکەکەی
بیرو هۆش و هەستێك بووە
ئەو ڕێگای ڕاستی گرتووە
نەخەڵەتاوە بە دوژمن
بە قسەی درۆی بێسەروبن
وڵاتی خۆی خۆشویستووە
خوێنی لەپێناو ڕشتووە
بەردیش بێ گۆڕی خاوەن بیر
هەر پیرۆزە لای خەڵکی ژیر
سەری لە ئاست دانەوێنن
چاوی ڕێزی پێ هەڵێنن!

١٩٨٣/٣/٢١

### ئاگری سەرلوتکە

وەك یەك بەنرخن هەردوو لەلای من
ئاگری سەرلوتکەو، بەمەردی مردن

### تیشکی چاو

تیشکی چاوت گەر نەدا لە دەریای دڵە غەمبارەکەم
کوا وەکو بارانی بەهار، ئاو لە دیدەم سەردەکا!؟



له ڕاستەوە: حەمە ئەمین، حەمەشین، ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە، عومەر دەرویش، مەجید، زیاد محەمەد ئەمین منداڵەکەی دواوە: ئەنوەر ساڵح ڕەشە.
(١٩٥٧) سێ ڕۆژ دوای لافاوەکەی سلێمانی



قوتابخانەی قەڵادزێ، ١٩٧٩/١/١١، مامۆستا زیادو قوتابییەکانی



ساڵی ١٩٥٧، سێ ڕۆژ دوای لافاوەکەی سلێمانی. مامۆستا زیاد



لە ڕاستەوە: زیاد محەمەد ئەمین، عوسمان محەمەد مەعروف، ساڵح سالم شەمخی،
عەلی میرزا، خەلیل ئیبراهیم مەهدی، قوتابخانەی قەڵادزێ



مالّی مام خالیدی فەڕاش ١٩٨٣/٧/١٩، مامۆستا زیاد



مالّی مامۆستا زیاد

لە ڕاستەوە: مامۆستا زیاد، هێمن، تاریق، سروە، نیشتیمان، ئەرخەوان، ناسکە حەسەن جەلال (هاوسەری مامۆستا زیاد)، ژوان منداڵەکەی باوەشی ناسکەخان، ١٩٧٧/١١/٢٠، قەلادزێ



وەستاوەکان: مامۆستا خالید حەمەی هەلاج، مەحمود باوزی، محەمەد قادر، مام جەلال، عومەر قەڵادزەیی، مامۆستا زیاد
دانیشتوەکان: حەمید عەبدوڵڵا، ئەحمەد بچکۆل، بەکر بایز، ئاسۆ فەقێ ڕەسوڵ
کۆمیتەی ڕێکخستنی قەڵادزێ لەگەڵ مام جەلال - شەقڵاوە



سەیرانی مامۆستایانی قوتابخانەی قەڵادزێ ١٩٧٨



مامۆستا زیاد



مامۆستا زیاد، مامۆستا عەلی میرزا



له ڕاستەوە: خالید وەنەوشە، ناسکە حەسەن جەلال، ڕەحیم محەمەد زادە، م. زیاد، جەلیل گادانی



مامۆستا عەبدوڵلای حەسەنزادە، ئارارات ئەحمەد، مامۆستا زیاد
٢٠١٣/١١/١٤، کتێبخانەی گشتیی ڕانیە، لە کۆڕێکی م. عەبدوڵڵا حەسەنزادە



مامۆستا زیاد، رووناک خان (دایکی د.بەرهەم ئەحمەد ساڵح)



مامۆستا زیاد، خێزانەکەی (ناسکە حەسەن جەلال)، ١٩٨٤ قەلادزێ



مامۆستا زیاد، مامۆستا ئەحمەد قادر سەعید



سەیرانگای شێخ مەحمود، مامۆستا زیاد و هاوڕێکانی



ماموستا زیاد، ماموستا غەریب پشدەری
٤ی ئایاری ١٩٨٠، یاریگای قەلادزێ. نمایشی قوتابخانەکان




دەرچوونی خانەی ماموستایانی سلیمانی ١٩٦١





ڕانیە، ماڵی مامۆستا زیاد، ٢٠١٤/١٢/١
وێنەگر: مۆفەق میراودەلی



کتێبخانەکەی مامۆستا زیاد، ٢٠١٤/١٢/١، وێنەگر: مۆفەق میراودەلی



مامۆستا زیاد لە ڕانیە لەبەردەم ماڵی خۆیان، ٢٠١٤/١٢/١، وێنەگر: مۆفەق میراودەلی



ئەحمەد محی الدین و زیاد محەممەد ئەمین
کتێبخانەی گشتیی قەڵادزێ، وێنەگر: مۆفەق میراودەلی



مۆفەق میراودەلی، زیاد محەممەد ئەمین، کەیفی عەبدولڕەحمان
کتێبخانەی گشتیی قەڵادزێ، ئەرشیفی: مۆفەق میراودەلی

# مامۆستا

# زیاد محەمەد ئەمین

مامۆستا زیاد قەڵەمێکی گەوهەردار و بەسەلیقەیە لەبواری نووسین و بەدواداچوون، خاوەنی کۆمەڵێک کتێبی دانسقە لەسەر ناوچەی پشدەر و مەرگە، لەناو نووسەرانی پشدەر، خاوەنی زۆرترین بەرهەمی فۆلکلۆرییە.

ئەم کتێبە، کۆمەڵێک بوار و لایەنی ژیانی ڕووناکبیری ناوبراو لەخۆدەگرێت، هەر لەسەرەتای کاری نووسینی لە ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەکان، چ لەسەر ئاستی عێراق و چ لەسەر ئاستی کوردستان، بەووردی و چڕی باسی ئەو لایەنەکراوە، زۆرینەی کاری ڕۆژنامەوانی خراوەتەڕوو، جگە لە دیدارو ڕێزلێنان و کۆڕیادو بیبلیۆگرافیای کتێبەکانی.



2021